دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسیار: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناونیشان:

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، شەقامی گوڵان، هەولێر

ناوی کتێب: کورد و گەڕان بەدوای خۆدا
نووسینی: ئەکرەمی میهرداد
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٢٤
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
دەرهێنانی بەرگ: مریەم موتەقیبیان
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٦٩٧)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

# پێشەکی

بۆ گەڕان بەدوای کوردا یان گەڕانی کورد بەدوای خۆدا، بەشێکی زۆری دەچێتە ناو گەڕان لە مێژوودا یان گەڕانەوە بۆ ڕابردوو. بۆ ناسین و لێکدانەوەی مێژوویش پێویستیمان بەشێوەیەک تێگەیشتن و گەڕان دەبێت کە بتوانێت بەشێکی زۆری گۆڕانکاری و کاریگەرییەکانی مێژوو لێک بداتەوە و لە هەموو ئاستە جیاوازەکانی جوگرافی (شوێن)، مێژوویی (کات) و مرۆڤایەتیدا لێکدانەوە بکات و بتوانێت کاریگەری و کارلێکی هەموو ئەم ئاستانە لەسەر یەکتری و سەرەنجام مێژووی پەیدا بوو بەهۆی ئەو توخمانەوە، هەڵبسەنگێنێت.

هەر وەک دەزانین چۆن لە بیر، سیاسەت و فەلسەفەدا، چەندین ڕێباز و قوتابخانە هەیە، هەر بەو شێوەیەش بۆ ناسین و تێگەیشتنی مێژووش چەندین قوتابخانەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەیە کە لە سەردەمە جیاوازەکاندا توانیویانە بەشێک لە ئەزموونی مێژووی مرۆڤایەتی بەپێی لێکدانەوەکانی خۆیان بناسن و بناسێنن. قوتابخانەی مێژووی کورتخایەن یان قوتابخانەی (مێژووی ڕووداوەکان)[1]ی سەدەی نۆزدەهەم مێژووی سیاسی و دیپلۆماتیک بەنموونەی هەرە دیاری مێژووی ڕووداوەکان دەزانێت. ئەم شێوەیە لە بیرکردنەوەی مێژوویی، کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا ناودار بوو، نە تەنها مێژوو وەکو تابلۆیەک یان بابەتی بوونێک "عینیت" دەناسێت کە تیایدا بینەر بەتەواوی پشتگوێ دەخرێت، بەشێوەیەک کە هیچ مەودایەک بۆ بیرکردنەوەی مێژوویی بەناوونیشانی دووبارە سازی و نوێکردنەوە نامێنێت، بەڵکو ئەم ڕێبازە پرسی مێژووی ڕابردوو، وەکو پرسێکی نەگۆڕ و وەستاو، دەناسێت. واتە درێژ بوونەوە و بەردەوامبوونی کاریگەریی مێژووی ڕابردوو لەسەر ئێستا نابینێت و تێگەیشتنی میتافیزیکی نەگۆڕ و نابەردەوام لە مێژوو، بەیان دەکات.

یەکێک لە دژوارییە کاریگەرەکانی، کە زاڵە بەسەر قوتابخانەی کورتخایەندا،

ئەوەیە مێژوو دەکاتە واقیع نامەیەکی بەدەر لە تێگەیشتنی قووڵ و گۆڕاو و بەردەوام لە خودی ئەو مێژووە. هەر وەکو باسمان کرد دەیکاتە تابلۆیەک یان پەیکەرێک بەناوی بابەتی بوونەوە. ڕوانگەی چوون یەکی کاتی "زمنی" و تاکێتیی ڕوانگەکان کە ئەم مێژوووە کورتخایەنە پشتی پێ دەبەستی، کاتێک کە ناچارە گۆڕان و خۆنواندن و کاریگەریی هەڵوێست و ڕوانگەکانی دیکە لەسەر مێژوووەکەی خۆی ببینێت بەناوی شێوەیەک لە نمایشی ساز و بەرگی بیانی دەیناسێت، واتە دیسان ئامادە نییە کە هەڵوێستی هاوئامێزی و کاریگەریی چالاکی و ڕوانگەکان لەسەریەک وەکو کارێکی سروشتی و مرۆڤانە و مێژوویی ببینێت.

ئەم قوتابخانەیە پەیوەندی و کاریگەریی ڕووداوەکان و ساتە مێژووییەکانیش لەسەریەک نابینێت و هەر سەردەم و ڕووداوێک بە جیا لەوانی دیکە سەیر دەکات و پەیوەندی و ئاڵۆزیی ڕووداوەکان و کاریگەریی درێژ ماوەی مێژوویی و بەردەوامبوونی کاریگەرە مێژووییەکان لەسەر ئێستا نابینێت و مرۆڤەکانی ئێستا دەکاتە بینەرێکی بێ کار لە بەرامبەر ئەو سەردەم و ڕووداوانەدا.

تیۆری و ڕێبازی مارکسیزم، یەکێکە لە قوتابخانەکانی کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەولاوە کاریگەریی هەیە لەسەر تێگەیشتنی مێژوویی. ئەم قوتابخانەیەش هەر وەکو قوتابخانەی "کورتماوەی ڕووداوەکان" تاکە لێکدانەوەیەک و تاکە ئاستێک بۆ تێگەیشتنی مێژوویی لەبەرچاو دەگرێت و دەڵێت: کاریگەریی بوونی کۆمەڵایەتییە کە هۆشیاریی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات، کە بێگومان مێژوویش بەشێکە لە هۆشیاری کۆمەڵایەتی. ئەم لێکدانەوەیە سەرەڕای ئەوەی کە تاک ڕەهەندە، تاک ئاراستەشە، چونکە ئەوە نابینێت کە هۆشیاریی کۆمەڵایەتیش دەتوانێت کاریگەریی زۆر جدی - جیروفی لەسەر دیاریکردنی بوونی کۆمەڵایەتی بکات. ئەم ڕێبازە هەموو ڕووداوەکان و گۆڕانەکان وەکو ڕەنگدانەوەیەکی پێویستی بوونی کۆمەڵایەتی و کاریگەریی سیستەمی ئابووری- سیاسی- کۆمەڵایەتی دەناسێنێت.

لە ناوەڕاستی سەدەی بیست بەدواوە و دروست لە ساڵی ١٩٤٩دا، ڕێباز و قوتابخانەیەکی دیکەی تێگەیشتنی مێژوویی کە بە قوتابخانەی (مێژووی درێژخایەن)(٢) یان قوتابخانەی (ئانال) بەچاودێریی فرنان برۆدێلی فەرەنسی

(١٩٠٢- ١٩٨٥) دێتە ئاراوە و گەلێک گۆڕانکاریی میتۆدیی گرنگ لە تێگەیشتنی مێژوودا بەدی دەهێنێت و لێکدانەوەی فرەیی و چەند ئاستی و فراوان بۆ ناسینی مێژوو پەیدا دەکات. فرنان برۆدێل و هاوڕێکانی لە قوتابخانەی ئانالی فەرەنسی چەمکی مێژوویی فراوانتر دەکەن و کاریگەریی لەسەرخۆ و شێنەییی جوگرافیایی دەخەنە ناو مێژووەوە و گۆڕانی (مێژوویی) نەتەنها بەهۆی ئاگایی بەدەر لە ڕووداوەکان، بەڵکو لەگەڵ گۆڕانکارییە درێژ ماوەکاندا دەیگونجێنن کە سەرەڕای ئاگایی بکەرەکان ڕوو دەدات.

پاشان، مێژووی درێژخایەن، مێژووی گۆڕانکارییە بونیادییە سەرەکییەکانیشە، بەڵام ئەم گۆڕانانە تەنها بەوە لێک نادرێتەوە کە توانیویەتی چ شێوەیەکی گۆڕان پەیدا بکات، بەڵکو دەتوانێت لەوە تێ بگات ڕووداوەکان یان بونیاد تەنها بڕیاردەری ئەم گۆڕانانەن. بۆ ناسین و تێگەیشتنی زیاتر لەم قوتابخانە و تیۆرە مێژووییە، پێویستیمان بەوە هەیە کە سیفات و ئاستەکان و پێکهێنەرەکانی تێگەیشتنی "مێژووی درێژخایەن" شارەزا بین:

**یەکەم**، ڕەهەندی شوێن و کاریگەریی شوێن لەسەر مێژوو، فراوانکردنی تێگەیشتنی مێژوویی کە جێگای کاریگەریی شوێنی تێدا بێتەوە لەسەر گۆڕان و ڕووداوە مێژووییەکان. ئەم ڕەهەندە سەربەخۆ لە ئاگایی بکەرە مێژووییەکان و لە سەرووی ویست و خواستی ئەوانەوە، کاریگەریی زۆری لەسەر مێژووی ئەو ناوچەیە هەیە. واتە مێژوو تەنها بەمانای کارەکانی مرۆڤی پێشوو نییە، بەڵکو زۆرجار بەشێوەیەکی بڕیاردەریش، مێژوو بەرئەنجامی کاریگەرە شێنەیی و هەست پێنەکراوەکانی شوێن و سروشتیشە. لە ئەنجامدا بەهەمان ڕادەی کە کارەکانی مرۆڤ کاریگەرە لەسەر زەمینەی شوێن و سروشت، بەهەمان شێوەش زەمینەی سروشتی دەتوانێت کار لە گۆڕانکارییە مرۆڤایەتییەکان بکات. تێگەیشتنی ئەم قوتابخانەیە سەبارەت بەشوێن دەتوانێت بەم جۆرە بێت: (کات مەندکردن) یان (مێژوو مەندکردنی) شوێنە، واتە دانی ڕەهەندی کاتە بە شوێن.

بۆ سەلماندنی ئەم خاڵە و تێگەیشتنی کاریگەریی شوێن لەسەر مێژووی کورد، بەبڕوای من دەبێت تەماشای ناوچەی ئازەربایجان (ئاگر بایەگان) بکەین بەهەردوو

ناوچەی باکـوور و باشـووریەوە. ئەم نـاوە، ناوێکی ئـاری و ئێـرانیـیـە و لە کـۆنەوە ناوچەیەکی ڕەسەنی نیشتەجێبوونی خێڵەکانی "ئێریەن ڤاچ"ە و لە پێش سەردەمی زەردەشت و میدیاوە، نیشتمانی ڕەسەنی خێڵە ئارياييیەکان ناوچەی "ئازەریيە"، کە هەردوو وشەی ئاری و ئازەری هەمـان مانای ئاگر دەدات و وەکو ئاشکراشە کە ئاگر چ سیفەتێک و کاریگەرییەکی خێڵە ئارياييیەکان بووە. بەڵام ئەم ناوچەیە نزیکترین و گونجـاوترین ناوچەی ئاريايیيـە، کە خـێڵـە تۆرانی و تورکـمـانەکـان، توانیـویانە لە ڕێگەیەوە دەست بکەن بەداگیرکردنی ناوچەکانی باشـوور و ڕۆژئاوای خۆیان. خێڵە تۆرانییەکان کە لە زێد و ناوچەیەکی بیابانیی سارددان و لە شوێنێکی بێدەرەتاندان، بەردەوام پێویستییان بە داگیرکردنی ناوچەکانی دیکە بووە، کە نزیکترین شوێن لێیانەوە، ناوچەی ئازەربايجان بووە. هێرشەکانی سەلجووقی، مەگۆلی، تەتەری، ئاق قـۆینلۆ و قـەرەقـۆینلۆ و سـەرەنجـام عوسـمـانییـەکـان لە ڕێگای ئازەربايجـانەوە لە ئەنجـامـی مـێـژوويـەکی درێژ مـاوەدا، ئەو ناوچە (ئازەری و ئـاری)يەی کـردووە بەناوچەیەکی تورک و تورکمان نشین.

**دووەم،** تیۆری مێژوویی درێژخـایەن، جیاواز لە قـوتابـخـانەی مێژوویی سـوننەتی و گێڕانەوە "ڕوایی"، کـاریگەریی کـار و چالاکییە فرە و بەرامبـەرەکان کە یەکێتییەکی مـێـژوویـی فـراوانتـر دروست دەکـەن، لەبەرچاو دەگـرێت. برۆدێل ئـەم یەکـێـتـیـیـە بەزاراوەی "پەیوەندی و بونیـاد" بەیان دەکـات، کـە کـاریگـەریی تێگەیشـتنـی نیـچـەی لەسـەرە، قسـەکردن لە مێژوو، بەهۆی ئەوەیە کە لـەیەک کاتدا گەلێک هەڵوێست یان تێڕوانینی جیاواز کار دەکەنە سەر هەمـان مێژوو[٣]، نەک تەنها یەکێک لە لایەنەکان دروستکەری مێژووە، ئەگەر ئەو لایەنەش لە ئەنجامدا سەرکەوتوو بێت. بۆ سەلماندنی ئەم هـاوکاریگەری و دروستبوونی یەکێتییە مێژووییە، نموونەی کورد و داگیرکەرانی کـوردسـتـان، نموونەیەکی بەرچـاوە، هەر چەندە لە ئەنجـامـدا ئەوان سـەرکـەوتوون و کوردستـانیـان داگیرکردووە، بەڵام کوردیش بەدەوری خـۆی توانیـویەتی کـاریگەریی خۆی لەنـاو ئەواندا بهێڵـێـتـەوە. بوونـی مـیـرنشـیـنەکـانی کـورد لەنـاو ئیمپـراتۆریای عوسـمـانی و ئێرانی دەتوانرێت وەکو مـانەوەی کاریگەری کـوردی حسـابی بۆ بکرێت، هەرچەنـدە پاشکۆیەتی ئـەو مـیـرنشـیـنانـە بۆ هێـزە ئـیـمـپـراتۆرییـەکـان دەبێت وەکـو کاریگەریی ئەوان لەسەر کورد لێک بدرێتەوە.

مەسەلەی تەسەوف و دینی ئیسلامی عەرەبیش، بەبڕوای من دەتوانرێت وەکو کاریگەریی دینیی کورد و ئیسلام لەسەر یەکتری حسابی بۆ بکرێت و سەرەنجام ناوەرۆکی دینیی کورد (ناوەڕۆکی تەسەوف) و ڕواڵەتی دینی عەرەبی (تەسلیم بوونی تەسەوف لەکار و بارەکانی دنیادا و وازهێنانی لە مەسەلەی حوکم و دەسەڵات بە قازانجی خەلافەتی ئیسلامی) دەبێتە یەکێتییەکی پەیوەند و بونیاد لە وڵاتی کورداندا.

سێیەم، مێژووی برۆدێل، هەر وەکو مێژووی فۆکۆ، لە جیاتی کۆشش بۆ جیاکردنەوەی پلەکانی واقیعییەت کە لە ساتێک یا چەند ساتێکدا ڕوودەدات، هەوڵ دەدات کە لە "چۆنییەتی پەیدابوونی شێوەکانی وتار و کار"[٤] تێ بگات و بتوانێت ئەلگۆکانی سروشت و چالاکی و هێزە بەرامبەرەکان لەسەر یەکتری بناسێت. برۆدێل دەڵێت: پێش کارەکانی قوتابخانەی ئاناڵ، مێژوونووسان بەمێژووی کورتخایەن، یان ئەوەی کە بە "مێژووی ڕووداوەکان، ناسراوە" پشتیان دەبەست. لەلای برۆدێل، مێژوویەکی تاک ئاراستە بوونی نییە، هەر بەو شێوەیەی کە تاکی دابڕاو بوونی نییە. لە لای برۆدێل، مێژوو "سیمایەکی بەردەوامە" کە هەمیشە لە جووڵەدایە؛ "تۆڕێکە لە پرسەکان" کە هەموویان بەیەکەوە گرێ دراون کە هەریەک "بەنۆبەی خۆی دەتوانێت سەد لایەنی جیاواز و ناکۆک"، بەخۆیەوە بگرێت.

ئەگەر تەماشای شۆڕشەکانی کورد بکەین، نابێ هەروا تێ بگەین کە کاریگەریی شۆڕشەکان لەسەر کورد، تەنها کاریگەرییەکی پۆزەتیف و بەقازانجی کورد بووە. گەلێک جاریش دەستبردن بۆ شۆڕش و وەلانانی سازش بووەتە کاریگەرییەکی نێگەتیف و زیان پێگەیەنەری کورد و کوردیش گەلێک هەلی لەدەست چووە، بۆ بنیاتنانی ژیانێکی ئارام و پڕلە ئاسایش، بەهۆی خراپ هەڵسەنگاندن و زوو پەنا بردنە بەر شۆڕش و توندوتیژی، سەرەڕای ئەوەی کە شۆڕشەکان زیانیان بەداگیرکەران گەیاندووە، بەڵام لەڕاستیدا چەندانی ئەوە زیانیان بەکوردیش گەیاندووە.

**چوارەم،** پەسەندکردنی ڕێبازی مێژووی درێژخایەن بەمانای ئامادە بوونی گۆڕانی هەر شتێک: لە بیرکردنەوە سەبارەت بەشێوازی نووسین و دەربڕینی بیروباوەڕەکان

له دەوری مێژوو تا پەسەندکردنی گۆڕانکارییەکان له هەموو ئاستەکانی شوێنی و کاتی و مرۆڤایەتیدا و پاشان کاریگەریی هەموو ئاست و گۆڕانکارییەکان لەسەر پەیدا بوونی مێژوویەکی درێژماوە و بەردەوام تاکاتی ئێستا و تەنانەت کاریگەریی ئەو مێژووە و ئاستەکانی لەسەر ئایندەش. قوتابخانەی ئانال، مێژوو بە پرسێکی کراوە و چەند لایەنە و بەردەوام و ئاڵۆزکەر دەناسێت و ئامادەیە تێگەیشتنی خۆی بسازێنێت لەگەڵ هەر گۆڕان و بەردەوامبوونێکدا کە ڕوو دەدات. وێڕای ئەمانەش کاریگەرییەکانی ئابووری، جوگرافیا، مرۆڤ و کۆمەڵناسی دەتوانێت لەسەر بوون و پەیدابوون و گۆڕان و بەردەوامبوونی مێژوو دەوری هەبێت و تەنانەت بیر و باوەڕ و ئایدۆلۆژیاکانیش بەدەوری خۆیان کاریگەرییان هەیە لەسەر دروستبوون و گۆڕانی مێژوویی.

دەست ڕاگەیشتن بەڕاستیی بوونی مرۆڤ و سروشت، مۆنۆپۆڵکراوی هیچ یەکێک له زانستەکان بەتەنها نییە، هەرچەندە مەنتقی لێکدانەوەی ئەم زانستانە ئەو مانایە بەدەستەوە دەدات کە هەق و ڕاستی تەنها له لای ئەو زانستە یان ئەو بیر و باوەڕەیە بۆ بەدەستهێنانی مانایەکی ڕاستیی بوونی مرۆڤ و سروشت و مێژوو. برۆدێل (له پێناوی نووسینی مێژووی) زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا سوود له هەموو ڕشتە و زانست و بیر و باوەڕەکان وەردەگرێت، چونکە گرنگیی سەرەکیی مێژووی بنیاتنراو لەسەر دەورانی درێژخایەن له گرەوی ئەوەدایە کە بەڕاستی چەند لایەن و ئاست و بیر و باوەڕ و زانست و ڕووداوەکان، بۆ تێگەیشتنی ئەو مێژووە بەکاریگەر بزانێت.

**پێنجەم**، نوێگەریی برۆدێل له نووسینەوەی مێژوودا، کاریگەرییەکی گەورەی کردووەتە سەر ڕێبازی مێژوویی دوای خۆی و توانیویەتی قوتابخانەکانی دیکە له قوتابخانەی گێڕانەوە یان کورتخایەنی ڕووداوەکان، تا قوتابخانەی مارکسیستی پشت بەستوو بە تێگەیشتنی مادی له مێژوو بەجێ بهێڵێت و ئاسۆیەکی نوێ، فرە، چەند ئاستی، چەند تێگەیشتن، بەردەوام و گۆڕاو له مێژوودا بەدی بهێنێت بەیانی ئەوە بکات کە تاکە لێکدانەوەیەک، ئاستێک، هۆکارێک، کاتێک کە دابڕاو و نەگۆڕن ناتوانێت دەستی ڕابگات بەتێگەیشتنی نزیک و گونجاو له سروشت، مرۆڤ مێژوو. لێکدانەوەکانی برۆدێل دەتوانێت نەک تەنها نووسینەوەی مێژوو بێت، بەڵکو بۆ خۆی

هەوڵێکە بۆ بەدیهێنانی "فەلسەفەیەکی نوی بۆ مێژوو" یەکێک لە کارە هەرە گرنگەکانی برۆدێل ئەوەیە کە ئێمە ڕزگار دەکات لە تاک ئەندێشی و دوگم (جەزم) ئەندێشی و لە ناسنامە داخراو و تاک و نەگۆڕەکانیش وەرمان دەچەرخێنێ، بۆیە بەڕاستی دەتوانین بڵێین کە برۆدێل یەکەمین مێژوونووسی پۆست مۆدێرنە(٥).

**شەشەم**، قوتابخانە و تیۆری مێژووی درێژخایەن، وێڕای ئەو خالانەی کە پێشتر باسمان کردن، گرنگی دەدات بە کاریگەریی ڕژێمە سیاسی- کۆمەلایەتی- ئابوورییەکان و ڕووداوەکان (بەڕووداوی پێویست و پەیدابوو لە ئەنجامی شوێن، سیستەم و ڕووداوەکانی پێشوو تا ڕووداوە ڕێکەوتەکانیش کە هەندێک جار دەتوانێت کاریگەریی هەبێت) و بکەرەکان (بکەری کۆی کۆمەلایەتی و بکەرە تاکەکان) دەوریان هەیە لە نەخشاندنی مێژوو وە بەردەوامبوون و ئالوگۆڕەکانی. بەشێوەیەکی گشتی برۆدێل و تیۆرەکەی سەرەڕای ئەوەی کە گەلێک توخم و ئاست و کاریگەریی مێژووی نوێی بۆ تێگەیشتن لە مێژوو زیاد کردووە، دەستبەرداری لێکدانەوەکانی پێشوویش (لێکدانەوەی مارکسیتی و تیۆری مێژوویی کورتخایەن) نابێت و لەگەڵ ئەوانیشدا دەتوانێت هاوئامێزانی و کۆدەنگی بۆ ناسین و شارەزابوونی مێژوویی بەدی دەهێنێت و هەوڵ ئەدات لە هەر کەنالێکەوە، ئاستێکەوە، بەهۆی هەر بیر و ئەندێشەیەکەوە بێت، مێژوو و کاریگەرییەکانی مێژوو بناسین و لێوەی فێربین، ئەمە وێڕای درێژ بوونەوە و بەردەوامبوونی مێژوو بۆ کاتی ئێستا.

لە بەشەکانی داهاتووی ئەم نووسینەدا، هەوڵ ئەدەم کە بە پێی تێگەیشتنی تیۆری مێژووی درێژخایەنی فرنان برۆدێل، خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ گەڕانی کورد بەدوای خۆیدا بنووسم.

سەرچاوە

(١) جان لچت، پنجاه متفکر بزرگ معاصر، (از ساختارگرایی تاپسا مدرنیته) ترجمە، محسن حکیمی، انتشارات خجستە، تهران ١٣٧٧ (١٩٩٨).

(٢) هەمان سەچاوە.

(٣) و(٤) و(٥) هەمان سەچاوە.

بەشی (تاریخ نگاری ساختاری)، فرنان برۆدێل.

# بەشی یەکەم

* هەموو زانایان و شارەزایانی نەتەوایەتی و ئەسنۆگرافیا لەسەر ئەوە هاوڕان کە زۆربەی نەژادەکانی[1] جیهان ئەم قۆناغانەیان بڕیوە کە بریتییە لە خێزان، خێڵ، ناوچە، میللەت (القوم) و نەتەوە. ئەم قۆناغانە هەر یەکەیان لە دوای ئەوی دی دێت و بەبۆنەی قۆناغەکەی پێش خۆیەوە، پلەیەکی پێشکەوتووتری ژیارییە. قۆناغی خێزان کاریگەریی ئەوتۆی لەسەر نەژادەکان نییە، واتە کاتێک دەتوانین بڵێین نەژادێک بەرەو دروستبوون دەچێت کە بچێتە قۆناغی خێڵەوە و ئەویش لە ئەنجامی کۆبوونەوەی چەند خێزانێک پێک دێت. لێکدانەوەی نەژادی کورد، لەم قۆناغەدا (خێڵ) بەخێڵە ئارياييەكان، خێڵە زاگرۆسییەکان، خێڵەکانی میسۆپۆتامیای باکوور و ئەنادۆڵ ەوە گرێ دراوە. بۆیەش دەڵێم گرێ دراوە و ناڵێم کتومت کورد بریتییە لەو خێڵانە، چونکە هەر ئەو خێڵانە پەیوەندییان بە نەژادەکانی دیکەوە هەیە، بەتایبەتی نەتەوەکانی دیکەی ئێرانی (ئاریایی). لە ڕاستیدا ئەگەر بێتو واز لە ڕوانینی نەژادپەرستانە بێنین و بە چاوێکی مێژوویی- زانستی- مرۆڤایەتییەوە لە دروستبوونی نەژادەکان بکۆڵینەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هیچ نەژادێک لە تەنها سەرچاوەیەکەوە پەیدا نەبووە و نەژادی تاک و پاک "نقی" Pure لەناو میللەت و نەتەوەکاندا بەدی ناکرێت و هەموو نەتەوەکان (بەتایبەتی ئەوانەی لەنزیکی یەکتر دەژین) پەیوەندیی نەژادییان بەیەکترەوە هەیە و خێڵەکان سەرچاوەی پێکهاتنی ئەو نەتەوانەن. خێڵەکانی زاگرۆسی و ئاریایی بەو پێیەی پەیوەندییان بە کوردەوە هەیە، هەر بەو ڕادەیەش سەرچاوەیەکن بۆ پێکهاتنی نەتەوەی فارسیش.

لەگەڵ پەیدابوونی میدیا لە دەوروبەری (٧٠٠پ.ز) کورد دەچێتە قۆناغی میللەتەوە و لە ئەنجامی یەکگرتنی خێڵەکانی داننا، ماد، میهری، خۆرییەکان و خێڵەکانی دیکەی زاگرۆس و ئەریزانتییەکان (ئاری) قەوارەی میللەتی میدیا پێک دەهێنن و بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەم ناوچەیەدا، دەسەڵاتی شار و دەوڵەتی شار (هەمەدان)

پێک دێت. بەشێک لە مێژوونووسەکان و سەرچاوەکان دەڵێن کە میدیا بەتەواوی باپیرە گەورەی کوردانن و هەندێکی تریان دەڵێن سەرەتای هاتنە ناو مێژووی وڵاتی ئێران و ئارییەکانە، واتە میدیا دەبەنەوە بۆ هەموو ئێرانییەکان نەک تەنها بۆ کورد.
بەڵام ئەگەر تەماشای سەرچاوەکانی سەردەمی میدیا و کەمێک پاش میدیا (ئاڤێستا، بەردە تاشراوەکانی بێستون و نووسینە گریکییەکان) بکەین لە بۆچوونی دووەم نزیک دەبینەوە و میدیاش (میللەت)، هەر وەکو خێڵە زاگرۆسییەکان و ئارییەکان، بەشێکە لە نەژادی ئاری و ئێرانی و بەپێی وتەی خودی زەردەشت و ئاڤێستا[٢]، کە زمانی نووسراوی میدیایە، زمانەکەیان و نەژادەکەیان بە "ئێریەن ڤاچ" ناسراوە کە مانای (ئەوانەی بەئاری ئەدوێن) دەدات. ئێریەن واتە ئاری و ئاریایی و ڤاچ واتە دواندن و ئێستا بووەتە (وێژە، واتە، واژە، وتە، وشە و لە لای هەورامییەکان ماچۆ). بەپێی ئەم بەڵگە کۆنانە دیسان دەتوانین بڵێین کە میدیا هەر بەشێکە لە نەژادی ئاری و لەم سەردەمەشدا، نەژادی ئاری هەر پێکەوە بوون و دابەش بوون (بۆ کورد و فارس) لە گۆڕێدا نییەو بەڵام دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت کە ئەم گۆڕان و بەرەو مێژوو چوونە (زانا ئێرانییەکان دەڵێن یەکەم جار وڵاتی ئێران و نەژادی ئاری لە ساڵی "٧٠٠پ.ز"دا و بەدواوە هاتنە ناو مێژووەوە، سەردەمی پێش میدیا بە سەردەمی ئەفسانە و پێش مێژوو دادەنرێت)[٣] لە ڕۆژئاوای ئێران، لە میدیا و لە کوردستانی ئێستادا بوو[٤].

لە نەمانی (رووخانی) میدیا و هاتنە سەرکاری هەخامەنشی، دیسان هەمان لێکدانەوە دێتە گۆڕێ و هەر وەکو میدیا بەشێکە لە نەژادی ئاری، هەر بەو شێوەیە هەخامەنشیش بەشێکە لە نەژادی ئێرانی، بەڵام ئەمیان لەناوەڕاست و باشووری ئێران (پارس). ئەگەر تەماشای وشەی (کۆرش) بکەین کە دامەزرێنەری دەسەڵاتی هەخامەنشییە و لە وشەی کوردەوە نزیکترە تا لە وشەی فارس (پارس) و پاشان کۆرش کچەزای ئاستیاگە کە دوا پاشای میدیاکانە. لەناوچوونی دەسەڵاتەکان و جێگرتنەوەی بەدەسەڵاتی دوای خۆی مانای گۆڕانی نەژادەکانیش نادات، بەڵکو تەنها گۆڕینی دەسەڵاتی خێزان و بنەماڵەکانە. ئەم ڕەوشە لە مێژووی ئاریادا بەردەوام دەبێت و تەنانەت ساسانییەکان کە بەهێزترین و درێژماوەترین دەسەڵاتی

ئارییە هەر لەو چوارچێوەیەدا لێک دەدرێتەوە، نەک ئیمپراتۆریایەکی فارس و دژ بەکورد، بەڵکو دەسەلاتێکی ئاریاییە[٥]. دەسەلات و دەوڵەتەکانی ناو ئێران هەتا هاتنی داگیرکەرانی عەرەبی ئیسلامی و بە زۆر بەئیسلام کردنی ئارییەکان (بەکورد و فارسەوە) دەتوانین تەنها ناوی نەژادی ئاریان لێ بنێین، نەک کورد و فارس بەو مانایەی کە ئێستا بەکار دەهێنرێت.

* کاتێک لەشکر و دەسەلاتی عەرەبە داگیرکەرەکان بەزۆر دینی زەردەشتیان نەهێشت و خەڵکیان کردە ئیسلام هیچ جیاوازییەکیان لە نێوان دانیشتوانی (میدیا و پارس)دا نەکرد و هەموو کەسیان لە ڕێگای شمشێر و باج و سەرانەوە (جزیە) کردە ئیسلام. شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کە دژ بەداگیرکاری عەرەبی ئیسلامی دەکرا، دەبی هەر لەو چوارچێوە و هەر بەو ڕوانگەیەوە لێک بدرێتەوە. خەباتی کوردەکان و ئێرانییەکان لە دژی داگیرکردنی ئیسلامی دوو سەدەی خایاند و لە سەدەی حەوت تا سەدەی نۆیەمی زایینی بەردەوام بوو. لە سالانی (٦٠٧- ٦١٦ز) هۆزەکانی کوردی گابانی و مەیموون لەناوچەکانی تکریت و نەینەوا و هەڵوان (حلوان) بۆ یەکەم جار ڕوو بەڕووی سوپای بەدەویی عەرەبی ئیسلامی بوونەوە و پاشان کوردەکانی زاگرۆس توانییان تا ساڵی ٦٣٧ز بەسەرکردایەتیی سەرکردەیەکی کورد بەناوی (مەهران)، هێرشی عەرەبەکان لە شوێنی خۆیان ڕابگرن. بەشداریی جەنگاوەرانی کورد و فارس لە ڕۆژهەلاتی خووزستان و ناوچەی پارسدا لە ژێر فەرمانی دەسەلاتی ساسانیدا بۆ بەرگری کردن لە شارەکانی ئەهواز و فەسا و دارابگەرد، یەکێکە لەو نموونانەی کە ئێرانییەکان بەدژی داگیرکاری عەرەبە ئیسلامییەکان نواندیان[٦].

دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریای ساسانییش، ڕاپەڕین و بەرەنگاریی ئارییەکان لە بەرامبەر سوپای عەرەبی ئیسلامیدا کۆتاییی نەهات و ڕاپەڕینی لێرە و لەوێ و ناوچەیی و بەتایبەتی ناوچە دوورە شاخاوییەکان (کوردستان) کۆتاییی نەهات و سەرەنجام ڕاپەڕینی خوڕەمی (٨١٧- ٨٣٨ز) بە سەرکردایەتی بابەکی خوڕەم، یەکێکە لە بزووتنەوە گەورەکان بۆ ڕزگارکردنی نەژادی ئاری لە چنگی دەسەلاتی داگیرکەر و سەرهەڵدانێک بوو بۆ ئازادبوونی کۆمەلایەتی لەدەستی ستەمگەریی ئیسلامی. لەشکر و هێزی خوڕەمییەکان (کە ڕەنگی سووریان بۆ مێزەر و ئالاکانیان

هەڵبـژارد بوو)[٧] لە خـەڵکـی زۆربەی ناوچەکـانی کـوردسـتـان و ئێران پێک هاتبوو، بەڵام قورسـایی و مەڵبەندی بزووتنەوەکـەیان لە ناوچەی ئازەربایجان (ئاگرپایەکان – ئاترۆپاتین)[٨]دا بوو.

لە سـەدەی سـێی کـۆچی بەدواوە (سـەدەی نۆی زایینـی) لە ناوچەی لورسـتـان و لە ڕۆژئاوای ئێران، بزووتنـەوەیەکی دینیی بەهێز لەسـەر دەستی باڵوولی ماهی (باڵوولی مـادی) دەسـتـی پێ کردبوو بۆ زیندوو کردنەوەی ئایینی ئێران (ئایینی کوردان) کە بەڕێبـازی ئەهلی هەق نـاسـرا و پاشـان لە سـەردەمی سـان سـەهاکی بەرزنجی گۆرانـیـدا (سـاڵی ١١٨٢ز لەدایک بووە) ناوی یارسـان و کاکـەیی بۆ زیاد کـرا و ئەم جووڵانەوەیە (فـەرهەنگی- دینی نەک سیاسـی- کۆمـەڵایەتی) بەئاشـکرا بانگەوازی ژیانەوەی ئایینی ئێرانی (کوردی)ی دەکرد و داوای دەکرد کە بگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕێباز و سـەرچاوانە، بەڵام لەژێر کـاریگـەریی عـەرەبی ئیـسـلامـیـدا، چەندین توخم و ڕەمز و دۆگـمـای ئیـسـلامی تێکەوت و بۆ یەکـەم جـار (لەژێر داگـیـرکـاری و ترس و چەوسـانەوەدا) شـێواوی و نامۆ بوون "قلق" کـەوتە ناو فـەرهەنگی ئاری و کوردەکـان (ئێرانیـیـەکـان!) ناچارکـران پـەیوەسـت بن بەڕواڵەت و دەربڕینـی نائاری و نانەژادی، بـەڵام دەروون و ناوەڕۆکـی زەردەشـــتـی و ئێـرانـی وازی لـێ نـەهـێـنـرا[٩]. هـەر بـەو شـێوەیە بزووتنەوەکـانی عـەلەوی (قـزڵبـاش)[١٠]، ئیـسـمـاعـیـلی، ئێزیدی هـەرچەندە دەربڕینیـان لـەگـەڵ ئەهلی هەق و لـەگـەڵ یەکـدیدا (سـەبارەت بە شـوێن و زەمـان) جیاوازی هـەیە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا هـەر هەمان بیر و بۆچوونی دینیی ئاری هەیە.

سەردەمی ئیسلام و داگیرکـاریی ئیسلامی، بۆ ئارییەکان هەر تەنها داگیرکردن و بەزۆر لەدین وەرگێڕان و تەسلیم کردنی خـەڵک نەبوو بەدینی بێگانە (ئیسـلام)، چ لە ڕێگای بەزۆر (بەزەبری شـمشـێر) یان لە ڕێگای فشـاری ئابوورییەوە (دانانـی "جزیە" لەسـەر ئەوانەی کە نـەدەبوونە ئیـسـلام و کـەوتـنە ژێر باری چەوسـانەوەی ئابووری)، بەڵکو سـەرەتایەک بـوو بۆ لێک ترازان و هـەڵگەڕانـەوە و دوور کـەوتنەوە و لەبـەریەک هەڵوەشـانـی ئەو نەژادە و سـەرەنجـام دابەشـبـوونـی بۆ ناوچە و مـیـللـەت "القـوم" و دەسـەڵاتۆکـەی جیـاواز و تـەنانەت ژیانەوەی خـێڵایـەتی لە بەرژەوەندی داگـیـرکـەران.
نەژادی ئاری دەمێک بوو قۆنـاغی خێڵی بڕیبوو کە ئەو خـێڵانە خاوەنی دەسـەڵاتی –

هۆزی خۆیان (شاهۆزەکان) بوون و پەرپیبوونەوە بۆقۆناغی میللەت (یەکگرتنی خێڵەکان) و دەسەڵاتی شار و دەوڵەتی شارەوە، بەڵام دوای داگیرکردنی ئیسلامی، دەسەڵاتی ناوچەکان و شاهۆزەکان دەستی پێ کردەوە، جا یان لە ڕێگای دامەزراندنی قەوارەی دەستکردی سەر بەناوەندی دەسەڵاتی ئیسلامی، یان لە ڕێگای ئەوەی کە ئەو ناوچانە بتوانن ئەوەی کە ڕزگار دەکرێت ڕزگاری بکەن لە چنگی داگیرکردن کە ئەمەش لە دوو ڕێگاوە یان هەڵگەڕانەوە و شۆڕش یان بەهۆی سازش و سازان لەگەڵ دەسەڵاتی داگیرکەر و دامەزراندنی قەوارەی بچووک و ناوچەیی و دابڕاو و سەرکزکردنی دەسەڵاتدارانی ناوچەیی بۆ پاراستنی هیچ نەبێت ناوچەکەی خۆیان و خۆ دوور خستنەوە لە شەڕ و شۆڕ. سەرەڕای هەوڵەکانی کە باسمان کردن (خورەمی، ئەهلی هەق، عەلەوی و ئێزیدی) بۆ گەڕانەوە سەر دینی باب و باپیران و فەرهەنگ و گیانی نەژادی (ئاری) و بەڵام ئەم جووڵانەوانە ناچارکران (مەحکووم کران) بەچەند ڕەوشی کاریگەر و بڕیاردەر کە تا ئێستا لە پانتایی و قووڵاییی (کوردا) کاردەکات.

یەکەم، سەبارەت بە بەهێزی و دڕندەیی دەسەڵاتی داگیرکەر و ستەمگەریی عەرەبی ئیسلامی، ئەو بزووتنەوانە وادارکران کە بەرگ و دەربڕینی سەردەم (سەپێندراو) بپۆشن و نەتوانن بەئاشکرا ڕای بگەیەنن کە ئەمان دەیانەوێت دینی نەژادیی خۆیان زیندوو بکەنەوە و بگەڕێنەوە سەر مێژوو و فەرهەنگی خۆیان.

دووەم، هەر سەبارەت بەبەهێزیی ئەو دەسەڵاتە، ئەم سەرهەڵدانانە (جەماوەری یان فەرهەنگی) نەیاندەتوانی لە تەواوی پانتایی وڵاتی ئێران و کوردانداا بڵاوببنەوە و بۆیە بەناچاری لەناوچە جیاجیا و دوورەکاندا (چیاکان) قەتیس مابوون و نەیان دەتوانی بڵاوببنەوە. ئەگەر بیانویستایە سەر بەنەژاد و فەرهەنگی خۆیان بن دەبێ لەژیان و پێداویستییەکانی سەردەم (شارەکان) دووربکەونەوە و بێبەش بن لە ژیانێکی ئارام، پێشکەوتوو شارستانی (بەپێی پێوەرەکانی سەردەم) و ئەگەریش خوازیاری ژیانێکی ئارام و بەهرەمەند بوونایە دەبوایە (مەحکووم بن) بەوازهێنان لەدین، فەرهەنگ، ڕۆح و دەروونی نەژادی و تەسلیم بوونایە بە دین و فەرهەنگ و ڕۆحی داگیرکەران. لێرەوە بەدواوە دوو کەرتبوون و چەند کەرتبوون، ڕووی دا و لە

(چیـا) بوون دابڕان لە ژیانێکی بەهرەمـەند و ئاسـایش و کـەوتنە ناو ڕاپەڕین و شـۆڕشـەکـانەوە و ئەوانەی لە تەختـایی و شـارەکـانیـشـدا دەژیان، دەبووایە لەژێر چەپۆک و ڕەحمی داگیرکەراندا وازیان لە تایبەتمەندییەکانی خۆیان بێنایە، یان لانی کەم دەبووایە ڕێگای سازش و سـازانیان بگرتایە بەر (نموونەی ئەهلی هەق، عەلەوی، ئێزیدی، و پاشان تەسەوف و عیرفان).

**سێیەم**، لە ئەنجامی لێکترازانەکـان (چ ئەوانەی لە ڕاپەڕینەکـاندان و چ ئەوانەی لەبەردەسـتی داگـیـرکـەراندان) پەیدا بـوونی جـیـاوازی و نـاکـۆکی نێـو نەژادی ئاری (ناوچەی مـیدیا و کـوردسـتـان بـەهـۆی نزیکییـان لە ناوەندی دەسـەڵاتی ئیـسلامـەوە) و هەوڵدان بۆ خۆگونجاندنی ئەو ناوچانەی لەبەردەستی دەسەڵاتدارانی تازەدان، لەگەڵ داگیرکەراندا و زۆر جاریش دیارە بە قیمەتی دژایەتی کردنی ناوچەکانی دیکە دەبێت (ئەوانەی کە هـەڵگەڕاونەتەوە) و سـەرەنجـام بەکـارهێنانی تەسلیم بووەکـان (زۆربەی جـار نـاچارکـرابوون کـە تەسلیم ببن) بـەدژی ڕاپەڕیوەکـان و پەیدا بوونـی ڕەوشی نۆکـەرایەتی و جـاشـێـتی بەدژی ئـەوانەی کـە دوێنی لە هـەمـان نەژاد بوون. **چوارەم**، سـەرەنجـام، دابڕانی ناوچەکـان لـە یەکدی و گـرێ نـەدرانەوەی مـێژووەکـان پێکەوە و ناچار بوون بەوەی کە لەگـەڵ یەکتری نەبن و هـەموو مێژوویەکی نوێش هەوڵ بدات کە سـەرلەنوێ و بە پشت بەستن بەهێزی ناوچـەیی و کـاتیی خـۆی، دەست بکاتەوە بەخـۆ بنیاتنان، واتە ناچار بێت لەگەڵ ئەو ناوچانە نەبێت کە وەکو خۆی نین (چ ئازاد یان داگیرکراو یان دۆڕاو) و لەگەڵ ئەو زەمەن و مێژووەشدا نەبێت کە خـزمەت بەڕەوشی ئێـسـتـای ناکـات (کە بێگومـان ئەو ڕەوشـە سـەپێندراوە). ئایینی ئەهلی هـەقی لێ دەربچی کە توانیی بەشێکی زۆری باکووری ئێران و باشوور و ڕۆژئاوای مـیدیا هـەتا شاری مووسڵی ئێستا بـگرێتەوە[١١]، هەمـوو جووڵانەوەکان نەیاندەتوانی بەرینایی گـەورە بەدەست بهـێنن و لێـرە بەدواوە، ڕێگا خـۆش بوو بۆ پەیدا بـوونی مـیـرنشـینە ناوچەیی و ئایین و فەرهەنگە زۆرەکانی وڵاتی ئێمە.

بەرەنگاریی بەهێز و جەماوەریی خەڵکی وڵاتی میدیا لە بەرامبەر داگیرکەرانی نوێ هەر لە خوڕەم دینەکان، ڕوزامیە، هەرێرییە، توانییان مـاوەیەکی زۆر ڕێگا لە هێرشی بێگانەکـان بگرن، بە سـەرەتای بەرەنگاربوونەوەی نـەژادی ئاری دادەنرێت و بۆ

پاراستنی وڵات، دین و فەرهەنگی خۆیان. لەدوای دەسەڵاتی عەباسییەکان (٧٥٠-١٢٥٨ز) کە ئەوانیش بەهۆی ڕاپەڕینەکانی ئەبوو موسلیمی خوراسانییەوە توانییان دەسەڵاتی ئەمەوییەکان لەناوبەرن، زۆری نەخایاند کە چەندین بزووتنەوەی گەورەی جەماوەری لە دژیان و لەسەر بنچینەی جیاوازیی ئایینی و مەزهەبی و گیر وگرفتەکانی کۆمەڵایەتی، سەریان هەڵدا و بەشداریی کورد لە بزووتنەوەکانی ئیسماعیلی، خەواریج، ڕاپەڕینی یەعقوبی سەفار (٨٦٨- ٨٧٩ز) و شۆڕشی ڕەش پێستەکان (زەنج) (٨٣٨ - ٨٦٨ ز) و بەڵام بزووتنەوەی هەرە بەهێز لەڕووی ئیدۆلۆژی و بنکەی جەماوەرییەوە، ئەوەی بابەکی خوڕەمییە (٨١٧- ٨٣٨ز) کە زۆر جاران بەشۆڕشی چینایەتی ناو دەبرێت(١٢).

ڕاپەڕینی میر جەعفەری کوردی (میر جەعفەری کوڕی میهرجەش) کە ساڵی ٨٣٨ز لە دژی دەسەڵاتی خەلیفەی عەباسی موعتەسەم بیللا (٨٣٣- ٨٤٣ز) لە ناوچەی مووسڵ هەڵگیرساوە و هەموو نێوان مووسڵ و ئازەربایجان و ئەرمینیای گرتووەتەوە تا ساڵی ٨٤٠ز خایاندووە و لە ئەنجامدا (ئایتاخ) سەرکردەی سوپای خەلیفە، هێزەکانی میر جەعفەری تێک شکاند و بزووتنەوەکەی لەناوبرد. ئەمە یەکەمین پێکدادانی کورد و تورکیشە لە مێژوودا، چونکە ئایتاخ خۆی و هێزەکانی تورک بوون. دەوری توخمی تورک لە ڕۆژگاری خەلیفە موعتەسەمەوە دەست پێ دەکات. ئەبوو سەعدی خوا ڕەیزمی پەنای بردە بەر ئەبوو ڕەبیعی کوردی لە شارەزوور و ساڵی ٩٠٦ دژی خەلیفەی عەباسی ڕاپەڕین و بزووتنەوەکەیان ماوەیەک بەردەوام بوو تا خوارەزمی کوژرا و ئنجا کپ کرایەوە. جگە لەوەش محەمەدی کوڕی خورداذی شارەزووری، یەکێک بوو لە سەرکردە ناودارەکانی خەواریج و لە ناوچەی مووسڵ هەتا ناوچەکانی حەدیسە، تکریت، سنجار و نەسیبینی گرتەوە و تا ساڵی ٨٩٦ سوپا و هێزەکانی خەلیفەی بەغدادی نیگەران کرد بوو. ئەم ڕاپەڕینانە بەدوا ڕاپەڕینی کوردەکان و ئێرانییەکان دادەنرێت بەدژی دەسەڵاتی ئیسلامی و خەلیفەی موسڵمانان و پاشان سەردەمێکی نوێ لە پەیوەندی نێوان ناوەندی دەسەڵاتی ئیسلامی و کورداندا دەست پێدەکات و هەر بەو شێوەی کە باسمان کرد ڕێکەوتنێک بەقازانجی دەسەڵاتی ئیسلامی رووی دا و بۆ دواجار کورد و دەسەڵاتی کوردی، دینی خۆیان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە ئیسلام و لە بەرامبەریشدا کوردەکان،

تەنها بۆ ماوەیەک ژیانێکی نیمچە ئارام و نیمچە سەربەخۆ و نیمچە نەژادی و کوردانەیان بوو بە نسیب. ئەوەی کە لە مێژوودا ناو دەنرێت میرنشینە کوردییەکان، تەنها دەکرێت لەو چوارچێوەدا باسی لێ بکەین.

* پەیدا بوون و دامەزراندنی میرنشینەکانی مەروانی (دۆستەکی) لە کوردستانی ناوەڕاست (جزیرە و دیاربەکر کەشاری فارقین پایەتەختەکەی بوو- ٩٨٢- ١٠٨٦) میرنشینی دینەوەر، شارەزوور، میرنشینی فەزڵەوی (لوڕی گەورە)، میرنشینی مینای ڕەوادی (١٠٢٩- ١٠٣٥) لە تەورێز و میرنشینی شوانکارە (١٠٣٠- ١٣٥٦) ز" لە فارس- ئەسفەهان، بەو پێیەی کە تەواو ئیسلام بوونی کوردیان لەسەر ئاستی دەسەڵات و خەڵک ڕادەگەیاند، هەر بەو ڕادەیەش هەوڵێکی سیاسیی گونجاو بوو بۆ پاراستنی وڵاتی کوردان و دەسەڵاتی ناوچەیی. ئەم ڕەوشە دوو باری تایبەتی بە کوردستانی لێ کەوتەوە. یەکەمیان، تاڕادەیەک ئازادی و نیمچە سەربەخۆیی تیادا بوو. دووەمیش، ناوەندی دەسەڵاتی ئیسلامی توانی بەشێوەیەکی ڕەسمی و لە ڕێگای ئەو میرنشینە کوردییانەوە زەمانەتی مانەوەی کوردستان بکات لە ژێر قەڵەمڕەو و لە چوارچێوەی بەرژەوەندی خۆیدا و میرنشینەکانیش ناچار بکات، وێڕای دەسەڵاتی ناوچەییان، کە پابەندبن بەناوەندی خەلافەتی ئیسلامەوە. واتە پەیدا بوونی هەلومەرجێکی ناکۆکی و یەکێتی لەنێوان کورد و ئیسلامدا دەستی پێ کرد.

سەردەمی ڕاپەڕینەکان، سەردەمی شۆڕش و هەڵگەڕانەوە بوون و تاڕادەیەک قبووڵ نەکردنی دەسەڵاتی ئیسلامی و پەیدابوونی هەلومەرجێکی شەڕاوی و نائارامی لەوڵاتدا و لە کاتێکدا سەردەمی میرنشینەکان بەسەردەمی نیمچە ئارام و ئاسایش دادەنرێت، بەڵام بەقازانجی بەئیسلام بوونی یەکجارەکیی کورد و قبووڵکردنی دین، فەرهەنگ و دەسەڵاتی ئیسلامی و بەمانای نەگەڕانەوە بۆ ڕاپەڕین لە دژی ئیسلام.

پەیدا بوونی میرنشینە سەرەتاییەکانی کوردستان (قۆناغی یەکەمی میرنشینەکان)، کە هەندێ مێژوونووس و سەرچاوە بە دەوڵەتیان دادەنێن و، لە نیوەی یەکەمی سەدەی دەیەم و تا کۆتایی سەدەی یانزەیەم (دەسەڵاتی کوردی لە ئاترۆپاتین و ئاران، دەوڵەتی کوردیی مەروانی لە ئەنادۆڵ- کوردستانی ناوەڕاست- ، دەسەڵاتی بەرزیکانی لە زاگرۆس) بە دەستی داگیرکاری سەلجووقییەکان

کۆتاییـیان پێ دێت و دەسەڵاتی سەلجووقییەکان سەردەمێکی نوێ لە ژیانی وڵاتی ئێران و کوردستان بەدی دێنن.

* سەدەی دوانزە لە ژیانی وڵاتی کوردان و ئێراندا بە سەدەیەکی زۆر کاریگەر و سەرەتای دەستپێکردنی چەندین گۆڕانکاریی گەورە و چەندین بزووتنەوەی دینی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی دادەنرێت. لە ڕۆژئاوای ئێران و ناوەڕاستی کوردستاندا (هەکاری)، چەندین بزووتنەوەی بەهێزی دینی پەیدا بوون. سەرهەڵدانی ڕێبازی ئێزیدی (یەزدانی) لە ناوچەی هەکاری لەسەر دەستی ئادی کوڕی موسافیر (ساڵی ١١٦٠ مردووە)، وەکو گەڕانەوەیەک بۆ ئایین و فەرهەنگی زەردەشتی و مانەوی و میهری، بەڵام لە بەرگێکی نوێدا، دەستی پێ کرد.

زیندووکردنەوە و بەهێز بوونی ئایینی ئەهلی هەق (بەناوی یارسان - کاکەیی لە ڕۆژئاوای کوردستان) لەسەر دەستی سوڵتان ئیسحاق بەرزنجیی گۆرانی. پەیدابوونی بزووتنەوەیەکی ئەدەبی و فەرهەنگیی گەورە لە ناوچەی ڕۆژئاوای ئێران بەزاراوەی گۆرانی[١٣] و دەوڵەمەندکردن و بەهێز بوونی ئەو شێوە زارە و.کە تا سەرەتاکانی سەدەی هەژدەی خایاند و زاراوەی گۆرانی لە بەشێکی زۆری کوردستان و بەهۆی کاریگەری دینی ئەهلی هەقەوە بڵاوبووەوە و نزیکەی هەموو ناوچەکانی ئاترۆپاتین، موکریان، ئەردەڵان، کرماشان، لوڕستان، گەرمیان و مووسڵی گرتەوە و ئەمە یەکەمین جار و تاکە جاریشە کە لە مێژووی کوردا شێوەزارێک و ئایینێک و فەرهەنگێک ئەو بەرینایییە بە خۆیەوە ببینێت[١٤]. هەر لە سەدەی دوانزەدا ڕێبازێکی دینی بەهێز (تەریقەت)، لەسەر دەستی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧- ١١٦٦ز) کە خەڵکی گوندی گەیلانی لای کرماشان بوو، دەستی پێکرد و توانی بەرینایییەکی گەورە بەدەست بێنێت و پاشان توانیی بەنێوی (تەریقەتی قادری) و تا ئێستاش کاریگەرییەکی فراوان لەسەر ئایین و فەرهەنگی کوردی دابنێ. شێخ شەهاوی سوورەبەردی (شهاب الدین السهروردی) کە خەڵکی گوندی سوورەبەردی ناوچەی گەڕۆسە، هەر لە سەدەی دوانزەدا توانیی ڕێبازی (تەریقەتی) ئیشراقی لە تەسەوفدا بەدی بێنێت.

شێخ شەهابەدین بە یەکێ لە زانایان و خواناسانی گەورەی کورد دێتە ژمار و

گەلێ لە ناوداران و هۆنەران لە لای ئەو، وانەیان خوێندووە و کە یەکێ لەوانە، سەعدیی شیرازییە و ئەو ڕێچکەیەکی بەناوی "سوهرە وەردی"یەوە لە تەسەوفدا داهێنا و گەلێ شاگرد و کەسی پێ گەیاند و لە گەلێک لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا پەرەی سەند[١٥]. پەیدابوونی هەردوو ڕێبازی قادری و سوهرەوەردی لە کوردستان و لە سەدەی دوانزەدا، سەرەتای پەیدا بوونی ڕێبازێکی ئایینیی گەورە بوو کە دواتر بەتەسەوف ناسرا و بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و دڵنیایی و یەکبوون لەگەڵ خودا و، هەرچەندە ڕابەرانی سۆفیزم لەسەر چۆنییەتی گەیشتن بەو ئامانجە هاوڕا نەبوون و بۆیە لە ئەنجامدا چەند ڕێگە و شێوازێکی سۆفیگەری پەیدا بوون کە پێیان دەوترێت تەریقەت.

ئەم زاراوەیەش ماناکەی دەبێتە ڕێگای تایبەتی گەیشتن بەڕاستی و دڵنیایی و یەکبوون لەگەڵ خوادا و لەمانەش: قادری، ڕفاعی، شازلی، سوهرەوەردی، مەولەوی و نەقشبەندی. لە ڕاستیدا پەیدابوونی ئەم ڕێبازە لە کوردستاندا (سۆفیزم) دوو دەلالەتی گەورەمان بۆ ئاشکرا دەکات. یەکەمیان، ئەوە بوو کە ئیسلام بە پانتایی و قووڵاییی وڵاتی ئێران و کوردا‌ندا بڵاو بووبۆوە و، چونکە تەسەوف (هەموو ڕێبازەکانی) بۆ گەیشتن بە حەقیقەت بۆچوونێکی ئەرسەدۆکسی دینی پیشان دەدەن، هەم بۆ دەربڕینی نزیکایەتییان لەو دینە (ئیسلام)، هەم لەم ڕێگەیەوە دەیانەوێت نەیارییەکی نێگەتیڤ لە بەرامبەر دەسەڵاتی وەختیدا بەیان بکەن (بە پەنهانی) و سەرەنجام دیسان پەیدابوونی ڕەوشێکی ناکۆک و نامۆ و ناجێگیر «قلق» لەنێوان خەڵک (کورد) و دەسەڵاتی ئیسلامی. دووەم، وێڕای دەسەڵاتی ئیسلام لە تەواوی وڵاتدا، بەڵام هەردیسان ناوەڕۆکی گەیشتن بەخودا و بە حەقیقەت (لەلای کورد و ئێرانییەکان) هەر تایبەتی بەخۆیان و زۆر کەم ناوەڕۆکی دینی عەرەبی قبووڵ دەکرا، هەرچەندە ڕواڵەت و ناو و دۆگماکانی ئەو دینە بەسەر خەڵکیدا سەپێندرا بوون و تازەش لابردن و نەمانیان کارێکی ئەستەمە. ڕەنگە خوێنەر لەنێوان ئەم دوو خاڵەدا (کە باسم کردن) واتێ بگا کە ناکۆکییەک هەیە، بەڵام لێکدانەوەی من بەو جۆرەیە: دینی عەرەبی بەهەموو بەشەکانییەوە، تەنها پەیامەکانی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب و ڕێبازەکانی تەسەوفی لێ دەرچێت، کە بەشێکی زۆری مەشریقی و خۆرهەڵاتی و

ئێرانییە، دینی دەسەلآت و خەلافەتە. لە کاتێکدا دینی ئاری و کوردی هەر لە میهر و زەردەشت و مانی و مەزدەک هەتا ئەهلی هەق و عەلەوی و ئێزیدی و (تەسەوف!) دینی ڕۆح و مرۆڤی زانا و دانا و بالآدەستە، نەک دینی دەسەلآت. بەم شێوەیە (کورد و ئارییەکان)، ئامادەییەکی زەردەشتی، مانەوی، مەزدەکی یان هاویشتە ناو ئیسلامەوە کە ئامانج لەو کارە "گومان کردن بوو لە خودی ئەو دین و دەسەلآتە" و هەندێک لە نووسەران وەکو محمد عابد الجابری دەڵێن: ئێرانییەکان هێرشێکی ئایدۆلۆجیی فراوانیان (بەبەکار هێنانی فەرهەنگی دینیی خۆیان) بەدژی دینی ئیسلام دەست پێکرد کە ئامانجی ئەم هێرشە، گومان کردن و لەناوبردنی ئەو دینە بوو[١٦]. پاشان، هەر ئەو نووسەرەو دەگاتە ئەوەی کە دەڵێت: "خەونی" مەئموون بۆ وەرگێڕانی سەرچاوە زانستی و فەلسەفییەکانی یۆنان و ڕۆم، خەونێکی بێ مەبەست (بری) و تەنها لە پێناوی ئەرستۆ و گریکەکاندا نەبووە، بەڵکو بۆ مەبەستی بەرەنگاری کردنی زەردەشت و مانی بووە[١٧]. لێرەوە، دەردەکەوێت کە فەرهەنگی عەرەبی ئیسلامی هەتا ئەو کاتە، فەرهەنگێکی هەژار و بێدەسەلآت بووە، بەرامبەر بە فەرهەنگی ئێرانییەکان. تەنگوچەڵەمەی گەورەی کوردەکان و ئێرانییەکان، تەنها و تەنها دەسەلآتی بەهێز و چەوسێنەری خەلافەتی ئیسلامی بووە و بۆیە ناچار بوون کە بەرگی ئیسلامی بپۆشن (لەڕاستیدا ناچارکراون، هەر وەکو، باسمان کرد) بەلآم نەیاندەتوانی (ئێرانییەکان) واز لە ناوەرۆکی دینیی خۆیان بهێنن و سەرەنجام دڕدۆنگییەک و ناکۆکییەک لەنێوان دین (ناوەرۆکی زەردەشتی) و دنیا (دەسەلآتی وەختی ئیسلامیدا) پەیدابوو، بۆیە فەرهەنگی دینی ناچار بوو کە حاڵەتێکی پاسیڤیی «سلبی» کۆمەلآیەتی بەخۆیەوە بگرێت، بەلآم هەر نەیتوانی ناوەڕۆکی (ئەکتیف) «ایجابی» ئاریایی لە بیر و ئەندێشەی خۆیدا فەرامۆش بکات و لەئاکامدا هەموو ئایین و ڕێبازە دینییەکانی کورد و ئێران (ئەهلی هەق، عەلەوی، ئێزیدی، تەسەوف و عیرفان) وەکو دینی خودایی[١٨] یان ئایینی یەزدانی[١٩] بنیات نران.

هەر لە سەدەی دوانزەدا، پەیدا بوونی ناوی کوردستان، لەناو نووسراو و دەسەلآتی ڕەسمیدا پەیدا دەبێت. یەکەمین کەس کە زاراوەی کوردستانی بەڕەسمی بەکارهێنا، سوڵتانی سەلجووقی، سەنجەر (١١١٧- ١١٥٧ز) کە یەکێکە لە

گەورەترین سوڵتانەکانی سەلجووقی. ئەم ناوی کوردستانی بەشێوەی ڕەسمی دا بەو هەرێمە کوردییەی کە لەژێر دەسەڵاتی بوو، کە هەموو پانتاییە جوگرافییەکانی نێوان هەرێمی لوڕستان و ئازەربایجانی بە هەمەدان و دینەوەر و کرماشان و سنە و هەتا پشتی دەشتی شارەزوور و خەفتیان (هەودیان) لەسەر زێی گەورە لە خۆرئاوادا، دەگرتەوە و پایتەختەکەشی شاری «بەهار» بوو کە کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوای هەمەدانی ئێستا. ئەم هەرێمی کوردستانە لەڕووی جوگرافییەوە بەتەواوی یەکسان دەبێت لەگەڵ پانتاییی وڵاتی میدیا کە لە لایەن مێژوونووسە یۆنانی و ئێرانییەکانەوە بەکار هاتووە[٢٠]. پێش ئەم سەردەمە (کە بۆ یەکەم جار ناوی کوردستان بەشێوەیەکی ڕەسمی لەناو سەرچاوەکاندا بەکار هات) ناوەکانی وڵاتی میدیا، وڵاتی زۆزان «اقليم الجبال»، وڵاتی کوێستان (شاخاوی)، وڵاتی کاردۆخی یان کۆردۆین بۆ کوردستان و ناوچەکانی بەکار هاتووە.

لە دوای ڕووخانی ساسانییەکانەوە، ئەوە یەکەم جار بوو کوردستان (ئەو هەرێمە کوردییەی ژێر دەسەڵاتی سەلجووقی) بەشێوەی هەرێمێکی یەکپارچە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت بەڵام لەژێر دەستی دەسەڵاتێکی بێگانەی نزیکدا. پێش دەسەڵات و ئیمپراتۆریای سەلجووقییەکان، دەسەڵاتی خەلافەتی ئیسلامی لە دوور ڕا حوکمی ئێران و کوردانی دەکرد و هەموو ناوچەکانی کوردستان (بە پەرتەوازەیی و لێک دابڕاوی بەشێوەی دەسەڵاتی میرنشین و ناوچەیی) وەزعێکی ناڕەسمی و نیمچە سەربەخۆیان هەبوو لەگەڵ دەسەڵاتی خەلیفەی بەغدادا. بەڵام لەم سەردەمەدا دەسەڵاتی داگیرکەری نوێ لەناو ماڵی کورد و ئێراندا، ڕاستەوخۆ حوکمی دەکرد و یەکەمین کار کە کردی لەناوبردنی دەسەڵاتە ناوچەیییەکان بوو کە لە ساڵانی (١٠٣٨- ١١١٠ز) خایاند و پاشان بەتەواوی لێک جیاکردنەوەی هەردوو هەرێمی میدیا و پارس واتە دابەشکردنی (یەکەم دابەشکرن) لەنێوان کورد و فارسەکاندا هێنایە گۆڕێ، هەتا ئەو سەردەمە هەردوو ناوچەی هەمەدان و فارس (شیراز) بە دوو ناوچەی هاوبەشی و دینی و فەرهەنگی هەردوو میللەتی (قوم) میدیا و پارس دادەنرا، کە هەردووکیان بەشێک بوون لە نەژادی ئاری (ئێریانا)، بەڵام ئێستا دابەشبوونی ڕەسمی (سەپێندراو و لە لایەن سەلجووقی) دەستی پێ کرد و سەرەتای

لێک دوورکەوتنەوەی نەژادی ئاری بۆ میللەت و ناوچەی جیا جیا دەستی پێ کرد. یەکێکی دیکە لە کاریگەری دەسەڵاتی سەلجوقییەکان دابەشکردنی ڕەسمیی کوردستان بوو بۆ دوو قەوارەی جیاواز، یەکێکیان کوردستان (میدیا) و ئەوی دیکەشیان کۆردۆین کە لە دەرەوەی ئەم دەسەڵاتە بوو، بە وڵاتی کاردۆخی یان کۆردۆین ناوزەد دەکرا و ئەو ناوچەیە بوو کە کەوتبووە نێوان دەریاچەی وان و ناوچەکانی خۆرئاوای لە باکوور و تا شاری مووسڵی ئێستا لە باشوور، واتە ناوچەی باکووری کوردستانی ئێستا و هەرێمی بادینان، کە بەشی زۆری لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی مەروانی (دۆستەکی بوو) و بەشەکەی دیکەشی بەشێک بوو لە قەڵەمڕەوی خەلافەتی ئیسلامی لە بەغداد. واتە هاتنی سەلجووقییەکان، سێ کاریگەریی گرنگی کردە سەر ڕەوشی وڵاتی ئێران و کوردستان، **یەکەم**، بۆ یەکەم جار سەرەتای جیابوونەوەی کورد لە ئێران (پارس) دەستی پێ کرد و کورد و فارس لە یەک جودا بوونەوە و هەردووکیان یەکەمین هەنگاویان بەرەو پێکهێنانی دوو نەتەوە (نەژادی) جیاواز دەنا. **دووەم**، نەژادی کورد (میدیا و کۆردۆین) بۆ یەکەمین جار بەشێوەیەکی ڕەسمی لەیەکدی جیاکرانەوە و **سێیەمیش**، کە ئەوەیان زۆر کاریگەرە لەدوای ڕووخانی ساسانییەکانەوە (٦٤٠ز) تا سەدەی دوانزەیەم، واتە دوای ٥٠٠ ساڵ لە پشێوی، هەڵگەڕانەوە، شۆڕش و ڕاپەڕینەکان، دەسەڵاتی ناوچەیی و میرنشین و دووری لە ناوەندی دەسەڵاتی داگیرکەرانەوە، داگیرکەرێکی نوێی بەناو ئیسلامی و نا ئاری (تورکمان) لە نزیکەوە حوکمی ئەو نەژادەی دەکرد و سەرەنجام قۆناغێکی نوێ لە ژیانی ئەو نەژادەدا (بەو هەموو گۆڕانکارییانەی کە باسمان کردن) هاتە ژیانەوە.

یەکێکی دیکە لە دەسەڵاتە کاریگەرەکانی سەدەی دوانزە و سیانزە لەسەر کوردستان و ناوچەکە، دەسەڵاتی سەلاحودینی ئەیووبی (١١٣٧- ١١٩٣ز) و دەوڵەتی ئەیووبی بوو کە تا ساڵی ١٢٦١ز خایاند. هەرچەندە سەلاحودین و ئەیوبییەکان توانییان بەشێکی زۆری جیهانی ئیسلامی بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، بەڵام لە بەشی هەرە زۆری کوردستان دوور بوون. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای سەدەی یانزە (ساڵی ١٠٣٨ز)، بنەماڵەی ئەیووبی لەترسی دەسەڵاتی تورکمانە

سەلجووقییەکان لەناوچەی دوینی (ئاترۆپاتین و گەنجە)، هەڵاتبوون بۆ ناوچەی زرارەتی و تکریتی ئێستا و پاشان بەرەو شام و میسر چوون و دەوڵەتی ئەیووبییان لە میسر دامەزراند.

بەبڕوای من ئەمە یەکەمین دەوڵەتی سەربەخۆیە کە تیایدا بنەماڵەیەکی کوردی (ئەیووبی)، حوکمی بکات، ئەگینا هەموو دەسەڵات و دەوڵەتەکانی (لە ڕاستیدا باشترین ناو بۆ ئەو دەسەڵاتانە فەرمانڕەواییە)، سەرەتای سەدەی دەیەم تاکۆتایی سەدەی یانزە، بەشێک بوون لە قەڵەمڕەوی یان خەلافەتی ئیسلامی (بەغداد)، یان بەشێک بوون لە فەرمانداریی تورکمانە سەلجووقییەکان و نموونەی ئەمانەش بەهێزترین دەسەڵاتی کوردیی ئەو کاتە، فەرمان ڕەوایی دۆستەکی بوو کە ساڵی، ١٠٨٦دا ناچار بوو، ببێتە بەشێک لە ئیمپراتۆریای سەلجووقی.

سەبارەت بەنەخشی سەلاحودین و دەوڵەتەکەی بۆ کورد، دوو لێکدانەوەی جیاواز و دژبەیەک هەیە. یەکەمیان، پێی وایە کە دەوڵەتی ئەیووبی خزمەتێکی زۆری کوردی کردووە و بەیەکێک لە دەوڵەتە گەورە و کاریگەرەکانی کوردی حساب دەکەن(٢١). بۆچوونی دووەمیش، سەلاحودین و دەوڵەتی ئەیوبی زۆر بە کەمتەرخەم دەزانن لە بەرامبەر بەکورد و دەڵێن هیچ خزمەتی کوردی نەکردووە. ڕاستییەکەی ئەوەی ڕێگر بوو لەبەردەم ئەوەی کە دەوڵەتی ئەیووبی دەستی بەکوردستان بگات، چونکە بەڕاستی گەلێک دوور بووە لە کوردستانەوە و بەشێکی زۆر کەمی کوردستان نەبێت، کوردستانی ئێستای سووریا، دەسەڵاتی بەهێزی سەلجووقییەکان (کە خۆیان دوژمنی بنەماڵەی سەلاحودینن) لەمپەرێکی گەورە و کاریگەر بووە لەبەردەمی گەیشتنی دەوڵەتی ئەیووبی بەکوردستان و لەمپەرێکی دیکەش دەسەڵاتی خەلیفەی بەغداد بووە، جا یان دەوڵەتی ئەیووبی لەبەر پیرۆزی (بەپیرۆز دانانی خەلافەت)، توخنی ئەو دەسەڵاتە نەکەوتوون کە بەرەو کزی دەچوو (بەتایبەتی پاش هاتنی سەلجووقییەکان، فاتمییەکان لە میسر و بەهێزبوونی دەوڵەتی ئەیووبی لە شام و میسر) یان لەبەر ئەوە بووە کە دەرۆستی خەلافەت نەدەهات. هەر چۆنێک بێت سەلاحودین و ئەیووبییەکان گەلێک دوور بوون لە کوردستانەوە و نەیاندەتوانی خزمەتی کوردستان بکەن. هەندێک سەرچاوە دەڵێن کە ئەیووبییەکان لەناو خۆیاندا

بەکوردی دواون و زۆربەی کارە گرنگەکانیش بەدەستی خزم و کەسوکاری خۆیانەوە بووە[٢٢]. ئەم نەریتە یەکێک بووە لە ڕەوشەکان و ڕەواییەکانی (شەرعیەت دان) دەسەڵاتی بنەماڵەکان، لەپاڵ ڕەوایی شەریعەت و ئیسلام بووندا. بەم شێوەیە یەکێک لە بەهێزترین دەوڵەتە کوردییەکان ــــ (مەگەر دەوڵەتی میدیا هێندە بەهێز بوو بێت) نەیدەتوانی دەستی بەکوردستان بگات و کوردیش دیسان نامۆیی و دابڕان و لێکترازانێکی گەورەی بەنسیب بوو لەنێوان دەسەڵاتێکی بەهێزی (ئاوارەی دوور لە کوردستان) و خەڵکێکی بن دەستی داگیرکەراندا.

کارێکی دیکەی سەلاحودین و دەوڵەتی ئەیووبی ڕووخاندنی دەوڵەتی فاتمیی شیعە مەزهەبی دژ بەدەسەڵاتی ناوەندی خەلافەتی ئیسلامی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامیی شافعی مەزهەب بوو (مەزهەبی شافعی، نزیکترین مەزهەبە- ئایین – لە ناوەندی خەلافەتی ئیسلامییەوە) دیارە لەسەر حیسابی مەزهەب و تەریقەتەکانی دیکە. بەهێزیی ئەیووبییەکان وای دەکرد کە ئەو مەزهەبە (شافعی) لایەنگری زۆری بۆ پەیدا بێت و دیسان گەڕانەوە بۆ دەسەڵاتی ناوەندی ئیسلامی بەهێز بێت[٢٣] لە کاتێکدا ئەو سەردەمە، بە سەردەمی بێ هێزیی ئەو ناوەندە دادەنرێت، چونکە عەباسییەکان لەدوا سەدەی ژیانیاندا بوون و نیشانەکانی بێ هێزییان بەئاشکرا پێوە دیار بوو وە گەلێک ناوچەی گرنگی نزیکی خۆیشیان لەدەست دا. لە مووسڵ زەنگییەکان دەسەڵاتیان هەبوو، لە ئەناتۆلیا دۆستەکییەکانی ژێر قەڵەمڕەوی سەلجووقی و لە ئێران و کوردستان: ئیمپراتۆریای سەلجووقی لەو پەڕی بەهێزیدا بوو. هەر ئەو سەردەمە بە سەردەمی بەهێزی پەیدا بوونی تەسەوف و عیرفان دەژمێردرێت لە ئێران و کوردستاندا. بەڵام هەوڵی سەلاحودین دیسان متمانە و هێزی بۆ مەزهەبی شافعی نزیک لەناوەندی دەسەڵاتی ئیسلامی گێڕایەوە. هەر بەهۆی ئەم کارانە، کورد دیسان نامۆ بوونێکی دیکەی بەنسیب بوو کە دەسەڵاتدارانی کورد بەحوکمی عەقیدە و ئایدۆلۆژیا (دەبووایە سەر بەناوەندێکی بێگانە بوونایە) و لە کاتێکدا هەوڵی کورد بۆ کوردیکردنی ئیسلام و ئێرانی کردنی ئیسلام و مەشریقی کردنی ئیسلام لە وڵاتدا لەو پەڕی بەهێزیدا بوو (دەرکەوتنی تەسەوف و عیرفان باشترین بەڵگەن).

کارێکی گەلێک گرنگ و لەڕادە بەدەر کاریگەری سەلاحودین لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوەندی دەسەڵاتی ڕۆژئاوای (مەسیحی)، ڕزگارکردنی «بیت المقدس» بوو لە چنگی خاچپەرستەکان، کە ئەوپەڕی متمانە و هێزی بۆ ئیسلام و عەرەب و خەلافەتی ئیسلامی گێڕایەوە و زەبرێکی کوشندەشی لە دەسەڵاتی سەلیبییەکان دا. ئەم کارە، ئەگەر وەکو کارێکی مرۆڤانە تەماشا بکرێت و لە دژی داگیرکردن ڕاوەستان، دەبێت لایەنگری لێ بکرێت، بەڵام ئەگەر لەبەرامبەر ئەوەدا، حاڵەتی داگیرکردنی کوردستان لەبەرچاو بگرین، بزانە چ لێکدانەوە و دڵەڕاوکێ و نامۆ بوونێکی (بۆ کورد) لێ پەیدا دەبێت. لە دەرەوەی کوردستان، دەسەڵاتێکی کوردی (ئیمپراتۆریای ئەیووبی) بەو پەڕی هێزەوە گەورەترین و کاریگەرترین هێزی دنیا دەگەوزێنێ، بەڵام لە وڵاتدا، خەڵک و میللەتی داگیرکراو و چەوساوە و بێدەسەڵاتن و فەرمانڕەوایی و میرنشینەکان یەک لە دوای یەک بەدەستی داگیرکەرانی عەباسی و سەلجووقی لە ناودەبرێن. ئەم ڕەوشەی سەلاحودین و دەوڵەتی ئەیووبی نەک هەر ئەو سەردەمە بەڵکو هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت لە پانتایی و قووڵاییی کوردستاندا نامۆ بوونێکی گەورەی بۆ کورد بەدیاری هێناوە و یەکێک لەو مێژووانە و لەو ڕەوشانەی کە لەتەواوی مێژووی کوردا چووەتە خوارەوە و کوردی لە خۆی نامۆ و بێگانە کردووە، ڕەوشی سەلاحودین و دەوڵەتی ئەیووبییە (بەهەموو ئەو کار و پێکهێنەرانەی کە بە هی دەوڵەتی ئەیووبی ئەژمار دەکرێن). بەشێک ئافەرین لە سەلاحودین دەکەن کە خزمەتی بەئیسلام کردووە و بەشێکی دیکە نەفرەتی لێ دەکەن، کە بۆچی وێڕای ئەو دەسەڵاتە گەورە و کاریگەرە، هیچی بۆ کورد نەکردووە.

* هاتنی مەغۆلەکان بۆ کوردستان و بەتەواوی داگیرکردنی هەموو ناوچەکانی و ڕووخانی هەموو دەسەڵاتە ناوچەییەکان لە ساڵی ١٢١٧ز دەستی پێ کرد و ١٣١٧ز، وا دوای سەدەیەک، توانییان بەتەواوی کوردستان کۆنترۆڵ بکەن. مەغۆلەکان لە ساڵی ١٢١٧دا دەستییان بەداگیرکردنی کوردستان کرد لە ناوچەکانی ئاگر بایەگاندا، لە ساڵی ١٢٤٣ سەلجووقییەکان چوونە ژێر فەرمانیانەوە و بوون بە بەشێک لەوان، لە ساڵی ١٢٥٨ز بەغدادیان داگیرکرد و کۆتاییان بە دەسەڵاتی خەلافەتی عەباسی هێنا، لە ساڵی ١٢٦١ز توانییان دوا دەسەڵاتی ئەیووبی لە شام لەناوبەرن (لەکاتێکدا مەملووکەکان پێشتر توانیبوویان ئەیووبییەکان لە میسر وەدەر

نێن و دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن).

ڕاپەڕین و شۆڕشی ناوچەکانی کوردستان یەکێک بوو لەو کۆسپ و لەمپەرە گەورانەی کە بووە هۆی دواخستنی داگیرکردنی کوردستان لە لایەن مەغۆلەکانەوە و بەهەمان شێوەش بووە هۆی دەست نەپاراستنی مەغۆلەکان لە بەرامبەر کوردا و خوڵقاندنی چەندین کارەسات و تاوانی گەورە، بەرامبەر بەو میللەتە. سەرەنجام مەغۆلەکان نەیانتوانی دەوڵەتی (فەرمانڕەوایی) شوانکارە لە ناوچەی لوڕستان لەناوبەرن و مەغۆلەکان ناچار بوون لە گەڵیاندا قەراردادێک ببەستن بەوەی کە شوانکارە بەشێک بێت لە دەسەڵاتی مەغۆلەکان و هەر لەڕێگای شوانکارەوە وڵات و ناوچەی خۆیان بەڕێوە ببرێت.

ئەو دوو سەد ساڵەی کە مەغۆلەکان توانییان لە ئێران، کوردستان، ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عەبباسی، ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی سەلجووقی و ئەیووبی، دەسەڵاتی ڕەهایان هەبێت تەنها فەرمانڕەوایی شوانکارە (لوڕستان) و موزەفەری (فارس) توانییان نیمچە ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن. بوونی هەلومەرجی شەڕ و کارەسات و بۆ ماوەیەکی وا درێژ (١٠٠ ساڵ) لە کوردستاندا، ڕەوشێکی لەڕادە بەدەر نەبوونی، برسێتی، تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتی، بێ ئومێدی و بێ هێزی بۆ خەڵک بەدیاری هێنا. سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ژیانی خەڵک بەتەواوی لەبەریەک هەڵوەشابوو و قات و قڕی و برسێتی لەڕادە بەدەر لەناو خەڵکیدا پەرەی سەندبوو، بەجۆرێک کە خەڵک تەرمی مردووەکانی دەخوارد و لە هەژاریدا ماڵ و منداڵی خۆیان دەفرۆشت[٢٤]. لەم سەردەمەدا گەلێک بیر و باوەڕی خورافی و نائومێدی دەرکەوتبوو، خەڵک بەئاشکرا دەیان وت کە ئەمە تۆڵە سەندنەوەیەکی ئیلاهییە و دەبێت پێی شکور بین و زەمینەیەکی باشی کۆمەڵایەتیش بۆ دیسان بڵاوبوونەوەی بیر و باوەڕی دەروێشی و سۆفیایەتی سازکرد. لەم سەردەمەدا نەریت و ڕەوشێکی بەهێزی دینداری، بەشێوە دەروێشییەکەی، پەیدا بوو لە کاتێکدا کە خودی ئەو دینداریە بانگەوازی هەڵسوکەوتی پاسیفی (سلبی) دەکرد لە بەرامبەر دنیا و گوێنەدان بەدەسەڵات و گۆڕانەکانی ژیان.

هاتنی مەغۆلەکان بۆ کوردستان و پەیدا بوونی ئەو هەلومەرجە مەرگەسات و درێژ

خایەنە، چەند کاریگەرییەکی خراپی لەسەر کوردستان بەجێهێشت، کە ئەمانەن:

**یەکەم**، خەڵک باوەڕیان هاتە سەر ئەوەی کە لە نێوان ئەم هێزە دڕندە و گەورە و داگیرکەرانەدا، جێگایەک و کاتێک بۆ ئاسوودەیی و ئاسایی ژیانی ئەو میللەتە نەماوە و خەڵک ناچار دەکرێت کە بکەوێتە ژێر ژیانێکی یان شەڕاوی و هەڵگەڕانەوە (کە ئەویش هەموو کاتێک دەستی نەدەدا) یان کۆیلایەتی (کە ئەمیان بەرەو زاڵبوون دەچوو).

**دووەم**، هەمـوو ئەو دەسکەوتانەی کـە تا ئەو کـاتە بەدەست هـاتبـوون (بـەتایبـەتی بوونی دەسـەڵاتە نـاوچەییـیەکانی کوردسـتـان و دەسـتکەوتی کۆمـەڵایەتی، ئابووری، فـەرهـەنگی دیسـان و جـارێکـی دیکە لەبـنـاغـەوە هـەڵتـەکـان و دیسـان ئەو مـیللەتە بەهەموو پێکهێنەرەکانییەوە بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوو. کە یەکێک لەو هەڵوەشانانە، لەبەریەک ترازانی ناوچە و میللەت بوو بۆ دیسان دەسەڵاتی خێڵ و هۆزەکان و پەیدا بوونی ڕەوشـێکی نۆکەرایەتیی خێڵـەکان بۆ داگیرکەران (بۆ پاراسـتنی ئەوەی کە دەکـرێت بپـارێزرێت) و گـوێنـەدان بە خـێڵ و نـاوچەکـانـی دیکە و پەیدا بوون و پەرەسـەندنی لێکدابڕان و لێکترازان و سـەرەنجام دواخـستنی پرۆسەی بەمـیللەت بوون (یان هەڵوەشانەوەی) کە تەنها و تەنها لەڕێگای هاوبەرژەوەندی و یەکگرتن و فیدراسیۆنـی نێوان خێڵـەکان و ناوچەکان بە دی دێت. داگیرکەران بەردەوام (ئەو هەموو داگیرکەرە زۆر و زەبەندەیە، هاتنی ئیسـلام، سەلجووقییەکان، مەغۆلەکان) هەڵوەشـانەوەی پرۆسـەی بەمیللەت بوونی کوردیان بە یەکێک لە کارەکانی خۆیان و بەو پەڕی هێزەوە، بەئەنجامیان گەیاند.

**سێیەم**، خەڵکی کوردسـتـان هەرچەندیان دەکرد، لەڕاستیدا هەرچییـان لەدەست هاتبێت بەدژی داگیرکەران درێغییان نەکردووە، دەرۆستی ئەو داگیرکەرە گەورانە نەدەهاتن و نـەیاندەتوانی کـە ڕێگا بەو هێـزانە بگرن و بـەتایبـەتیش کە کـوردسـتـان شوێنـی شـەڕ و یەکلاکـردنەوەی ناکۆکـیـیەکـان بوو، سـەرەنجـام کوردسـتـان کرایە مـەیدانـی جـەنگە گـەورەکـانی سـەلجـووقـی (بۆ داگـیرکـردنی ئێران و کـوردسـتـان) و دەسـەڵاتـی خـەلافـەتی عـەبـبـاسی هـەر بۆ ئـەو مـەبەسـتـە و پاشـانـیش شـەڕی مەغۆلەکانیش دژی ئەو هێزانەی دیکە، هەر لە کوردستاندا دەبڕایەوە.

**چوارەم**، وێڕای لێکترازانی خێڵەکان و ناوچەکان لە یەکدی و داگیرکردنی کوردستان، بەردەوامبوونی هەڵوەشانەوە و لێک دوور کەوتنەوەی شێوەزارەکان لە یەکدی و دوورکەوتنەوەی فەرهەنگ و ئایینەکان (ئەهلی هەق، عەلەوی، ئێزیدی، تەریقەکانی تەسەوف). لەکاتێکدا کە ناوچەی لوڕستان (ماهستان) فەرمانڕەوایی شوانکارە تیایدا دەسەڵاتدار بوو بەبوونی شێوەزاری گۆرانی و ئایینی ئەهلی هەق، لە ناوچەی کوردستانی کرمانجیی ناوەڕاست، سەلجووقییەکان باڵادەست بوون یان (مەغۆلەکان) بەبوونی شێوەزاری کرمانجیی ناوەند، بێ گومان ئەم دوو دەسەڵاتە، نەیاندەهێشت پەیوەندی و هاوئاهەنگی نێوان ئەو دوو ناوچەیە ببێت و سەرەنجام هەموو پێکهێنەرەکان (کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئایینی و فەرهەنگی) لێک دوور دەکەونەوە و ناتوانن بەشێک بن لەیەکتری یان هیچ نەبێت هاوخەمی و هاودەردی بۆ یەک دروست بکەن. هەر لەو سەردەمەدا، لە کوردستانی سۆراندا، ڕێبازی تەسەوف هەبوو، لە ناوچەی زۆزان (هەکاری) و بادینانیدا ئایینی ئێزیدی کاری دەکرد، لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەیووبی مەزهەبی شافعی و بەم شێوەیە (فرەییەک) پێک هات کە بەردەوام لێک دوور دەکەوتنەوە، بەکاریگەری داگیرکردن. لەکاتێکدا میللەتێکی (قوم) وەکو مەغۆلەکان بەرەو یەکێتی و فیدراسیۆنیی دەچوون میللەتێکی وەکو کورد (کە دەمێک بوون چوو بووە قۆناغی یەکگرتنی خێڵەکان و پێکهاتنی میللەتی میدیا) لەبەریەک هەڵوەشایەوە و هەریەکە لەو ناوچە هەڵوەشێنراوانە ناچار بوون کە تایبەتمەندیی خۆیان، سەرلەنوێ دروست بکەنەوە.

لەناو هەموو، ئەم شەڕ و شۆڕ و وێران کارییەدا، سەرەنجام بەشێک لە کورد توانیی تەنها فەرمانڕەوایی شوانکارە (تا ساڵی ١٣٥٦) لە ڕێگای سازش و ڕێکەوتن و سەردانەواندن بۆ مەغۆلەکان (کە ئەوسا تاکە ڕێگا بوو، چونکە هێزی مەغۆلەکان کەس نەیدەتوانی خۆی لە بەرامبەریاندا بگرێت و کوردیش هەرچی لەدەست هات بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەوان، نواندی، بەڵام سەرەنجام مەغۆلەکان سەرکەوتن و کوردستان و ناوچەکەشیان وێران کرد).

داگیرکردن و وێرانکاریی مەغۆلەکان و تورکمانەکان (سەلجووقی) تا سەدەی پانزەیەمی خایاند و کوردستانیش هەر لەو هەلومەرجەدا، ژیانی بەسەر دەبرد و بێ

گومان له کۆتایی سەدەی چوارده و سەرەتای سەدەی پانزەشدا، دەسەلاتی شوانکارەش نەما و بەم جۆرە، کورد، لەو سەدەیەدا نەیتوانی هیچ بەرهەمێکی (له واری دەسەلاتدا) ببێت و سەرەنجام زەمینە خۆش بوو بۆ هاتنی عوسمانییەکان و پەیدا بوونی شەڕ و جەنگە بەردەوامەکانی ئێران و عوسمانی و دابەشکردنی دەسەلاتیان لەسەر کوردستان لە ساڵی ١٥١٤ز. و لە ناوچەی چاڵدێراندا.

سەرچاوەو پەراوێزەکان

(١) زۆربەی زانایان بەم شێوەیە پێناسەی نەژادیان کردووە: نەژاد کۆمەڵە خەڵکێکن لە سەردەمێکی مێژووییدا پەیدابوون و خاوەنی زمان، فەرهەنگ، ژیانی ئابوری، رەوشی نەریتی و سایکۆلۆژی، دەسەلاتی خۆیان و هوشیاری دەربارەی خۆیانن).

بڕوانە: د.مجید حمید عارف، اثنوگرافیا شعوب العالم، بغداد ، ١٩٨٩

(٢) جلیل دوستخواه، ئاڤێستا (نامەی مەینەڤی ئاینی زەردەشت)، وەرگێڕانی ئەنداز حەوێزی، چاپی سوید.

(٣) د. پیرۆز مجتهدزاده، هویت ایرانی در آستانەی سدەی و بیست و یکم، مجله اطلاعات سیاسی- اقتصادی، شماره ١٢٩- ، ١٣٠

(٤) هیگل، العالم الشرقي، ترجمة: د. امام عبدالفتاح امام، بیروت ، ١٩٨٤

(٥) بڕوانە: کارنامەی ئەردەشیری بابەکان، چاپکراوی دەزگای سەردەم، سلێمانی ، ٢٠٠٠

کە باسی فەڕی کیانی (حەقی ئیلاهی کیانی) کە یەکێکە لە دەسەلاتە ئێرانییەکانی سەردەمی ژیانی زەردەشت، کە زەردەشت لەگەڵ شای کیانیدا پەیوەندیی باشی هەبووە و بۆیە بەو بۆنەوە باس لە پیرۆزیی کیانی کراوە. پاشان لەو کتێبەدا باس لە نەژادی ئێریانا دەکرێت وەکو نەژادی ساسانییەکان، ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ساسانییەکان شێوەزاری گۆرانی (پەهلەوی)یان بەکار هێناوە و دەسەلاتیشیان لە رۆژئاوای ئێراندا بووە کە ئەوسا و ئێستاش ئەو ناوچەیە هەر کوردستانە، بەلام ئەمە بەو مانایە نایەت کە ئەوان (ساسانییەکان) کوردن و فارس نین یان فارسن و کورد نین. لەراستیدا ئێرانی بوون و یان هەر وەکو سەرچاوەکان دەڵێن (ئێریانا) بوون، کە نەژادی کورد و فارسیش لەوانە. دەسەلاتی ناسیۆنالیستی فارسی لە ئێراندا ئەوانی بەفارس ناساندووە و بەداخەوە سەرچاوەکانیش ئەوەیان سەلماندووە.

(٦) م. کاردۆخ، (جنبشهای کرد) (ازدیرباز تاکنون)، سوید ، ١٩٩٣

(٧) د. میهرداد ئێزەدی، ئاین و تایەفە ئاینییەکان لە کوردستان، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە ٢٧، سلێمانی.

(٨) لە فەرهەنگی ئاری و ئاڤێستادا چەند ناوێک بۆ ئاگر هەیە کە ئەمانەیە: ئاهەر، ئاتەر، ئازەر،

ئاتەش، ئاور، ئایر، ئاگر و ئار. وشـەی (ئاری)یش نزیکایەتیی زۆری لەگەڵ ئەم واژانەدا هەیە. ئاگربایەگان (ئازەربایجان) ناوێکی ئاڤێستاییە و پەرستگای گەورەی ئازەرگوشب لەوێ بووە و نیشـتـمـانی ڕەسـەنی زەردەشت و ئارییـەکـانە. لە سـەدەی دوانزە و لە ئەنجـامی هـاتنی بەردەوامی خێڵە تۆرانییەکان (هەر لە سەلجوقییەکان هەتا عوسمـانییەکـان) ئەو ناوچەیە بوو بەتورک نشین.

(٩) سـەدیقی بۆرەکـەیی (صـفـیزادە)، مـێژووی وێژەی کـوردی(١)، بانە، ١٣٧٠، باڵووڵی مـادی لە دایکبووی ٢١٩ک لە یەکێک لە هۆنراوەکانی کە بەزاراوەی گۆرانییە:

ئـــەو واتـــەی یـــاران، ئـــەو واتـــەی یـــاران
ئێـــــمـــــە دێوانـەین ئـەو واتەی یـاران
هەنی مـــەگـــێـــڵین یەک یەک شـــاران
تـا زیـنـدە کـــــەریم ئـایـن ئێـــــران

ئاینی ئەهلی هـەق، ئاینێکی ئێرانییـە و لە پاشـمـاوەی ئاینەکـانی زەردەشـتی و مـانەوی و مەزدەکی و ئاینە کۆنەکانی تری زاگرۆسەوە، بەدی هاتووە. لەبەر ئەوەی سـەرەتا لە لوڕستان و هەورامان پەیدا بووە، سەرۆکەکانی ئەو ڕێبازە مەبەست و نیازی خۆیان بەزمانی زگماکی ناوچەکە دەربڕیوە و شێوەی زمانی ئەوان هەر ئەو شێوەزارە گۆرانییە بووە.
(هەمان سەچاوە، ل٥٦).

بابا سەرهەنگی دەودان (لەدایکبووی ساڵی ٣٢٤ک) کە یەکێکە لە هۆنەرەکانی یارسان:

ســـــەرهـەنگ دەودان، ســـــەرهـەنگ دەودان
ئـەز کـــــــەنامـەن ســــــەرهـەنگ دەودان
چەنی ئێــــرمـــانان مـــەگـــێـــڵم هـەردان
مــــــەکـــــــۆشم پەرێ ئـایـن کـــــوردان

واتە (من کـە سـەرهەنگی دەودانم و لەگـەڵ مـریدەکان و خـولامـانی خـۆمـا بەهـەمـوو شـوێن و جـێگاکـاندا ئەسـووڕێمـەوە و بۆ زیندوو کـردنـەوە و بووژاندنەوەی ئـاینی کـۆنی کـوردان تێ ئەکۆشم)
(هەمان سەرچاوە، ل٦٣).

وشەکانی دین و ئاین، لە ئاڤێستاوە وەرگیراوە. لە ئاڤێستادا وشەی (دەئێنە) یان (دەئینا) بۆ وشـەی دین بەکـارهـاتووە و (ئاین)یش بـۆ مـانای ڕێبـاز "مـذهب"، پەیڕەو، یاسـا بەکـارهـاتووە. یاسا وشەیەکی مەغۆلییە و کەوتووەتە ناو ڕێبازی زمانی کوردییەوە، بڕوانە:
جلیل دوستخوار، هەمان سەرچاوە.

(١٠) شـارەزایان و زانستکارانی نوێ نموونـەی (ڕەشـاد مـیـران، جـەمـال نەبەز، مـیـهرداد ئیزەدی، پیرۆز مجتهد زادە و سەفی زادە)، لەسەر ئەوە هاوڕان (بەڵام هـەر یەکە بەدەربڕینێک) کە ئاینی

کوردان له ناوەڕۆکدا (بەتایبەتی لەو ڕێبازە ئاینییانەی کە ناوم هێنان) گۆرانی بەسەردا نەهاتووە، بڕوانە:

- میهرداد ئێزەدی، سەرچاوەی پێشوو.
- ڕەشاد میران، ڕەوشی ئاینی و نەتەوەیی لە کوردستان. ستوکهۆڵم ١٩٩٣.

جەمال نەبەز، کوردانی سەرگەردان و برا موسڵمانەکانیان، وەرگێڕانی S.K، چاپی سلێمانی ١٩٩٨.

- سەفی زادە، سەرچاوەی پێشوو.
- د. پیروز مجتهد زادە، سەرچاوەی پێشوو.

وشەی قزڵباش تورکییە و مانای کڵاوسوور دەدات و عەلەوییەکان سەرەتا کڵاوی سوور یان مێزەری سووریان لەسەر دەنا و تا ئێستاش بارزانییەکان (کە بەشێکیان خورشیدین، کە سەر بەڕێبازی یەزدانییە لە دینی کوردا) مێزەری سوور دەپێچن. بڕوانە، میهرداد ئێزەدی، سەرچاوەی ناوبراو.

(١١) سدیق بۆرەکەیی، مێژووی وێژەی کوردی(١). بانە - کردستان ١٣٧٠ هەتاوی.

(١٢) د. ڕەشاد میران. سەرچاوەی ناوبراو ل. ٤٤

(١٣) وشەی گۆران و گۆرانی، کە وشەیەکی ئاڤێستاییە و مێژووی پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی میدیا و دینی زەردەشتی و بەتایبەتی سەردەمی دەسەڵاتی ماگاکان کە پیاوانی دینی بوون و لەناو کۆمەڵدا بەچینی گەورەکان و بەزمانی ئاڤێستایی گۆرە) و کاتێک کە نیشانەی کۆی (ان) دەچێتە سەر، دەبێتە گۆران، واتە گەورەکان.

ئامۆژگاری و زانیارییە دینییەکانیش (بەتایبەتی بەشی گاتەکانی ئاڤێستا) ئاوازدار بووە و لەبەر ئەوەی گۆرانەکان (پیاوە گەورە دینییەکان) ئەو ئامۆژگارییە ئاوازدارانەیان بەخەڵک وتووە، بۆیە (ی) نیسبەی چووەتە سەر و بووەتە (گۆرانی) و پاشان مانای ئاوازی داوە و ئێستا بەشێوەی گۆرانی (Singing) بەکاردێت و پاشان زمانی ئاڤێستا کە زمانی گۆرانەکانە، بووەتە زمانی گۆرانی و نەوەکانی ئەو پیاوە ئاینییانەش وەکو ناوچەی گۆران و خێڵەکانی گۆران ناسراون. بڕوانە:

محەمەد ئەمین هەورامانی، کاکەیی، بەغداد , ١٩٨٥

فەرهەنگی کاکەیی (یارسان) بەزمانی گۆرانی لە بواری دین، ئەدەبیات، مێژوو فەرهەنگێکی دەوڵەمەندە و هەر لە سەرەتای سەدەی سێی کۆچییەوە تا سەدەی بیست و تا ئێستاش بەردەوامە. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

وە سەدیقی بۆرەکەیی، مێژووی وێژەی کوردی(١)، بانە- کردستان، , ١٣٧٠

(١٤) صدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، هەمان سەرچاوە.

لە سەردەمی دەسەڵاتی میدیا و دینی زەردەشتیدا کە بەشی هەرە زۆری کوردستان هەر لە

هەمەدانەوە تا ئەوپەڕی ئاترۆپاتین و تا ئامەد (دیار بەکری ئێستا) و تا ئەفرین (عەفرینی ئێستا) و تا بەهدینان، بەرینایی هەبوو. ئەو ناوانەی کە ناومان هێنان هەموویان، ناوی زەردەشتین و لە فەرهەنگی ئاڤێستا و ئێریەن ڤاچدا بەرچاو دەکەوێت. (ئامەد) واتە ئەو شارەی کە میدیای گەیشتووەتێ، ئاترۆ پاتین وەکو باسمان کرد ئاڤێستاییە و مانای وڵاتی ئاگر دادەر، ئەفرین (کە بووەتە عەفرین و تەعریب کراوە) مانای ئافراندن دەدات، بەهدینان واتە وڵاتی خاوەن دینە باشەکان دەدات و میدیات (کە شارێکی باکوری کوردستانە) هەر پەیوەندیی بەمیدیاوە هەیە، لەدوای ئەم مێژووە، تەنها ئاینی «مذهب» کاکەیی توانیی لەو پانتاییەدا بڵاوببێتەوە و بەتایبەتی لەو سەردەمەدا کە هێشتا قووڵایی و بەرینایی کوردستان بەتەواوی داگیر نەکرابوو، واتە، لە ساڵانی ٦٤٠- ١٥١٤ز دا. بڕوانە:

سەدیقی بۆرەکەیی، هەمان سەرچاوە.

محەمەد ئەمین هەورامانی، هەمان سەرچاوە.

(١٥) سەدیقی سەفی زادە (بۆرەکەیی)، هەمان سەرچاوە.

(١٦) و (١٧) د.محمد عابد الجابری، نحن والتراث، بیروت ، ١٩٨٢

(١٨) د. پیروز مجتهد زادە، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١٩) د. میهرداد ئێزەدی، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢٠) خەسرەو گۆران، کردستان عبر أزمنة التأریخ (الجز و الاول)، ستوکهولم ، ١٩٩٢

(٢١) م. کاردۆخ، جنبشهای کرد (ازدیرباز تاکنون)، ستوکهولم ، ١٩٩٣

(٢٢) م. کاردۆخ، هەمان سەرچاوە.

(٢٣) هەرچەندە تەسەوف بە وەرگەڕانێکی "انحراف" پاسیف لەناوەندی خەلافەتی ئیسلامی حساب دەکرێت، بەتایبەتی لەبەرامبەر دەسەڵاتی چەوسێنەری کۆمەڵایەتی خەلافەت (بەگەڕانەوە بۆ ئەرسەدۆکسی ئیسلامی و پاشان بۆ بنەما بنەڕەتییەکانی دینی ئاری "زەردەشتی"، بەڵام لەسەر دەستی ڕێبازی قادری و "نەقشبەندی"دا لە کوردستان گەڕانەوە بۆ نەسەبی سەیدی و بنەماڵەی پێغەمبەر بەدروست کردنی" شجرە الانساب" (لە لایەن قادرییەکانەوە)، بەڕەوشێکی نامۆ و (ناچارکرا و لەژێر کاریگەریی دەسەڵاتی ئیسلامی و شیعەی سەفەوی) و گەڕانەوە بۆ سەر نەسەبی ئەبوبەکری سەدیق، لە لایەن، نەقشبەندییەکانی کوردستانەوە، یەکێکە لەو هۆیانەی کە زەمینەی خۆش کرد کە بەشی هەرە زۆری کوردی سوننە ببنە شافعی مەزهەب، کە خودی شافعیش ڕەوایی و پیرۆزی بۆ ئەو بنەماڵەیە (قورەیش) دەگێڕێتەوە.

کوردەکان، هەر وەکو عەرەبەکان و شیعەکان بەهۆی عەقیدە و ئایدۆلۆژیای دینییەوە، دیسان (بەهۆی تەسەوفەوە) خۆیان بەستەوە بەناوەندی خەلافەتی ئیسلامییەوە واتە تەواوکردنی کارێک کە (٦سەدە) پێشتر، سەلاحەدین دەستی پێ کرد.

(٢٤) م. کاردۆخ، هەمان سەرچاوە ل. ٢٣٢

# بەشی دووەم

* سەرەتای سەدەی شانزە، بەقۆناغ و وەرچەرخانێکی نوی دادەنرێت لە مێژووی کورد و بزووتنەوەکەی کە بەدوای خۆی و ناسنامەکەیدا، دەگەڕا. لەم سەردەمەدا، ئەوەی کە لە داگیرکاری و وێرانکاری خەلافەتی عەباسی، سەلجووقی و مەگۆلەکان، مابووەوە، کەوتە بەر هێرشی دەوڵەتی تازە دامەزراوی سەفەوی لەسەر دەستی شا ئیسماعیلی سەفەوی. ئەو، ئیسماعیلی سەفەوی، بەپشت بەستن بەهێزی خێڵە تورکمانەکانی ئاق قۆینلۆ، کە بۆ خۆشی لە نەژادی تورکمانەکان بوو، دەستی کرد بە داگیرکردنی ناوچە کورد نشینەکان و لە ساڵی (١٥٠١) شاری تەورێزی گرت و پاشان بەرەو هەمەدان ڕۆیشت و لە ساڵی ١٥٠٣دا کۆنترۆڵی کرد و دەیویست تەواوی سەر زەمینی کوردان بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە. هێزەکانی بەرەو ڕۆژئاوای کوردستان بەڕێ خست و بەمەبەستی داگیرکردنی ئامەد. لە ساڵی ١٥٠٧ بۆ پێشڕەویی زیاتر بەرەو ناوچەکانی ئانادۆڵ، لەگەڵ میرە کوردە دەسەڵاتدارە سوننی مەزهەبەکان ڕوو بەڕووی چەندین جەنگی خوێناوی بووەوە و لە ناوچەی ئەلبوستان لەگەڵ کوردەکانی (ذو القدری) بەرابەریی "علا والدین الدوله ذو القدر" کەوتە شەڕێکی سەختەوە[1]. پاش ئەوەی کە سەفەوییەکان ناوچەی ئاترۆپاتین و باکوور و ڕۆژهەلاتی ئەناتۆلیایان گرت، هێزەکانی قزڵباشەکان (عەلەوییەکان) هاتن بەرەو پیری سوپاکەیان و گەلێک یارمەتیی گەورەیان پێشکەش بەو هێزانە کرد. کە پاشان ئەمە بووە هۆی چەوساندنەوە و جینۆسایدی عەلەوییەکان لەسەر دەستی دەسەڵاتە یەک لەدوای یەکەکانی، ئیمپراتۆریای عوسمانی پاش ئەوەی کە ئەو بەشەی کوردستان، بێجگە لە ئازەربایجان، لەدوای ساڵی ١٥١٤ کەوتە بەردەستی عوسمانییەکان.

ئەوەی کە لەم سەردەمەدا بەرچاومان دەکەوێت، هەتا ئێستا، ئەوەیە کە کوردە موسڵمانە سوننییەکان بوونە لایەنگری دەوڵەتی عوسمانی و کوردەکانی قزڵباش

(عەلەوی) بوونە لایەنگری دەوڵەتی شیعەگەری دوانزە ئیمامی سەفەوی، کە ئەوانیش نزیکایەتیی زۆریان لەگەڵ ئاینە یەزدانییەکانی ئیسماعیلی و عەلەوی هەیە و کە بەشێکن لە دینی ئاری و زەردەشتی کۆن، بەڵام ئەمانیش (شیعەکان) [هەستی] بەدەربڕینی تایبەتی و ئیسلامیی خۆیان. هێزەکانی سەفەوی، لەناوچەی ورمێ و شنۆ لەگەڵ کوردەکانی ئەوێ، بەڕابەری سارم بەگ کەوتنە جەنگەوە و پاش لەناوبردنیان ئەو ناوچانەشیان گرت.

گەلێک لە سەرچاوەکان، ئاماژە بەوە دەدەن، کە دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوی لە نەژادێکی تێکەڵی کورد و تورکمانن و دینەکەشیان هەر بەو شێوەیە، تێکەڵێکە لە دینی ئاری و دینی ئیسلامی و تەنانەت (شا ئیسماعیلی سەفەوی) لەقەبی "صاحب الزمان"ی بۆ خۆی داناوە و کە تا ئێستا لەناو شیعەکانی ئیمامی دا (چ ئیسماعیلی و چ دوانزە ئیمام)، لەقەبی ئیمامی وەخت، کە هەمان نەخشندە و دۆنی پەروەردگارە، ماوتەوە. تا ئێستا بارزانییە (مێزەر سوورەکان) بەشێخەکانیان دەڵێن (خودان) کە هەمان مانای "صاحب الزمان "دەدات. ئاینی سەفەوییەکان، وەکو ناوەڕۆکی دینی هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئاینە کۆنە ئارییی و زەردەشتییەکەدا نییە، کە بێگومان نزیکایەتییەکی زۆری لەگەڵ ئاینی عەلەوییە و ئەهلی هەقدا، هەیە(٢).

بەدبەختیی کورد و ناوچە کوردییەکان، بەجۆرێک بوو، کە ئەویش سەبارەت بەهێزی زۆر و زەوەندی سەفەوی و عوسمانییەکان بوو، ناوچەکانی کە عەلەوییەکانی تیا نیشتەجێ بوون، واتە باکووری ئەنادۆڵ و ڕۆژئاوای کوردستان، کەوتە بەر دەستی عوسمانییە سوننە مەزهەبەکان و ئەو ناوچانەی کە کوردە سوننییەکانیشی تیادا نیشتەجێ بوون، کەوتە بەردەستی سەفەوییە شیعە مەزهەبەکان و بەم شێوەیە سەردەم و ڕەوشێکی نوێ (سەبارەت بەجیاوازیی ئاینی) لەنێوان کورد و دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکاندا دەستی پێ کرد و لە لای عوسمانییەکان، چەوسانەوەی لەڕادەبەدەری عەلەوییەکان بووە کارێکی هەموو ڕۆژەیان و ئازاردانی کوردە سوننەکانیش لە لایەن سەفەوییەکانەوە لەوێ بووەستێ و تەنانەت کۆچی بەکۆمەڵی کوردان و دەرکردنیان لەناوچەکانی ئازەربایجان و بردنیان بۆ خوراسان، یەکێکە لەو کارە دزێوانەی سەردەمی شا عەباسی سەفەوی.

جەنگی نێوان عوسمانی و سەفەوی لەسەر داگیرکردنی خاکی کوردستان هەتا ١٥١٤ی خایاند و سەرەنجام لە دوای جەنگی چاڵدێران و لەو ساڵەدا، هەردوو ئیمپراتۆریاکە، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە کوردستان دابەش بکەن. عوسمانییەکان نەیاندەتوانی بەبێ بەشداریی کوردەکان و دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانی کوردستان، لەناوچە تورک نشینەکانی ڕۆژئاوای تورکیا بەرەو ئەو ناوچانە بێن و هەر بەهۆی کوردەکانیشەوە، کە بوونە سەرە ڕێگا و پردی پەڕینەوەی عوسمانییەکان بەرەو ناوچە عەرەب نشینەکان، لەدوای ئەوەی عوسمانییەکان، لەگەڵ سەرانی کوردا ڕێک کەوتن، ئنجا توانییان بگەنە ئەو سنوورانەی ئێستای نێوان تورکیا و ئێران و داگیرکردنی وڵاتانی عەرەبیش دەستی پێ کرد. واتە کورد بەهۆی بیر و باوەڕی مەزهەبییەوە (لەڕاستیدا سەرانی کورد) بوونە هۆیەک بۆ بەهێزکردنی لەڕادەبەدەری عوسمانییەکان و پاشان داگیرکردنی بەشی هەرە زۆری کوردستان. عوسمانییەکان نەیاندەتوانی بەشەڕ ناوچە کوردنشینەکان داگیر بکەن (ناوچەکانی عەلەوییەکان ئەم قسەیە نایگرێتەوە) بۆیە هەوڵی ڕێککەوتن و سازانییان دا، لەگەڵ دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانی کورد و سەرەنجام سوڵتانی عوسمانی لەداوی جەنگی چاڵدێران لەگەڵ شانزدە کەس لە میرانی کورد، ڕێکەوتنێکی بەست کە تیایدا مافی دەسەڵاتداریی ئەوانی بەشێوەی (خودموختاری) هەر لە مەڵاتیەوە هەتا دەریاچەی وان بەڕەسمی ناسی و ئەم پەیمانەیە، چوار مادەی گرنگی تیادا بوو:

١ – دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانی کورد، سەربەخۆیی خۆیان دەپارێزن.

٢ – شێوەی دەسەڵاتدارێتی، پشتا و پشت دەبێت، واتە لەدوای باوک کوڕەکان دەسەڵات بەدەستەوە دەگرن.

٣ – کوردەکان دەبێت لە هەموو جەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بەشداری بکەن.

٤ – دەوڵەتی عوسمانی دەبێت لەبەرامبەر دەستدرێژیی دەرەکی دژی دەسەڵاتدارییە ناوچەییەکانی کوردستاندا، یارمەتیدەر بێت(٣).

ئەم ڕێککەوتنە، هەم بۆ دەوڵەتی عوسمانی ناچاری بوو، وە هەم بۆ کوردەکان.

بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەبووایە دەستی بگەیشتایە بەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی خۆی، کە ئەویش تەنها و تەنها لە ڕێگەی کوردەکانەوە دەبوو، چ بۆ داگیرکردنی وڵاتانی

عەرەبی و چ بۆ بەرەنگاریی دەوڵەتی بەهێز و تازە دامەزراوی سەفەوی. ئەگەر بزانین کە دەوڵەتی عوسمانی لەساڵی ١٢٩٩ز لە ئەستانە دامەزرا بوو، تەنها لە ساڵی ١٥١٠ و بەم لاوە تا ساڵی ١٥١٤ ئنجا توانیی دەستی بگات بەناوچە کوردنشینەکان و عەرەب نشینەکان، واتە دوای دوو سەد ساڵ لە دامەزراندنی. دەوڵەتی عوسمانی دەیویست ناوچەکانی ڕۆژئاوای خۆی داگیر بکات و تەماعی لە ئەورووپادا هەبوو، بەڵام پاش ئەوەی ئیدریسی بەدلیسی (کە شێخێکی سەر بەتەسەوفی نەقشبەندی بوو)، چووە لای عوسمانییەکان بۆ خۆپاراستن لەدەستی داگیرکاری سەفەوییە شیعییەکان، کاری کردە سەر عوسمانییەکان، بەتایبەتی سوڵتان یاوز باوکی سوڵتان سەلیم سولەیمان، کە بەرەو ئەو ناوچەنەی کە باسمان کردن، بێن.

لێرە بەدواوە، جارێکی دیکە کوردستان لەنێوان دوو هێزی گەورەدا دابەش کرا، کە هیچ کاتێک کورد دەرۆستی هیچکام لەو هێزانە نەهاتووە. لە ئێراندا (لەژێر دەستی سەفەوی) کورد بووە کەمایەتییەکی بچووک و لەهەمان کاتدا، مەزهەب جیاواز، کە وێڕای ئەوەی ڕەوشێکی چەوسانەوەی لەڕادەبەدەری لێ کەوتەوە و بووە هۆی ئەوەی کە ئەم ئەنجامەشی لێ پەیدا بێت: یەکەم، کورد تا ئەو کاتە _سەدەی شانزە – توانیبووی زمانی خۆی لەپاڵ زمانە ئارياييیەکەدا یان بەهاوبەشی لەگەڵ ئەودا لە سەردەمە جیاوازەکاندا واتە زمانەکانی (ئێریەن قاچ، ئاڤێستایی"دین دەبیرە"، گۆرانی، پەهلەوی، ماهی سۆراتی"مادی سۆراتی"، کاکەیی، ئێزیدی) بپارێزێت و ئەوەشمان لەبیر نەچێت هەر وەکو وتمان لەپاڵ شێوەزارەکانی دیکەی ئێرانیدا، هەموو ئەم کەلەپوور و مێژووە، کەوتە بەردەستی سەفەوییەکان و بەم جۆرە ئەم زمانانە بوونە مێژووی زمانی ئێرانی و فارسی و کوردیشی لێ بەش کرا، هەرچەندە کەمایەتییەکی کوردی لە ئێراندا مانەوە. دووەم، ئاین و فەرهەنگیش هەر بەو شێوەیە، کورد ناچار بوو، چونکە زۆربەی کورد، کە سوننە مەزهەب بوون، کەوتنە بەردەستی عوسمانییەکانەوە و ئیتر لێرەوە دیسان دابڕانێکی گەورە لە فەرهەنگ و ئاینی مێژوویی دەستی پێ کرد و کورد بووە بەشێک لە مەزهەبی سوننەی شافعی و دوور کەوتنەوەیەکی گەورە و کاریگەر لە ئاین و فەرهەنگ و میراتی کەلەپووری خۆی، بوو بەنسیبی. ئێرانییەکان، بەهۆی سەفەوی و لەسەر دەستی شا ئیسماعیل توانییان،

جارێکی دیکە، دینی خۆیان لەبەرگی شیعەی دوانزە ئیمامدا زیندوو بکەنەوە و بەجۆرێک ئەگەر ئەو (شا ئیسماعیل)، مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمامیی نەکردایەتە ئاینی ڕەسمی لە ئێران، ئەوا ئێستا شتێک بەناوی ئێرانەوە نەدەبوو کە لە بەرامبەر دەسەڵاتی گەورەی عوسمانییە سونییەکاندا، خۆی ڕابگرێت[٤].

لێرە بەدواوە، کورد لەئێران پاش ئەوەی کە لە هەموو زمان، فەرهەنگ و ئاینی کۆنی خۆی دابڕا و بوو بەکەمایەتییەکی جیاواز لەو دەوڵەت و وڵاتە، هەرچەندە کورد بەکۆنترین و مێژوویترین میللەتی ئێرانی دادەنرێت و بەشێکی هەرە زۆری ئەو زمان، فەرهەنگ و شارستانییە لە لایەن کورد و لەوڵاتی کوردانداا "لە ئێران" بەدی هاتووە. لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیشدا، هەر بووە کەمایەتی. ئەو دەمەی عوسمانییەکان، پێویستییان بەهێزی یەدەکیی کوردەکان بوو، بۆ مەبەستی فراوان بوونەوە و داگیرکاریی خۆیان، ڕێککەوتننامەی ناوبراویان، لەگەڵ ئیمزا کردن، بەڵام پاش بەهێز بوونی دەوڵەتی عوسمانی، ڕووی لە کوردەکان وەرگێڕا و یەک لەدوای یەک، فەرمانڕەواییی ناوچەکانی نەهێشت و دەستی کرد بە دەربەدەرکردنی سەرانی کورد، کە یەکێک لەوان میر شەرەفخانی بەدلیسی، میری ئەمارەتی بەتلیس، کە ناچار ڕووی کردە ئێران و لەوێ بەزمانی فارسی، شەرەفنامەی نووسی.

ئێرانییەکان، لەسەر دەستی سەفەوییەکان، سەرەتای قۆناغ و سەردەمێکی زۆر نوێ و کاریگەریان دەست پێ کرد، ئەوان توانییان، هەنگاوە بەراییەکانی سەردەمی چوونە ناو پێکهاتنی نەتەوەی ئێران (و بەتایبەتی فارس) بنێن و هەوڵیان دا، بەهۆی توانایی ئەو دەسەڵاتەوە، هەموو سنوورەکانی "أبعاد" خۆیان لەواری زمان، ئاین، فەرهەنگ، مێژوو، ژیانی ئابوری و دەسەڵاتدا ڕێک بخەنەوە و بتوانن دەسەڵاتیان بەسەر کۆکردنەوە و گونجاندنی ئەو ڕەهەندانەدا هەبێت، کە پاشان سەرەتای یەکێتی و یەکبوونێکی نوێ بۆ چوونە ناو قۆناغێکی تازە، کە قۆناغی یەکبوونی زمان، واتە بنیاتنانی زمانی هاوبەش، پێکهێنانەوەی فەرهەنگی هاوبەش و ئاینی هاوبەش و ژیان و بەرژەوەندی هاوبەش، لە ڕێگای دەسەڵات و دەوڵەتی هاوبەشەوە، کە پاشان ئەم قۆناغە، بە قۆناغی نەتەوە و پێکهێنانی گەلی[٥] هاوبەش بەهۆی هێز و کاریگەریی دەوڵەتەوە، دەناسرێت.

عوسمانییەکانیش، هەر بەو شێوەیەی ئێرانییەکانیان کرد. هەردووکیان، سەفەوی و عوسمانی، توانییان بناغەیەکی دەوڵەتیی بەهێز بۆ نەتەوەی فارس و تورک بنیات بنێن و بتوانن کارێکی وا بکەن کە پاشان، ئەو دوو نەتەوەیە، بەهرەمەندبن لە بناغە جێگیر و پتەوەکانی زمان، فەرهەنگ، ئاین، ژیانی ئابوری، خاک و شوێنی ژیان"نیشتمان" و دەسەڵاتیش هەموو جارێک و سەردەمێک ئەمانەی نوی و چاک و فراوانتر دەکردەوە، لەبەرژەوەندی ئەو دوو میللەتە، کە بەهۆی ئەو بناغانەی کە باسمان کردن، بەبی سەر ئێشە توانییان پی بنێنە قۆناغی یەکگرتنی ناوچەکان، یەکگرتنی شێوەزارەکان بۆ پێکهاتنی زمانی هاوبەش، یەکێتی و یەکبوونی دینی، ژیانێکی هاوبەش لە سایەی دەسەڵاتی ناوەندیدا و سەرەنجام ئەو دوو دەوڵەتە مێژووییییە، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، هەنگاوەکانی بوون بەدەوڵەتی نەتەوەییان دەست پێ کرد و لە سەرەتاکانی سەدەی بیستدا نەتەوە (فارس و تورک) و دەوڵەتی نەتەوەییی خۆیان پێک هێنا.

لەبەرامبەر ئەواندا کورد، چی بەسەرهات؟ ئەگەر بەوردی تەماشای ژیان و ڕەوشی کوردان بکەین لەو سەردەمەدا، ئەم گۆڕانکارییە تازە و کاریگەرانەمان، بەرچاو دەکەوێت:

١ – کورد، بەوەی کە خۆی کردە کەمینە و بەزۆری دەسەڵاتدارانی (سەفەوی) سەبارەت بەجیاوازیی مەزهەبی، لە ئێراندا، کرایە کەمایەتی و جیاواز و نامۆ بە زمان، فەرهەنگ، ئاین و شارستانیی ئێرانی و کورد ناچار بوو (ناچارکرا) دەستبەرداری گەلێ پایەی گرنگی نەژادی و مێژوویی خۆی بێت، کە بێگومان ئەو بناغانە (زمان، فەرهەنگ، مێژوو، ئاین، شارستانی و دەسەڵات) دەتوانن یارمەتییەکی زۆری ئەو نەژادە بدەن بۆ دیسان یەکێتی و یەکگرتن و چوونە ناو قۆناغی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەوە.

٢ – کورد، لەلای عوسمانییەکانیش، هەرچەندە زۆربەی کورد کەوتنە بندەستی دەسەڵاتی عوسمانی (ئەویش سەبارەت بەڕەوشی ئاینی و مەزهەبی و چوون یەکی مەزهەبی کورد و تورک)، دوژمن بەنەژادی ئاری (تورکەکان سەر بەنەژادی تۆرانییان ئاڵتا ئۆراڵین، کە لە تەواوی مێژوودا بەدوژمنایەتیی نەژادی ئێرانی

ناسراون و هەرچییان پێ کرابێت بۆ داگیرکردنی وڵاتەکانی باشوور و ڕۆژئاوای خۆیان دریغییان نەکردووە. سەلجووقییەکان، مەگۆلەکان، قەرەقۆینلو و ئاق قوینلو، و پاشان عوسمانییەکان هەموویان لە نەژادی تورانیندا بژی و لەژێر سێبەر و ڕەحمەتی ئەو نەژادە جیاوازەدا سەردەمێکی نوێ بە ژێردەستەیی بەسەر بەرێت. هەر وەکو چۆن جیاوازیی مەزهەبی بووە هۆی جیابوونەوەی نەژادی ئاری (بۆ کورد و فارس)، هەر بەو شێوەیە وەک یەکیی مەزهەبی بووە هۆی ناچاربوونی کورد کە لەژێر دەستی نەژادێکی بێگانەدا بژی.

٣ – لە کاتێکدا تورک و فارس، بەرەو یەکبوون و یەکگرتنی میللەتی و نەژادی دەچوون لەنێوان ناوچەکانی ئەو دوو میللەتەدا، کورد بەرەو دیسان جیابوونەوە (جیابوونەوەی کوردی ژێر دەسەڵاتی ئێران لە کوردی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی) و لێکدابڕان و پەیدا بوونی ناوچەگەری و تایەفەگەری و دامەزراندنەوەی میرنشینە ناوچەیی و دەسەڵاتە خێڵەکییەکان و جیاوازیی مەزهەبی و فەرهەنگی ناوچەیی، ملی ناو دیسان ناچار کرایەوە لەگەڵ پەرتەوازەیی و لێکترازانی شوێنی و مێژوویی بێتەوە بەهاوبەشی ژیان.

٤ – تورک و فارس، بەهۆی دەسەڵاتی ناوەندییانەوە، توانییان هێزێکی گەورە و کاریگەری نەژادی خۆیان و ئاڵوگۆڕ بەخش پێک بێنن. بەڵام هەر ئەو دوو دەوڵەتە بەهێزە بوونە هۆی بێهێزی و دووبەرەکی و چەند بەرەکێی کورد و کوردیان ناچارکرد (هەر یەکە بۆ پاراستنی ناوچەکەی و ڕزگارکردنی ئەوەی کە دەکرێت ڕزگار بکرێت)، بچنە ژێر فرمانی یەکێک لەو دوو ئیمپراتۆریانەوە و سەرەنجام ڕەوشی هەرە نالەبار و خراپ و دژ بەکورد، هاتە ئاراوە، ئەویش دژایەتیکردنی کورد بۆ کورد و داگیرکردنی کورد بۆ کورد بوو، دیارە لەبەر بەرژەوەندی داگیرکەرانی نوێ و شتێکیش لەبەر بەرژەوەندی بچووک و کەمبایەخی ئەو لایەنە تایبەتییەی کورد، کە نەدەکرا، بەگوێی یەکێک لە دووو دەسەڵاتە داگیرکەر و بەهێزە، نەکات.

٥ – سەرەنجام و لە هەمووی کاریگەرتر بێهێز بوونی کورد، لە هەموو ئەو زەمینە و وارانەی کە باسمان کردن (زمان، فەرهەنگ، ئاین"سەبارەت بەجیاوازیی

مەزهەبی"، دەسەلات، ئابووری (هەرچەندە کوردستان ولاتێکی بەپیت و بەرەکەتە، بەلام سەبارەت بەداگیرکردن و جەنگ و شەڕەکان، دەمێکە هەلومەرجێکی ئاسایی و ئارام بۆ لەباربوون و هێزی ئابووری پەیدا نەبووە). تەنانەت بزووتنەوە کوردییەکانیش نەیاندەتوانی ئەو ڕەوشانە تێ بپەڕێنن و نەیاندەتوانی لەسەر ئاستی ناوچەیی و جیهانیدا، هێزێکی گونجاو و لەبار بۆ پرسی کورد بەدەست بهێنن، چونکە ئەو دوو هێزە هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم لە هەلومەرجی نێو دەولەتیدا، سەبارەت بەکاریگەریی هێز و دەولەتەکەیان، حسابیان بۆ دەکرا و کورد نەیدەتوانی و تا ئێستاش نەیتوانیوە لەو جوغز و سنوورانەی کە ئەو دەولەتە داگیرکەرانە بەبالای کوردیاندا بڕیوە، دەرباز بێت و لە سەر ئاستی نێو دەولەتیدا ببێتە هێزێکی سەربەخۆ و حسابی بۆ بکرێت. سەرەنجام کورد ناچارکرا، چ ئەوانەی کە لەگەل یەکێک لەو دوو دەولەتەدان، و یان ئەوانەی کە لەو دوو دەولەتە هەلگەڕاونەتەوە، لەو سنوورانە دەرباز نەبێت کە ئەو ڕەوشە داگیرکارییە بۆ کوردی بەدیاری هێنا.

هەردوو دەولەتی سەفەوی (١٥٠١- ١٧٢٢ز) و دەولەتی عوسمانی (١٢٩٩-١٩٢٣ز) و لەو سەردەمانەی کە هاتنە کوردستانەوە و دەستیان کرد بەداگیرکردنی کوردستان، لە ولاتی خۆیاندا واتە لە ولاتی فارس و تورک، بەهۆی دەسەلاتی زۆر و زەبر و زەنگ و داگیرکردنەوە توانییان یەک لەدوای یەک، ناوچەکانی خۆیان بگرن و سەرەنجام بتوانن دەولەتێکی بەهێز و تاکانە لە ولاتی خۆیان دابمەزرێنن و بەمەش یەکێتی و یەکبوونێکی بەزۆریان، بەبالای ولاتی خۆیاندا بڕی.

بێگومان ئەو سەردەمە، سەردەمی دەسەلاتی بنەمالە، دین (یان مەزهەب) و ئیمپراتۆریاکان بوو، وە تەنها لەم ڕێگەیەشەوە میللەتەکان توانیویانە یەکێتیی دەسەلات و ناوچەکان بەدی بهێنن. ڕەوشی داگیرکاری و دەسەلاتی بێگانە ئەوەشی بەکورد و کوردستان، ڕەوا نەبینیوە، ئەگەر یەکێک لە فەرمانڕەواییە ناوچەییەکانی (بەتلیس، هەکاری، ئامێدی، ئەردەلان، لوڕستان، سۆران یان بابان) هێزێکی وای پەیدا بکردایە، کە نیشانەی مەترسی بووبێت بۆ دەست بەسەراگرتنی ناوچەکانی نزیک خۆی، چ لە ڕێگای پەیمان بەستنی دوو قۆلی یان لە ڕێگای سەرکەوتنی بەهێزەکان بەسەر بێهێزەکاندا، ئەوا یەکسەر ئەو دوو دەولەتە دەکەوتنە خۆیان و

هەرچییان پێ کرابایە بەدژی ئەو دەسەڵاتە کوردییانە، درێغییان نەدەکرد.

یان ڕاستەوخۆ، خۆیان سوپایان کۆ دەکردەوە بۆ لەناوبردنیان، وەکو لەناوبردنی ئەمارەتی برادۆست (خانی لەپ زێڕین) بەدەستی شا عەباسی سەفەوی سالی ١٦١٠ز، یان لەناوبردنی ئەمارەتی بەتلیس بەدەستی سوڵتانی عوسمانی، مورادی چوارەم لە سالی ١٦٥٠ز. یان بەزۆر میرنشینەکانی دیکەی ناوچە کوردنشینەکانیان بەگژدا دەکردن، یان دوو قۆڵی (عوسمانی و سەفەوی) لە دژی ئەو دوو دەسەڵاتە دەجەنگان.

ئەوەی لە هەمووی گرنگترە، ئەوەیە، کە لەو سەردەمەدا، ئەو دوو ئیمپراتۆریایە نەیانهێشت، دەسەڵاتی کوردی لە ڕێگای هێزەوە ناوچە کوردنشینەکان یەک بخا، بەڵام وێڕای ئەوەش، کورد و بەرەنگاری کوردی، هەر مایەوە و دەسەڵاتە کوردنشینەکان و میرنشینەکان، بەردەوام بوون و توانییان پێ بنێنە سەدەی ١٧ و ١٨ و ئەمارەتەکانی خۆیان بپارێزن، بەڵام هەر لەو ڕێگایانەوە کە باسمان کردن.

لە سالی (١٦٣٩ز) ڕێککەوتننامەی نێوان عوسمانی و سەفەوی لە شاری زەهاو کە بەڕێکەوتنی قەسری شیرین یان (زەهاو) ناودەبرێت، بەسترا کە تیایدا هەموو ناوچەکانی کوردستان دیسان کەوتنەوە بەر ڕەحمەتی دابەشکردنەوە لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا. ناوچەکانی شارەزوور کە تا ئەو کاتە بەشێک بوون لە دەسەڵاتی ئەردەڵانەکان و بەشێک بوو لە فەرمانڕەواییی سەفەوییەکان، کەوتە بەردەستی عوسمانییەکان و بەم شێوەیە کوردستان و ناوچەکانی جارێکی دیکە دابەش کرانەوە. ناوچەی شارەزوورمان بەنموونە هێنایەوە. ئەم ناوچەیە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، زیاتر لە دوو سەد ساڵ بەشێک بوو لە قەڵەمڕەوی ئەردەڵانەکان و لەناو سنووری ئێراندا بوو، واتە بێ گومان بەشێک دەبێت لەزمان، فەرهەنگ، ئاین، شارستانی، یانی ئابووری و دەسەڵاتی ئەو ناوچەیەی یەکەم، کاتێک کە پاش ئەو مێژووە ١٦٣٩ دەکەوێتە بەردەستی عوسمانییەکان و پاشان بەردەستی بابانەکان بێگومان دەبێت ببێت بە بەشێک لە ژیان و هەلومەرجێکی نوێ و دیسان و سەرلەنوێ میللەتی ئەو ناوچەیە دەبێت هەموو پێکهێنەر و لایەنەکانی ژیانیان بگۆڕن. ناوچەی شارەزوور تا ئەو کاتە بەزاراوەی گۆرانی (هەورامی) یان شێوە گەرمیانییەکەی

هەورامی کە نزیکە لە زاراوەی لورییەوە دەدوان و بێگومان نووسەران و شاعیرانیش هەر بەو شێوەزارە بەرهەمەکانیان دەنووسی و بەڵام پاشان ناچاربوون، کە بەزاراوەی کرمانجی ناوەڕاست و بەتایبەتی بەزاراوەی سلێمانی بنووسن و بدوێن. مەبەستم لەم نموونەیە ئەوەیە کە هەموو ناوچەکانی کوردستان لەژێر ڕەحمەتی ئەم دوو دەوڵەتە بەهێز و داگیرکەرەدا دەبێت چاوەڕوانی دیسان گۆڕان و هەڵگەڕانەوە و دابڕان بن و زۆرن ئەو خێزانانەی (بنەماڵە) کە تا ئێستا بەشێکیان لەئێران و ئەوی دیکە لە عێراق یان بەشێکیان لە تورکیا و بەشەکەی تر لە عێراق یان ئێران. بەم شێوەیە بناغەی جێگیربوون و یەکێتی و یەکبوون بەتەواوی هەڵتەکاوە و تا ئێستاش سەبارەت بەکاریگەریی داگیرکردن و دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتانە، کورد خۆی نەگرتووەتەوە و هەر بەرەو هەڵوەشان، دابەشکردن، لێکدابڕان، پەرتەوازەیی و سەرەنجام ناکۆکی و چەند بەرەکی مل دەنێت، یان لەڕاستیدا پاڵی پێوە دەنرێت.

* وێڕای داگیرکردن و دووبارە و چەند بارە دابەشکردن، بەڵام کورد و بزووتنەوەکەی و دەسەڵاتە ناوچەییەکان هەر کۆڵیان نەدا و، لەم سەردەمەشدا بەردەوام بوون بۆ دامەزراندنی یان بەردەوامبوونی (هیچ نەبێت دەسەڵاتی ناوچەیی). کوردەکانی ئامێدی واتا میرنشینی بادینان و هەکاری توانییان تا ڕادەیەک سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن و بەو شێوەیە بچنە ناو سەدەی نوێوە (سەدەی حەڤدە).

لە سەرەتای سەدەی حەڤدە، دەسەڵاتداریتی بچووکی ڕواندز (سۆران) توانیی بەرەو فراوانبوون بچێت و ناوچەکانی نزیک خۆی بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و شارەکانی هەریر و ڕانیە بخاتە سەر سنووری و هەندێک جار توانیی شاری کۆیەش بگرێت.

دەوڵەتی ئەردەڵان، هەر لەم سەردەمەدا توانیی و بەڕابەری خان ئەحمەدخان بۆ ماوەی حەوت ساڵ شاری مووسڵ، کەرکووک و ناوچەکانی شارەزوور و هەورامان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

هەر لە سەرەتای سەدەی هەڤدەدا، دەسەڵاتی بابانەکان توانییان خۆیان دابمەزرێنن و ناوچەکانی خۆیان بگرن و دەوڵەتی ناوچەیی دابمەزرێنن و تا ساڵی ١٨٥٦ توانییان بەردەوام بن.

کورد، بەو شێوەیە توانیی، بەبوونی ئەو ئەمارەتە نیوە سەربەخۆیانەوە و بەو شێوەی کە باسمان کرد، بچێتە سەدەی هەژدە و سەدەی هەژدەش بەردەوام بکات و بەرەو سەدەی نوێ (سەدەی ناسیۆنالیزم) و سەدەی نەتەوەکان و دەوڵەتی نەتەوەیی، کە دیارە کورد یەکێکە لەو نەتەوانەی هەر زوو بزووتنەوەی نەتەوایەتیی بۆ بەدیهێنانی دەوڵەتی یەکگرتوو و نەتەوەییی خۆی، بەڕێ خست.

سەردەمی میرنشینەکان (بابان، سۆران، ئەردەڵان، بادینان، بۆتان) تا ڕادەیەک بە سەردەمێکی ڕێژەیی ئارام دادەنرێت، بەتایبەتی لەهەردوو سەدەی هەقدە و هەژدەدا و تا نزیکەی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە. مەبەستم ئەوەیە کە ئەم دەسەڵاتە ناوچەییانە، وێڕای ناکۆکی و شەڕی ناوەناوەیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عوسمانی و ئێرانی و لەگەڵ یەکدیشدا، بەڵام توانییان بمێننەوە و بەردەوام بن و دیارە لەو بەردەوام بوونەشدا، ژیانێکی بەردەوام و جێگیر بەهەموو سیما و بەرهەمەکانییەوە دێتە گۆڕێ.

لەم سەدەیەدا (حەڤدە و هەژدە) بزووتنەوەیەکی بەهێزی فەرهەنگی، بەتایبەتی ئەدەبی و شیعری، لە کوردستاندا پەیدا دەبێت و شاعیرانی کورد لە گرنگترین بابەتەکانی سەردەم کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئەدەبی، جوانکاری، دەوری باڵایان بینیوە و توانیویانە بەشێوزارەکانیان (گۆرانی، سلێمانی و کرمانجی و موکریانی) ئەو سەردەمە بڕازێننەوە و گیانێکی بەرز و جوان بکەن بەبەری کورد و گەڕان بەدوای ناسنامەکەیدا. هەموو پسپۆڕان و لێکۆڵەرەوەکان باسی گەورەیی ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٦ز)، مەلای جزیری، بێسارانی، خانای قوبادی، نالی و سالم و کوردی، دەکەن و ئەوان کاریگەرییەکی گەورەیان لەژیانی فەرهەنگی کورد کرد.

* هەردوو میللەتی تورک و فارس، بەهۆی بوونی دەوڵەتی بەهێز و کاریگەر، کە هەندێ لە سەرچاوەکان وەکو دوو "دەوڵەتی مێژوویی" ناویان دەبەن[٦]، توانییان پێشوازی لە سەدەی نۆزدە بکەن، کە هەر وەکو وتمان بەسەدەی نەتەوەکان و پێکهاتنی نەتەوەکان Nation hood[٧] ناودەبرێت. بەهۆی ئەو دەوڵەتانەوە، ئەو دوو میللەتە توانییان زەمینەیەکی سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی و نێودەوڵەتی بۆ پەڕینەوەی ئەو نەژادانە کە لە قۆناغی میللەت "القوم" دا بوون بۆ قۆناغی نەتەوە، پێک

بهێنن. واته ئەو میللەتانه توانییان، له سەدەی نوێدا، وەکو نەتەوەیەکی خاوەن زمانی هاوبەش، فەرهەنگی هاوبەش، دینی هاوبەش، ژیانی ئابووریی هاوبەش و دەسەڵاتی نەتەوەیی، بتوانێت ناوچەکانی کە میللەتی تیادا دەژی، بەرەو یەکێتی و یەکبوون بەرێت.

هەر لەو سەردەمەشدا، کورد کە لەژێر دەستی ئەو دوو دەوڵەتەدا دەژیا، لە هەلومەرجێکی زۆر نالەباردا دەژیا. خاکەکەی لەنێوان دوو دەوڵەتی داگیرکەری بەهێزدا، دابەشکرا بوو، لەواری زمانەوە بەسەر چوار شێوەزاری گەورەدا (لوڕی، گۆرانی، کرمانجیی ناوەڕاست و کرمانجی باکووریی) دابەش کرابوو، ڕەوشی فەرهەنگی و دینی و ژیاریی لەیەک دابڕابوو، سەبارەت بەوەی کە بۆ ماوەیەکی درێژ ٦٤٠- ١٨٠٠ز لەژێر دەستی چەندین داگیرکەری جیاوازدا (داگیرکردنی عەرەبی ئیسلامی، سەلجووقی، مەگۆلی، سەفەوی، عوسمانی و قاجاری) مابووەوە، بۆیە دەبینین هەرچی زیاتر دوور کەوتنەوەی ناوچەکان، شێوەزارەکان، فەرهەنگەکان، ڕێبازە ئاینییەکان، پەرتەوازەیی ژیانی ئابووری و سەرەنجام نامۆ بوون و لێکدابرانە مێژووییەکانیش. بەم جۆرە کورد بەم هەموو لێک دوورکەوتنەوەو ژێردەستەییە، هاتە نێو سەدەی پێکهاتنی نەتەوەکانەوە.

زانایانی بواری نەتەوایەتی و بە لێکۆڵینەوە لە مێژووی نەتەوەکان و دەوڵەتەکانی نەتەوەیی، لەو بڕوایەدان، کە پەڕینەوەی نەژادەکان (میللەتان) بۆ قۆناغی نەتەوەیی، واتە بۆ قۆناغی یەکێتی و یەکبوونی زیاتری ئەو میللەتانه و یەکگرتنی ناوچەکان لە سایەی یەک دەسەڵاتدا و پەیدا بوونی زمانێکی هاوبەشی نەتەوەیی و ستاندارد و نووسراو بۆ هەموو بەشەکانی ئەو میللەتە، دەسکاریکردنی فەرهەنگ و دین و شارستانی ئەو نەتەوەیە بەقازانجی نەتەوەکە و دەوڵەتی ئەو نەتەوەیە، زیاتر پێکەوە گرێدانی ناوچەکان بەیەکتری و پێکەوەبەستنی ناوچەکان بەدەسەڵاتەوە لەرێگەی ئابووری و دەسەڵاتی ئابووریی هاوبەشەوە، کە هەموو ئەمانە بێگومان ڕەوشێکی یەکگرتووی نەتەوەکان پێک دەهێنن، لەرێگەی دەوڵەتەوە دەبێت، واتە کارێکە کە لە سەرەوە دەکرێت، بەڵام بەپشت بەستن بەژێرەوە، واتە بەبنەماکانی زمان، فەرهەنگ، خاک، ئابووری، دین، شارستانی[٨]. بزووتنەوەی کورد بوون و کوردایەتی، واتە

هەوڵی ئەو میللەتە بۆ یەکێتی و خاوەندارێتی لە هەموو زەمینە و سەرچاوەکانی خۆیی بوون، دەبووایە هەموو ئەو ڕەوشانەی کە باسمان کردن، لەبەرچاو بگیرێت و لە ئەنجامی ئەو هەلومەرجەدا بتوانێت کارێکی گونجاو بۆ بەدەستهێنانی ناسنامە و ڕزگاریی ئەو میللەتە دابەشکراو و پارچە پارچە و پەرتەوازەیە، وەکو تاکە ڕێگای مومکین لەو سەردەمەدا بخاتە گەڕ.

پەیدابوون و سەرهەڵدانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی (ناسیۆنالیستی)ی کوردی، لەسەر دەستی باوکی ناسیۆنالیزمی کورد[٩] (بەدرخان پاشا) لە ساڵی ١٨٤٣دا دەست پێ دەکات، پاش ئەوەی کە بەدرخان پاشا سکەی پارەی لێ دا، لە نوێژی هەینیدا بەناوی ئەو (نەک بەناوی سوڵتانی عوسمانی) وتار دەخوێنرایەوە. دەسەڵاتی ئەو لە ڕۆژهەڵات لە سنوورەکانی ئێرانەوە تا ڕۆژئاوای کوردستان و میسۆپۆتامیا، هەر لە دیاربەکر تا مووسڵ، فراوان ببوو و سەروەت و سامانەکەشی لە حساب تێپەڕیبوو[١٠]. بەدرخان پاشا، بە ڕۆژنامە نیگارەکانی ئەمریکایی وتبوو کە ئەو شای وڵاتی خۆیەتی، هەرچەندە لە سوڵتانی عوسمانی بێهێزترە، بەڵام لەو بەشەرەفترە. هەموو ئەم وتانە و ئەم کارانە و ئەم بەیانانە، بەئاشکرا بۆچوون و بزووتنەوەی سەربەخۆییخوازی و نەتەوەییی میری بۆتان (بەدرخان پاشا) کە پاشان خۆی وەکو پاشای کوردستان ناساند، نیشانەی ئاشکرای سەرهەڵدانی ناسیۆنالسیتی کورد بەیان دەکەن و بەڕاستیش بەدرخان توانیی وەکو باوکی نەتەوەیی کورد، بۆ پێکهاتنی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیی بناسرێت. بەڵام مخابن، هێزی گەورەی دەوڵەتی عوسمانی، یارمەتیی ڕووسیای تزار و دەوڵەتی بەریتانیا کە ئەو کاتە لە جیهان و لەم ناوچەیەشدا هێزێکی بەرچاو و کاریگەر بوو، بەدژی بزووتنەوەی نەتەوەییی کورد بەڕابەریی بەدرخان، وای کرد کە ئەو شۆڕشە لە نێو بچێت و بێگومان ئاشکراشە کە ئەو بزووتنەوەیە نەیدەتوانی دەرۆستی ئەم سێ هێزە گەورەیە بێت و شتێکی چاوەڕوان کراویشە، کە ئەو نەیدەتوانی لەبەرامبەر ئەو دەوڵەتە گەورانە (لەڕاستیدا سێ ئیمپراتۆریای گەورە) ڕابوەستێت و سەرەنجام لە ساڵی ١٨٤٨دا لەناوچوو.

میرنشینی بۆتان، وەکو یەکێک لە ئەمارەتەکانی دیکەی کورد، کە لە سەرەتای

سەدەی هەڤدە بەدواوە پێک هاتبوو، بەڵام هەر بەشێک بوو لە قەڵەمڕەوی خەلافەتی عوسمانی و لەژێر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی و بەڕمزامەندیی ئەو میرەکانی دەهاتنە سەرکار دەبووایە سالانە پارەوپوولێکی زۆرو سەربازی بێ شومار بدەن بە سوڵتانی عوسمانی. میرنشینەکان لەگەڵ ویلایەتەکانی عوسمانی، جیاوازییان زۆر بوو، میرنشینەکان تا ڕادەیەکی زۆر سەربەخۆییان هەبوو وەمیرەکان کە هەمان دەسەڵاتی ناوچەیی میرنشینەکەیان پێکهێنابوو، دەهاتنە سەرکار، لەکاتێکدا ویلایەتەکان ڕاستەوخۆ بەشێک بوون لە دەسەڵاتی ئەستانە و زۆربەی جار والییە تورکەکان دەسەڵاتیان دەگرتە دەست و هیچ سەربەخۆیی و تایبەتمەندییەکیان نەبوو. لەم سەردەمەدا، واتە سەدەی هەڤدە تا جەنگی یەکەمی جیهانی، تەنها کوردستان و میسر توانیبوویان ئەمارەت و دەسەڵاتی تاڕادەیەک سەربەخۆیان هەبێت.

بەدرخان پاشا، لە ساڵی ١٨٢١ هاتە سەر میرایەتی بۆتان و لە ساڵی ١٨٤٣ بزووتنەوەی سەربەخۆیی بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردیی دەست پێ کرد و لە ساڵی ١٨٤٧ بزووتنەوەکەی کۆتایی پێ هات و پاشان خۆیشی لە ساڵی (١٨٧٠) لە دیمەشق وەفاتی کرد. شارەزایان، لەو بڕوایەدان کە دوو هۆکاری کاریگەر، بێگومان، بێجگە لەوەی کە بەڕاستی خەلافەتی عوسمانی و ئەستانە هێزێکی گەورە بوون و کورد نەیدەتوانی بەتەنیا دەرۆستی ئەو ئیمپراتۆرە گەورەیە بێت، یەکێک لە هۆکان، ئەوە بوو کە هەردوو دەوڵەتی ڕووسی و بەریتانی لایەنگرییان لە عوسمانی کرد و یارمەتیی عوسمانییەکانیان دا بە دژی بەدرخان، دووەم هۆ، ئەوەبوو بەشێک لە هێزی کوردەکان، بە سەرکردایەتیی یەزدان شێری ئامۆزای بەدرخان پاشا، خیانەتیان کرد و چوونە پاڵ عوسمانییەکان و بەمەش زەربەیەکی کاریگەر و کوشندەیان دا لە هێزی نەتەوەیی کورد.

ئێمە لە لاپەڕەکانی پێشوودا، باسمان لە پانتایی و قووڵایی، ناکۆکی و دووبەرەکیی نێوان کورد کرد و وتمان کە بەشی هەرە زۆری ئەم دووبەرەکی و خیانەتە، دەسکرد و کاریگەریی بە دوژمنان و داگیرکەرانە لەنێو کوردا. بەردەوام داگیرکردنی کوردستان لە لایەن ئەو هێزانەی کە ناومان هێنان، دەرباز نەبوونی کوردستان لە چنگ داگیرکاری ٦٤٠ز– ١٨٤٠، پەیدا بوونی بەرژەوەندی داگیرکەران لەناو کوردستاندا و سەرەنجام لێکگرێدانی بەرژەوەندی بەشێک لە کورد لەگەڵ

بەرژەوەندی داگیرکەراندا، بێگومان زەمینەیەکی گونجاو فەراهەم دەکات بۆ نۆکەرایەتی و هاوبەرژەوەندی بەشێک لە دەسەڵاتی کوردی و بەتایبەتی لەنێو میرنشینەکاندا هیچکام لە میرنشینە کوردییەکان، هەرچەندە ئەو بەشەش سەر بەهەمان بنەماڵەی دەسەڵاتداری میرنشین بوبێت، لەگەڵ دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتانەدا خاوەنی بەرژەوەندی هاوبەش بووە. لەدوای، تێکچوونی بزووتنەوەی بەدرخان، هەر خودی یەزدان شێر کە پاشان لە ساڵی ١٨٤٧ کرا بەمیری بۆتان (دوامیری بۆتان) لە ساڵی ١٨٥٣دا بزووتنەوەیەکی وەکو ئەوەی بەدرخانی دەست پێ کرد (بەڵام لە بزووتنەوەی بەدرخان لاوازتر) و تا ساڵی ١٨٥٦ی خایاند.

لەدوای نەمانی میرنشینەکانی کورد و بەتایبەتی میرنشینی بۆتان و کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی میرە بەهێزەکان کە توانییان تا ڕادەیەک بزووتنەوەیەکی بەهێزی نەتەوەیی بۆ یەکخستنی کورد و پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، بەدی بهێنن، لەڕاستیدا کوردستان "بێ سەر"[١١] مایەوە و دەسەڵاتدارانی تورک دەیانەویست ڕاستەوخۆ کوردستان حوکم بکەن و ڕێگایان نەدا دەسەڵاتدارێتی ناوچەیی یان میرنشین لەو ناوچانەدا، پەیدا بێتەوە و لە لایەکی دیکەوە سەرەتای لەبەریەک هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی و میرایەتیی کوردیش، بۆشاییەکی گەورەی لەنێو کوردستاندا، دروست کردبوو. ئەم سەردەمە سەردەمی، بێدەسەڵاتی، بێ یاسایی و پشێوی و ئاژاوەی بۆ ناوچەکە، هێنا بووە ئارا و بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی بەدرخان پاشادا، کە سەردەمی هێمنی و دادپەروەری و خۆش گوزەرانی[١٢] دادەنرا، گەلێک جیاوازیی گەورەی هەبوو، بەڵام ئەوەی کە لە هەمووی کاریگەرتر بوو، ئەوەبوو کە کوردستان بەبێ دەسەڵات مابووەوە.

نەوەیەکی دیکە و جۆرێکی دیکە لە ڕابەرانی کورد، بەتایبەتی لە ناوچە گوندنشینەکانەوە بەرەو دەسەڵات و سەرکردایەتی کردنی کۆمەڵگای کوردەواری، بەرەو پێشەوە هەنگاوی دەنا و شێخەکانی کوردستان، بەتایبەتی شێخەکانی سەر بە تەریقەتی (ڕێبازی) قادری و نەقشبەندی ـتەسەوف- وەکو سەردەم دارانی نوێیی کۆمەڵ و بزووتنەوەی کوردی، هاتنە مەیدانەوە و بۆ ماوەیەکی زۆر کە لە ساڵانی ١٨٧٠- ١٩٤٠ی خایاند، کۆمەڵگا و بزووتنەوە و سەرکردایەتیی کوردەواری چووە دەست ئەوانەوە.

پەیدابوونی سۆفیزم لە کوردستاندا، لەسەر دەستی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و شێخ شەهابەدینی سووورەوەردی، هەر وەکو باسمان کرد، کاردانەوەیەکی پاسیفیستی دینی کوردی و ئامادەیی دینیی کورد و ئێران بوو، لەبەرامبەر دین و دەسەڵاتی چالاک (ئەکتیف)ی عەرەبی ئیسلامی، واتە ڕازی بوون و پەسەندکردنی ڕواڵەت و دۆگم و ئەرسەدۆکسیزمی ئیسلامی و هەوڵدان بۆ توانەوەی ناوەڕۆکی ئاریایی لەو چوارچێوە و دەربڕینە ئیسلامییەدا و بەڵام بەنرخی بەقوربانی کردنی دنیا و فەرامۆشکردنی دنیا، واتە تەسەوف هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی ناخێکی دینداری ئەرسەدۆکسیی ئیسلامی و ناوەڕۆکی دینی ئاری (خودایی بوون) و فەرامۆشکردنی دنیا، هەر وەکو خۆیان دەڵێن تەسەوف دینە، دنیا نییە.

لەدوای ئەوەی کە مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩- ١٨٢٨) لەسەر دەستی شا عەبدوڵلای دەهلەوی، تەریقەتی نەقشبەندیی وەرگرت، ئەو (مەولانا) داوای کرد کە شا عەبدوڵلا دین و دنیایشی بداتێ. ئەمە یەکەمین جارە، لەمێژووی تەسەوفی کوردی باس لە دنیا بکرێت ئەو توانیی خۆی و نەوەکانی دوای خۆی لە تەسەوفدا بەو ڕادەیەی کە دەسەڵاتی ڕۆحانیان لەنێو دینی کوردا هەیە هەر بەو ئەندازەیەش بتوانن دەسەڵاتێکی دنیاییان هەبێت و بەتایبەتی دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتیی بزووتنەوەی کوردی. یەکێکی دیکە لە کاریگەرییەکانی مەولانا و تەریقەتی نەقشبەندی (کوردی!) ئەوە بوو کە بە ئاشکرا دەیوت تۆ هەرچی هەیت و لە هەر چین و توێژ و نەژادێکی دەتوانیت بەخواپەرستی، دانایی و هەوڵ و تێکۆشانی خۆت وردە وردە لە خودا نزیک ببیتەوە و پیاو چاکی و شارەزا بوون لە دین و پەیداکردنی دەسەڵاتی دینی هیچ پەیوەندیی بە بنەماڵە و نەسەب و پەیوەندیی خێزانییەوە نییە و ئەوانەی کە بانگەوازی سەر بە "شجرة الانساب" دەکەن و دەڵێن ئێمە لە بنەماڵەی پێغەمبەرین، ئەوانە ناتوانن تەنها بەو بانگەوازە و بەبێ خوداپەرستی و" اجتهاد" بتوانن پیرۆز بن و بەخودا بگەن. ئەم کارەی مەولانا گرنگییەکی گەلێک کوردانە و مرۆڤانەی هەیە، واتە گێڕانەوەی ڕەوایی دینی بۆ مرۆڤ و مرۆڤی کوردی و هەوڵدان بۆ پەیداکردنی سەرچاوەکانی ڕەوایی و هێزی دینی لەناو میللەت و کەسانی سادە و دژ وەستانەوەی قۆرخکردن و پاوانکردنی هێز و دەسەڵاتی دینی لە لایەن بنەماڵە

بەهێزەکانەوە. پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی ئەم ڕێبازە دینییە لەنێو کوردا، گەلێک خێرا و بەرچاو بوو، چونکە لە دوای بێهێز بوونی دینی زەردەشتی و لاوازبوونی یەکجارەکی و نەمانی، ئەمە یەکەم جار بوو، کە چالاکیی دینی لەنێو کوردا بتوانێت چەندین هێز لەخۆیدا کۆبکاتەوە، یەکەمین ئەوە بوو کە ئەم تەریقەتە ئیسلامی بوو، ئیسلامیش لە نێو کوردا پاش نزیکەی ۱۲۰۰ ساڵ ڕەگی داکوتا بوو وە لە پانتاییەکی بەرینی کۆمەڵایەتیدا هێزی پەیدا کردبوو، دووەمین، ناوەڕۆکی ئەم ئاینە (مذهب) هەمان ناوەڕۆکی دینی زەردەشتی، ئەهلی هەق، عەلەوی، ئێزیدی کە ناوەڕۆکی (دینی یەزدانی) یان (مرۆڤی- خودایی)یە و نزیکایەتی زۆری لەگەڵ ئەو ئاینانەی دیکەدا هەیە، هەر بۆیەشە لە لایەن ئاینەکانی دیکەوە پەسەند دەکرێت و ڕێزی زۆریشی لێ دەگیرێت، سێیەم، دینێکی چالاک و کاریگەرە لە واری کۆمەلایەتی، یەکسانی، نەتەوایەتی، دژایەتی کردنی چەوسانەوە و زڵم و تەنانەت پەیوەندییەکی بەهێزیشی لەگەڵ فەرهەنگ و ئەدەبی میللەتەکەشدا پەیدابوو وە کاریگەریی گەورەی بۆ ماوەی نزیکەی ۱۰۰ ساڵ زیاتر لە ئەدەب و فەرهەنگی کوردی کرد، بەکورتی دەتوانین بڵێین کە ڕەوشێکی چالاک (ئەکتیڤ)ی دینیی نێو کوردانە. بەبڕوای من ئەم ئاینە، نزیکایەتیی گەلێک گەورەی لەگەڵ پرۆتستانیزمی ئەوروپیدا هەیە و ڕەوش و دەربڕینەکانی زۆر لەو دەچێت. ئەگەر بیر و باوەڕەکانی مارتن لۆتەر و کالفین سەرەتایەک بوو بۆ ئامادەکردنی زەمینەی دینی و فەرهەنگی (ئەو کاتە بەشێکی زۆری فەرهەنگ بەدینەوە گرێ درابوو) بۆ چینی تازە پێگەیشتووی بۆرژوازی "چینی سێیەم" لە ئەوروپادا، هەر بەو شێوەیەش ڕێبازی نەقشبەندی هەوڵدانێک بوو (لە هەر ئاستێک دابێت) بۆ سازکردنی هەمان زەمینەی دینی و فەرهەنگی و کۆمەلایەتی (چونکە بەشێکی زۆری ژیانی کۆمەلایەتی لە کوردستاندا بەدینەوە گرێ دراوە، هەر لە سەردەمی زەردەشتەوە هەتا ئێستا و بەشێکی زۆری ڕۆژهەلاتیش هەر بەو شێوەیە، هەر وەکو هیگڵ لەوە دڵنیامان دەکاتەوە) "العالم الشرقي" بۆ سەرهەڵدانی چینی نوێی (بۆرژوازی) کوردی و بەتایبەتی لەپاش نەمانی میرنشینەکان و سەرداره دەرەبەگەکانی کورد.

بەم شێوەیە، لە پانتاییی کوردستاندا، هەر لە سلێمانییەوە هەتا هەکاری (شەمدینان) و هەتا کوردستانی ڕۆژهەلات و هەتا هەولێر و دەوروبەری و تەنانەت

هەتا ناوچەکانی ئێزیدی نشینیش، ڕێبازی (مەولانا) لە بڵاوبوونەوە و پەرەسەندندا بوو، دەیویست باری کۆمەلایەتی و دینی و فەرهەنگی و سیاسی بۆ سەردەمێکی نوێ لە جووڵانەوەی کوردیدا ئامادە بکات.

لە ماوەی جەنگی ١٨٧٧- ١٨٧٨ی ڕووس و عوسمانیدا، شێخ عوبەیدوڵڵای شەمدینان بە سەرکردایەتیی کۆمەڵێکی بچووکی جەنگاوەرانی کورد بەشداری کرد و بەسەختی لە لایەن سوپای ڕووسەکانەوە شکستی خوارد و بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە ماڵی خۆی، بەڵام ئەم کارە ڕێگەی لەوە نەگرت کە پاشان بەناوونیشانی "سەرۆکی نەتەوەی کورد" بناسرێت(١٣). شێخی نەهری کە یەکێک بوو لە پەیڕەوانی مەولانای نەقشبەندی، کەسێکی دادگەر، بەهێز، زۆر بەدین، و بەتوندی دڵسۆز و گرێدراوی میللەتی خۆی، کە ئەوان، بەنێردراوی خودایان دەزانی و هەر بەو شێوەیە پەیڕەوییان لێ دەکرد، چونکە لە سەردەمی، نەبوونی و قاتوقڕی و وێرانیی جەنگی عوسمانی و ڕووسیادا بەو پەڕی دڵسۆزی و میهرەبانییەوە دۆست و فریاد ڕەسی خەڵک بوو.

شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ خۆی باوەڕی وابوو کە تەنها دەرمانی چارەسەری ڕۆژڕەشیی خەڵکی کورد، پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ بوو کە بتوانێت کوردستانی بندەستی ئێران و عوسمانی یەک بخات. لە یەکێک لە نووسراوەکانی کە لە بزووتنەوەی ناسیونالیستیی کوردییەوە دەست کەوتووە، شێخ عوبەیدوڵڵا بەیەکێک لە نوێنەرانی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانی وتبوو: کاربەدەستان و سەرۆکەکانی کورد، چ لە کوردستانی ئێران یان تورکیا، لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەوان ناتوانن لەگەڵ ئەم دوو حکومەتەدا و بەم شێوە بن دەستییە، بەردەوام بن و دەبێت کارێکی وا بکەین کە دەوڵەتانی ئەوروپایی لە کێشەمان تێ بگەن و بەیارمەتیمانەوە بێن...

کورد نەتەوەیەکی جیاوازە لەوان (تورک و فارس)... ئێمە دەمانەوێت کە کاروباری خۆمان لەدەستی خۆماندا بێت"(١٤).

شێخ عوبەیدوڵڵا و بزووتنەوەی نەهری، بەهۆی ئەم بەیانەوە بەیەکێک لەبونیادنەرانی ناسیونالیزمی کورد، دادەنرێت. ئەو توانی لە ساڵانی ١٨٧٩ و ١٨٨٠دا لە بادینان و کوردستانی بندەستی ئێراندا، شۆڕشێکی بەهێز بەرپا بکات و سەرباری سەرەتایی بوونی جەنگاوەرانی کورد لەکاری سەربازییدا، بەڵام توانییان

بەشێکی زۆری ئەو ناوچانە لە دەستی داگیرکەران ڕزگار بکەن. ئەم جارەش، هەر وەکو سەردەمی جووڵانەوەی بەدرخان، وڵاتانی گەورەی ڕۆژئاوا لە پیلانێکی نێودەوڵەتیدا بەهۆی دەوڵەتانی ڕووسیا، بەریتانیا، فەرەنسا و ئەمریکا فریای ئێران و عوسمانی کەوتن و گورزێکی کوشندەیان لە شۆڕشی عوبەیدوڵڵا و کوردستان وەشاند و کار گەیشتە ڕادەیەک کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٨٨٢دا بۆ یەکەمین جار دەوڵەتی ئێرانی بە ڕەسمی بناسێ و لەسەر حسابی بەرژەوەندی کورد پەیوەندیی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە دەستی پێ کرد[١٥]. شێخ عوبەیدوڵڵا پاش ئەوەی کە بزووتنەوەکەی شکستی خوارد و لەئەنجامی یەکگرتنی عوسمانی و ئێرانی و هاوکاریی دەوڵەتە گەورەکانی ڕووسیا، بەریتانیا، فەرەنسا و ئەمریکا دژی کوردان، شۆڕشی کوردان، ئەمجارەش کۆتایی هات و شێخیش لە ئاوارەیی لە ساڵی ١٨٨٣دا لە مەککە گیانی سپارد.

لە لێوردبوونەوەی ئەم سەردەمە و لێکۆڵینەوەی، چەند ئاماژەیەکی گرنگمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەمانەن:

**یەکەم**، لەکاتێکدا کە وڵاتانی ناوەڕاست و ڕۆژئاوای ئەوروپا، نەتەوەکان بەهۆی دەوڵەتەوە (دەوڵەتە مێژووییەکان)، دەتوانن پرۆژەی نەتەوەیی بوون و گەشەکردن بەرەو دەوڵەتی نەتەوەیی (واتە دەرباز بوون لە دەوڵەتی بنەماڵە، ئیمپراتۆریا و دین) بنیات بنێن. لە کاتێکدا دوو دەوڵەتی گەورەی نەتەوەیی (ئیتاڵیا و ئەڵمانیا) لە ساڵانی ١٨٦٠- ١٨٧١دا لە ئەنجامی یەکگرتنەوەی میرایەتییەکان و ناوچەکان، پێکدێن. لەکاتێکدا لەناو هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی مەیلی ناسیۆنالیستی پەیدا دەبێت و دەیەوێت ئەو دەوڵەتانە بکاتە دەوڵەتی نەتەوە. لەم کاتەدا، کورد چی دەکات و لە بەرامبەر چیدا دەبێت هەوڵی یەکێتی و یەکگرتنی نەتەوەیی و پاشان دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوە بدات. لەم سەردەمەدا (نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە) کورد ناچارە بە دژی داگیرکەرانی عوسمانی و ئێرانی و هاوبەرژەوەندەکانیان کە دەوڵەتانی گەورەی ڕۆژئاوایین، بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی، چەکداری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و تەنانەت دینیش بەڕێ بخات. بەڕاستی کورد، هەر لەو سەردەمەدا (لە دوای ساڵی ١٨٤٣) وەکو ئەوروپا هەوڵەکانی نەتەوەیی بوون و بزووتنەوەی

نەتەوایەتیی هێناوەتە مەیدان. بەڵام دەبێت زۆر چاک ئەوە بزانین کە بەڕاستی کورد و بزووتنەوەکەی دەرۆستی ئەو دوو داگیرکەرە گەورەیە و هاوکارە ناوبراوەکانیان نەهاتووە. کورد لەپاش دامەزراندنی ئەو دوو دەوڵەتە ناوچەییە بەهێزە، کە بێگومان لەسەر ئاستی جیهانیش بەهرەمەند بوون، مەحکووم کرا بەوەی کە لە سنوور و جوغزەکانی ئەو دوو داگیرکەرەدا بمێنێتەوە و بەرژەوەندی ناوەندە گەورە و بڕیار دەرەکانی جیهانیش وای خواست. بێگومان لەبەر خاتری بەرژوەندی ئەو دوو دەوڵەتە، دەبێت قوربانی بەهێز و میللەتێکی بچووک و لاوازی وەکو کورد (بە بەراورد لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا کە باس کران) بدرێت. بەکورتی کورد ئەو سەردەمە و هەتا بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی، وێڕای هەموو هەوڵ و تێکۆشانی لەڕادەبەدەری کورد، نەیدەتوانی لەسەردەمی بەدرخان و عوبەیدوڵڵا بەهێزتر بێت. شکستی ئەو جووڵانەوانەش تەنها بەهۆی ئەو هۆیەی کە باسمان کرد، لێک دەدرێتەوە. واتە کورد بەرگەی هێز و بەرژەوەندی ئەو دوو دەوڵەتە و هاوکارە جیهانییەکانیانی، نەدەگرت.

دووەم، یەکێک لە کارە گرنگەکانی بەدرخان و شێخ عوبەیدوڵڵا، لەسەر ڕێگای یەکێتی و یەکبوونی کورد، هەوڵدان بوو بۆ لێک نزیک کردنەوە و لێک تێگەیشتنی سەرانی خێڵە کوردییەکان بوو. ئەم کارە، بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر تەماشای بکەین کارێکی گرنگ و باشە بۆ بەدیهێنانی یەکێتی، بەڵام ئەگەر وردتر لێی بڕوانین لەوە تێ دەگەین، کە بۆچی دەبێت یەکگرتنی کوردستان بەڕێگای یەکگرتنی خێڵەکان و ناوچەکاندا تێ بپەڕێت. داگیرکردنی کوردستان لە لایەن داگیرکەرە بەهێز و یەک لەدوای یەکەکانەوە، بونیادی یەکێتی نێوان کوردی بەجۆرێک شێواندبوو، کە نەک تەنها کورد بەسەر دوو ناوچەی ژێر دەسەلاتی داگیرکەران، بەسەر چەند شێوەزار، چەند ئاین و فەرهەنگ بەڵکو کوردی بەشێوەیەکی وردتریش دابەش کردبوو بۆ سەدەها خێڵ و دەسەلاتی خێڵەکی، بێگومان بەقازانج و بەرژەوەندی داگیرکەران.

لێرەوە، ئاشکرایە کە دەبێت (بەناچاری) دیسان کورد بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هەوڵدانی یەکێتیی خێڵەکان، کە کورد و نەژادی ئاری لە دوای پێکهاتنی میللەتی میدیا لە ساڵی (٧٠٠پ.ز)دا، قۆناغی یەکێتیی خێڵەکان و هۆزەکانی بڕیبوو و چووبووە قۆناغی میللەتەوە "القوم". بەڵام داگیرکەران بەدرێژاییی سەدان ساڵ و

بەردەوام کوردیان گێڕاوەتەوە بۆ هەڵوەشانەوە و لێکدابڕان و پچڕ پچڕ بوون.

**سێیەم**، بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کورد، وێڕای پەیامی سیاسی، کۆمەلایەتی، فەرهەنگی و ئابووری ناچار بوو کە پەیامێکی چەکداری و سەربازیی هەبێت، چونکە هەردوو دەوڵەتە داگیرکەرەکە، دوو دەوڵەتی میلیتاریست و چەکدار بوون و هەمیشە لە شەڕدا بوون هەم لەگەڵ یەک، لەگەڵ ولاتانی دەوروبەر و شەڕی دژی کوردیش کاری هەموو ڕۆژە و بەردەوامیان بوو. هەموو هەوڵەکانی نەتەوەییبوونی کورد، لە هەموو ئەو زەمینانەی کە باسمان کردن، نەیدەتوانی بەئاکام بگات، ئەگەر بێتو سەرکەوتنی سەربازی بەسەر داگیرکاری چەکدار و پڕچەکدا بەدەست نەهێنایە و بەداخەوە سەرەنجامیش هەر ئەوە بووە، بەشی کورد. لەبەر ئەوەی لە واری سەربازیدا شکستمان خوارد، بۆیە لە زەمینەی کۆمەلایەتی، فەرهەنگی، سیاسی و ئابووریشدا سەرنەکەوتین و زاڵبوونی داگیرکەران و ڕۆچوونیان بەقوولایی و فراوانبوونەوەی سەرکەوتنی ئەوان لە تەواوی پانتاییی کوردستاندا، دیسان دەروازەیەکی گەورەی بەرەو ڕووی نامۆبوون و گومانکردنی لەو هەوڵ و زەمینانە کردەوە و ئاشکراشە هێزی داگیرکەران و بەزۆر سەردانەواندنیان بە کورد، دەبێتە سەرەتایەک بۆ وازهێنان لەو نرخ و بەهایانەی کە بە قوربانی و خوێنێکی زۆر بەدەست هاتبوو.

* شکستی هەردوو بزووتنەوەی بۆتان و نەهری لە باکووری کوردستان و شکست و نەمانی ئەمارەتی بابان و سۆران و ئەردەلان لە کوردستانی باشوور و ڕۆژهەلات، کوردی بردە سەردەمێکی نوێ و پڕ لە گومان و نائومێدی و لەهەمان کاتدا هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکی دیکە، لە دوای نەمانی میرنشین و شۆڕشە گەورە چەکدارییەکان، کە ئەویش ڕێگا چارەی سیاسی و چالاکیی فەرهەنگی و ئەدەبی بوو. لەم سەردەمەدا، پاش نزیکەی ٥٠ ساڵ شۆڕش و ڕاپەڕینە گەورەکان، چینێکی ناوەند لە ڕابەرانی کورد، دەرکەوتن. ئەم نەوەیەی سەرانی کورد، لە ڕاستیدا بۆرژواکان و نەوە بێدەسەلاتەکانی (میرنشینەکان) بوو، واتە هەمان نەوەکانی بابان، ئەردەلان، بەدرخان و شەمدینانەکان بوو، کە وێڵی دۆزینەوەی کارێکی دیکەی سیاسی و نەتەوەیی بوون، کە بتوانێت لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو سەردەمەدا بگونجێت.

له ساڵی ١٨٨٩ پارتێکی سیاسی له تورکیا (ئەستەمبوڵ) بەناوی کۆمیتەی اتحاد و تەرەقیّ، لە لایەن چوار کەسەوە پێک هات، کە دووان لەوان "اسحاق سکوتی" و "عبدالله جودت" کورد بوون، ئەم حیزبە بە یەکەمین حیزبی سیاسی دادەنرێت لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانی و ڕۆژهەڵاتدا. پاشان دوو کەسایەتیی گەورەی ئەو دەمی کورد "عبدالرحمن بدرخان" و "حکمت بابان" لە یەکەمین کۆنگرەی ئەو پارتەدا لە ساڵی ١٩٠٢دا بەشداریيان کرد. بۆ ماوەی دە ساڵ نەتەوەپەروەرانی کورد و تورک پێکەوە و لەناو یەک ڕێکخراوی سیاسیدا کاریان کرد و ئەم هاوکارییە هەتا ساڵی ١٩٠٨ی خایاند کاتێک کە "تورکانی لاو" پەیدا بوون و کۆمیتەی اتحاد و تەرەقی بەرەو هەڵوەشانەوە هەنگاوی نا.

کۆمیتەی اتحاد و تەرەقی، گرنگترین کاری خۆی و خەباتیشی هەر بۆ دیسان گەڕانەوە بوویۆ هەلومەرجی ١٨٧٦، واتە کارکردنی سوڵتانی عوسمانی بەدەستوور و ڕێگادان بە بەشێک لە ئازادییە سیاسی، کۆمەڵایەتی و میللییەکان بوو، ئەم سەردەمە، واتە، تا ساڵی ١٩٠٨ بە سەردەمی مانگی هەنگوینی نێوان ڕووناکبیرانی کورد و تورک دادەنرێت. لە دوای ساڵی ١٩٠٨ سەردەمێکی زۆر ترسناک لەژیانی دەسەڵاتی تورک و بەتایبەتی ناسیونالیستە شۆفێنییەکانی تورک (تورکانی لاو) بەدژی کورد و ئەرمەن، دەست پێ دەکات[١٦].

لەساڵی ١٩٠٨دا، ئەمین عالی بەدرخان، شێخ عەبدولقادری شەمدینان، شەریف پاشای خەندان و ئەحمەد ڕەفیق پاشا "جەمعیەتی اتحاد و تەرەقی کوردستان"یان دروست کرد وەکو کۆمەڵەیەک یان پارتێکی سیاسی و پاشان کۆمەڵەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیرییان بەناوی "جەمعیەتی نەشری مەعاریفی کورد" و خوێندنگایەکی کوردیشیان لە گەڕەکی چەنبەرلیی ئەستانبول، کردەوە[١٧]. لە پاییزی ١٩٠٨، ئەم کۆمەڵە سیاسییە گۆڤارێکیان بەناوی "تعاون و ترقی کرد" دامەزراند و تیایدا اسماعیلی حەقی بابان، سەعیدی کوردی و عەبدولقادری شەمدینانی وتاریان دەنووسی و دەیان ویست خەباتێکی ڕووناکبیری و فەرهەنگی بەڕێ بخەن و بەتایبەتیش دەیان ویست لە ڕێگای زمانی کوردیی نووسراوەوە، کەناڵێکی باش و گونجاو بۆ کۆکردنەوەی ئەو خەباتە، بسازێنن. ڕەهبەرانی کورد،

لەڕێگای ئەم خەباتەوە دەیان وت کە خوێندنی تورکی بۆ منالآنی کورد، زیانمەندە و بانگەوازی بەکوردی خوێندن بووە سەرمەشقی کارەکانیان و داواشیان دەکرد کە دیسان هێزی کوردی لە کۆبوونەوەی خێڵەکان، دەتوانێت ئەنجامی هەبێت.

دامەزراندن و پەیدابوونی کۆمەڵە و یانەی سیاسی، پاشان لە شارانی مووسڵ، بەغداد و دیاربەکر بەرەو زیادبوون دەچوو. خەباتی سیاسی و نەتەوەیی لە سالآنی ۱۸۹۰ هەتا سالّی ۱۹۱٤، لە ڕێگای ئەم کۆمەڵە سیاسی و فەرهەنگییانەوە بەرەو پێش دەچوو.

لە ڕاستیدا ئەستانبول بووبووە مەڵبەندی سەرەکیی ئەم شێوە خەباتە و زۆربەی نەوەکانی میرنشینەکانی کورد، پاش ئەوەی لە مەنفای میسر یا کریت، گەڕابوونەوە و لەناو نزیکەی سی هەزار کوردی ئەستانبول، کە لەوپەڕی هەژاری و دەستتەنگیدا ژیانیان بەسەر دەبرد، کاری سیاسی و فەرهەنگی و نەتەوەییان ئەنجام دەدا.

سالّی ۱۹۱۳ بە سالّێکی شووم و خراپ دادەنرێت لەنێوان دەسەلآتی تورکە لاوەکان و نەتەوەپەروەرانی کوردا، لەم سالّەدا پاش ئەوەی کە ئەنوەر پاشای دیکتاتۆر بووە سەرۆک وەزیرانی سوڵتان و ئەوپەڕی توندوتیژی دژی کورد و ئەرمەن دەستی پێ کرد و سالّی پاشیش ۱۹۱٤ جەنگی یەکەمی جیهانی دەستی پێ کرد و کوردیش ناچار کرا، کەم تا زۆر، لە پاڵ عوسمانییەکاندا بەدژی هاوپەیمانان بچێتە جەنگەوە و سەرەنجام بەشێکی زۆر لە خاکی کوردستان لە لایەن هێزەکانی بەریتانیا و فەرەنسا و ڕووسیاوە داگیرکرا.

پەراوێزو سەرچاوەکان

(۱) م.کاردۆخ، جنبشهای کرد (ازدیرباز تاکنون)، ستوکهولم ,۱۹۹۳

(۲) د.میهرداد ئێزەدی، ئاین و تایفە ئاینییەکان لە کوردستان، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە ۲۷، سلێمانی ,۱۹۹۸

(۳) م.کاردۆخ. هەمان سەرچاوە.

(٤) د.پیروز مجتهد زادە، هویت ایرانی در استانەی و سدەی بیست و یکم، مجلەی و اطلاعات سیاسی- اقتصادی شمارە ۱۲۹- ۱۳۰، تهران.

(٥) لە ئێراندا لەجیاتی وشەی گەل "الشعب" وشەی "میللەت" بەکار دەهێنن. لەڕاستیدا وشەی میللەت، وشەیەکی ئاڤێستاییە و مانای "القوم" دەدات. فارس و کوردی ئێران (گەل) لەجیاتی

نەتەوە بەکاردەهێنن، بۆ نموونە دەڵێن: میللەتی ئێران، میللەتێکی فرە گەلە یان وڵاتێکی فرە گەلە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە گەلی ئێران، گەلێکی فرە گەلە یان فرە میللەتە.

(٦) اریك هویز باوم، الامم والنزعة القومیة، ترجمة: عدنان حسین، دار المدی، ١٩٩٩

(٧) اریك هویز باوم، الامم والنزعة القومیة، ترجمة: عدنان حسین، دار المدی، ١٩٩٩

(٨) اریک هویز باوم، سەرچاوەی ناوبراو.

(٩) کریس کۆچێرا، جنبش ملی کرد، ترجمە: ابراهیم یونسی، تهران , ١٣٧٤

(١٠) هەمان سەرچاوە.

(١١) هەمان سەرچاوە.

(١٢) هەمان سەرچاوە.

(١٣) هەمان سەرچاوە.

(١٤) هەمان سەرچاوە.

(١٥) هەمان سەرچاوە.

(١٦) کریس کۆچێرا، هەمان سەرچاوە.

(١٧) کریس کۆچێرا، هەمان سەرچاوە.

# بەشی سێیەم

* شەڕی یەکەمی جیهانی و شکستی دەوڵەتی عوسمانی، هەلێکی گونجاوی بۆ ڕزگار بوونی نەتەوە ژێردەستەکانی ئەو ئیمپراتۆریایە، هێنایە ئاراوە. پاش شکستی عوسمانییەکان، بۆشاییەکی گەورە لە ناوچەکەدا دروست بوو، عەرەبەکان توانییان وەکو هێزی هاوکاری بەریتانیا دژی عوسمانییەکان، شۆڕشێکی گەورەی عەرەبی بەرپابکەن و ببنە هێزێکی گونجاو بۆ ئەنجامدانی کارەکانی بەریتانیا لە ناوچەی عەرەبی. بنەماڵەی هاشمی و بەریتانیا توانییان هەردووکیان کارێکی باش بەقازانجی هەردوو لا، دژی عوسمانییەکان، بگەیەننە ئامانج. لە لایەک عەرەبەکان بوونە هێزی ڕاپەڕێنەری ناوچەکە و یارمەتیدەری بەریتانیا دژی پیاوە نەخۆشەکە (عوسمانی!) و لە لایەکی دیکەش بەهۆی دەسەلاتی بەریتانیاوە توانییان لە چنگی عوسمانییەکان ڕزگاریان بێت.

ڕەوشی کوردان، بەتایبەتی لە کوردستانی باشوور بەپێچەوانەوە بوو، شێخ مەحموودی حەفید و هێزەکانی لەجیاتی عەرەب و عوسمانی و ئیسلام و چوونە شەڕی بەریتانیای نائیسلامەوە. لەکاتێکدا نەوەکانی پێغەمبەر و بنەماڵەی هاشمی، هاوکاری بەریتانیای نائیسلام بوون، چونکە بەرژەوەندی و سیاسەتیان وای دەخواست. بە بڕوای من کارێکی زۆر باشیان کرد و هەموو عەرەب هەتا ئێستاش قەرزاری دەوری ئەو بنەماڵەیەن و بەتایبەتی شەریفی کوڕی حسەین. هەڵوێستی بەریتانیا، پاش سەرکەوتن، پاداشتی بنەماڵەی هاشمی و سزادانی کورد دەبێت. لەم سەردەمەدا، کورد یەکەمین فرسەتی گونجاوی لەگەڵ بەریتانیادا لەدەست دا. فرسەتی دووەمیش، کە لە دەستی کورد چوو، دوای دامەزراندنی حکومەتی عێراق و بەتایبەتی لەدوای ساڵی ١٩٢١، کاتێک عەلی شەفیق «ئۆزدەمیر»ی جەنەڕاڵی سەر بە تورکی دۆڕاو لە جەنگی یەکەمدا، هاتە نێو کوردستانەوە و کورد جارێکی دیکە خۆی خستە پاڵ بەرەی دۆڕاوی جەنگ.

هەوڵەکانی شەریف پاشای خەندان لە کۆنگرەی ئاشتیی پاریس بەیەکێک لەکارە گرنگەکانی تێگەیشتن و سیاسەتی کوردی دەژمێردرێت. شەریف پاشا لەدوای ١٩١٤ لەگەڵ بەریتانیاییەکاندا پەیوەندیی دامەزراند و لەدوای تەواو بوونی جەنگ لە ٣ی حوزەیرانی ١٩١٨ لە مارسیلیا لەگەڵ سێر پرسی کۆکس، کۆمیسیۆری بەریتانیا و لێپرسراوی کاروباری مسیۆپۆتامیا دیداری کرد و داوای کرد کە بەریتانیامافی خۆبەڕێوەبردنی ناوچەیی بەکوردەکان بدات و بێ هیچ گومانێک ئەو ناوچەیەش بریتییە لە ویلایەتی موسڵ، هەرچەندە بەشێکی ئەو ناوچەیەش، بەپێی پەیمانی سایکس- پیکۆ ١٩١٦، دەبووایە بکەوتایە ژێر دەسەڵاتی فەرەنساوە. یەکێک لەو کارانەی شەریف پاشای خەندان، کە بەڕاستی جێگای نیگەرانی و ڕەخنەی کوردە، ئەوەبوو پاش پەیمانی شەڕ وەستانی مۆدرس ٣١ی ئۆکتۆبەری ١٩١٨ بەرەو سویسرا ڕۆیشت و لەوێ لە کۆنگرەی عوسمانییانی ئازادیخوازدا بەشداریی کرد و لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوە سیاسییەکاندا خۆی بە **قسەکەری مافی عوسمانییەکان، دەناساند.**
هاتوچۆی شەریف پاشا لەنێوان لەندەن و پاریسدا بەردەوام بوو. لەندەن، بە ساردی پێشوازیی لێ کرد و چونکە سیاسەتی شەریف پاشا، داواکاری خود موختاری کوردستان بوو لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا، لەکاتێکدا نیاز و سیاسەتی بەریتانیا بریتی بوو لە دابڕینی ناوچە غەیرە تورکەکان لە دەسەڵاتی عوسمانی (تورکیا). بەم شێوەیە، لە لەندەنیش، هەر وەکو باشووری کوردستان، سەرانی کورد نەیانتوانی وتار و سیاسەتێکی گونجاو و نزیک لە وتاری یەکەم زلهێزی دنیا (بەریتانیا) کە هێزی بڕیاردەر بوو لە جیهاندا، بەدەست بهێنن. پاش شکستی شەریف پاشا لەلای بەریتانیا و بەناچاری ڕووی کردە لای فەرەنسییەکان و لە پاریس بەگەرمی پێشوازی لێ کرا و هانیان دا کە "خوازیاری خودموختاریی کوردستان بێت، لەژێر چاودێریی فەرەنسەدا". ئەم کارەش، بێ هوودە بوو، چونکە دەمێک بوو بەریتانیا مرخی لەم ناوچەیەی کوردستان خۆش کردبوو، هەر کاتێک کە فەرەنسا دەیویست بۆ ئەم ناوچەیە و لەم ناوچەیەدا، بەرنامەی بۆ دابنێ، تەنها دەبووە هیوایەکی بێ بناغە و بێ ئەنجام. کارەکانی شەریف پاشا، هەر لە بەردەوامبووندا بوو. لە ٦ی شوباتی ١٩١٩ دەربارەی ماف و خواستەکانی خەڵکی

کوردستان، یادداشتنامەیەکی دا بەسەرۆک کلیمانسۆ، سەرۆکی کۆنگرەی ئاشتی، کە خوازیاری بەدیهێنانی کوردستانێکی ئۆتۆنۆم بوو کە لەم ویلایەتانە پێک هاتووە: دیاربەکر، خارپوت، بەدلیس، مووسڵ و سنجاقی ئۆرفە. لەم یادداشتەدا شەریف پاشا، نووسیبووی کە ئەمە لایەنی کەمی کوردستانە، چونکە "کوردستانی یەکگرتوو" دەبێت هەر لە ئەرزرۆم و کوردستانی ئێران و هەتا ئەو ناوچانەی کە ناویان هات، بگرێتەوە.

سەرەڕای هەموو کارەکانی شەریف پاشا لەنێوان سویسرا، پاریس و لەندەن، بەڵام بەریتانیا گوێی نەدا بەداواکارییەکانی و تەنانەت پاش ئەوەش کە لەگەڵ بۆگۆس نۆباری نوێنەری ئەرمەنییەکان لە پاریس ڕێکەوتنی ئیمزا کرد و نووسییان: دوو نەتەوە، کە هەردووکیان ئاری نەژادن و بەرژەوەندی هاوبەشمان هەیە و دەمانەوێت یەک ئامانج بەدی بهێنین، کە سەربەخۆیی و ئازادیمانە، بەڵام سەبارەت بەداوەری لەسەر ئەو شوێنانەی کە مایەی جیاوازیی نێوان کورد و ئەرمەنن و سنووری هەردووکیانن... ئێمە بەڕەسمی ڕای دەگەیەنین کە ئەم کێشەیە بەرەو ڕووی بڕیاری کۆنفرانسی ئاشتیی پاریس دەکەینەوە[٢]. هەرچەندە ئەرمەنەکان لە لایەن کۆڕ و کۆمەڵەکانی ئەوروپاوە پشتگیرییان لێ دەکرا، بەڵام ئەمانیش وەکو کورد، نەیانتوانی کار و ئایندەیەکی گونجاو بۆ پرسی نەتەوەیی خۆیان بەدەست بهێنن.

کۆنگرەی ئاشتیی پاریس و پەیمانی سیڤەر سێ ماددەی گرنگی بۆ چارەسەری کێشەی کورد دانابوو، کە ماددەکانی ٦٤،٦٣،٦٢ بوون، بەڵام دوو هۆی گرنگ نەیانهێشت ئەم بڕیارانە بەئاکام بگات و لەڕاستیدا هەر وەکو نووسەری فەرەنسی، کریس کۆچێرا دەڵێت: بەمردوویی لەدایک بوو، تەنها مەرەکەبی سەر کاغەز بوون. هۆی یەکەمی، بەدیهاتنی ئەم بڕیارانە، ناکۆکی نێوان باڵە سیاسییەکانی کورد و ساغ نەبوونەوەی کورد بوو لەسەر بەرنامەیەکی دیاریکراو و یەکگرتوو بۆ ئایندەی کوردستان. لەسەر داوای سەربەخۆیی یان ئۆتۆنۆمی لەگەڵ دەسەڵاتی عوسمانیدا، ناکۆکی گەورەیان لەنێو کوردا دروست بوو. دووەمیان، بەرپابوونی بزووتنەوەی نەتەوەیی و نەژادیی تورک بوو بەڕابەریی مستەفا کەمال (ئەتاتورک) کە توانیی لە مەیدان و لەسەر زەویی ژیان، نەک لەناو کاغەز و پەیماننامەکاندا، هەموو ڕەوشەکە

بەقازانجی دەسەلاتی کۆماری و دەوڵەتی ئایندەی تورک بگۆڕێت.

ئەمین عالی بەدرخان، یەکێک لە نەوەکانی بەدرخان پاشا، بە ڕابەر و قسەکەری باڵی سەربەخۆییخواز و پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی جیا لە دەسەلاتی عوسمانی ناسرا بوو. ئەو دەیویست بەسوود وەرگرتن لە بیر و باوەڕی ١٤ ماددەیی سەرۆک ویلسۆن، بۆ بڕیاردانی مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکان، لەناو ناوەندە سیاسی و فەرهەنگییەکانی کوردستاندا، لایەنگری بۆ سەربەخۆیی و بەدیهێنانی دەوڵەت بۆ کورد، پەیدا بکات.

بەلام، بەداخەوە ئەم هەڵوێستە ئازایە، دوو کۆسپی گەورەی بەرەو ڕوو بووەوە.

یەکەمیان، لە لایەن باڵی "فرسەت تەڵەب"[٣] بەڕابەری سیناتۆر عەبدولقادری شەمدینانی، کوڕی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری، کە ئەندامی ئەنجوومەنی پیرانی عوسمانی بوو، بەخراپ وەلام درایەوە. چاوپێکەوتنی عەبدولقادر لەگەڵ ڕۆژنامەی (الاقدام) لە ٢٧ی شوباتی ١٩٢٠: ڕێکەوتنی شەریف پاشا و بۆگۆس نۆبار هیچ گرنگییەکی نییە و گوتی تورکەکان هاودین و برایانی خۆشەویستی ئێمەن، سەبارەت بەوەی کە ئێمە هەموومان موسڵمانین، کینە و دوژمنایەتی لەنێوماندا نییە! ئێمە تەنها دەمانەوێت لە مافی گەشە و پێشکەوتنی ئازاد بەهرەمەند بین. دژایەتیی تورکیا بەهیچ شێوەیەک لەئێمەی کورد ناوەشێتەوە. پاشان کوڕی شێخی نەهری دەڵێت:

«ئەمڕۆ پێنج یان شەش ویلایەتی کوردنشین هەیە... ئەگەر دەوڵەتی عوسمانی بەم ویلایەتانە ئۆتۆنۆمی بدات، تا ئێمە بە یارمەتیی خەڵکی باش و دادپەروەر بتوانین بەرەو پێشی بەرین. هەر وەکو گوتمان ئێمە هیچ دوژمنایەتییەکمان لەگەڵ تورکەکاندا نییە، ئێمە ئەمانەوێت تەنانەت لە دەسەلاتی خودموختاری خۆشماندا تورک بەشداریمان بکەن»[٤].

شێخ عەبدولقادریش، هەر وەکو شێخ مەحموود، عەبدولقادر بەسیاسەت و شێخ مەحموود بەهێزی سەربازی خۆیان خستە پاڵ عوسمانیی دۆڕاو کە لە هەموو ئاسماندا ئەستێرەیان نەما بوو، لە کاتێکدا بزووتنەوەی نەتەوەیی تورک، بەهێزی عەشایەریی کوردەکان، لەگەڵ بەرنامەی سەردەمدا دژی عوسمانییەکان و سوڵتانی

کـۆشکی یەڵدز، کـەوتبـووە شـەڕێکی چالاک و سـەخـتـەوە و توانیـبـووی، هێـزی جەمـاوەری، کە دەبووایە لەگەڵ ڕابەرە کوردەکاندا بوونایە، بۆ سـوودی خۆیان بەدژی سـوڵتـان و بۆ ڕزگـاریی نـاوچەکـانی ژێر دەسـەڵاتی ڕووسـیـا، بەریتـانیـا و یۆنان، بەقازانجی دەوڵەتی تورکیای کۆماری، بەکار بهێنن.

ئەمـە دەمـانگەیەنێـتـە، هۆی دووەمی سـەرنەکەوتنی بەرنامـەی سـەربەخـۆیی و بانگەوازی پێکهـێنانی دەوڵەتی کـوردی، ئەویش ئەوەیە ئەم بەرنامـەیە نەیتـوانی هێـزێکی جـەمـاوەری و سـەربازی پەیدا بکات. لەکـاتێکدا بۆشـاییـیـەکی زۆر لە کـوردسـتـاندا پێکهاتبوو. لەو جێگایەی کە کـورد "باشـووری کـوردسـتـان" هێـزی جەمـاوەری و چەکداریی هەبوو، هەر زوو لەگـەڵ یەکەم دەسـەڵاتداری دنیـادا کـەوتە جـەنگەوە، کـە بەریتـانیـا بوو وە بووە یارمـەتیـدەری هێـزی دۆڕاوی جـەنگ کـە عوسمـانییەکان بوون. لەو جێگایەش، کە بەرنامەی سـەربەخۆیی کوردسـتان، سەری هەڵدا، واتە باکووری کوردسـتان، هێزی جەماوەری و چەکداری لەگەڵ ئەماندا نەبوو، بەڵکو لەگەڵ باڵی ڕزگاریخوازی تورک بوو بۆ پێکهاتنی دەوڵەتی کۆماری تورکیا. بەم شێوەیە لە کوردستانی بن دەسەڵاتی عوسمانی (هێشـتا بەشێک لە کوردسـتان لەبن دەسـەڵاتی ئێران دابوو) ڕەوشی کوردان بەم شـێوەیە بوو، کە بێگومـان ئاکامـەکەی هەر شکست و هەرەس و قـوربانیـدانی کـورد بوو. لە کـوردسـتـانی بـاشـووری سـەر بەویلایەتی مـووسڵ، هێـزەکانی شـێخ مـەحـمـوود لەگـەڵ هێزی بەریتـانیـادا کـەوتنە شـەڕەوە و پاشـان چوون ئۆزدەمـیـری سـەر بەتورکـیـان، هێنایە کـوردسـتـانەوە. لە باکـووری کـوردسـتـان، بەشـێکی کـاریگەر لە ڕابەرە کـوردەکـان داوای مـانەوەی عـوسـمـانی (کـە لەگـیـانەڵادا بـوو)یان دەکـرد و دەیان وت کـورد لەگـەڵ خـەلافـەتدا دەمـێنێتـەوە. لە پاریس شەریف پاشا خـۆی بەنوێنەری عوسـمـانییە ئازادیخوازەکان دەناساند، کوردستانی ئێران بەتەواوی دوور بوو لە چارەسـەر و ئاییندەی کوردستانی بن دەسەڵاتی عوسمانی، ئەوەی کە تەنها دەیویست ناسنامە و دەسەڵاتی سەربەخۆی کـــورد (لەو بگرە و بەردەیەدا) بەدەست بـهـــێنێت بـاڵێکی ڕابەرە کـــوردە (بـێ جەمـاوەرەکان) بوو، کە بێگومـان ئەویش، هەر وەکو ڕوونمان کردەوە، باڵی کـەمایەتی نێو کورد بوون.

ئێمه له لاپەڕەکانی پێشوودا، له بەشی دووەمی ئەم باسەدا، باسی سەردەمی بەدیهاتنی بزووتنەوەی نەتەوەییی کوردمان کرد و له هۆیەکانی شکستی ئەو بزووتنەوەیه، بەتایبەتی جووڵانەوەی بەدرخان و نەهری (١٨٤٣- ١٨٤٧) و (١٨٧٨-١٨٨٢)، چەند هۆکارێکمان باس کرد و پاشان لەدوای شکست، هەر وەکو کریس کۆچێرا دەڵێت: کوردستان (بەبێ سەر) مایەوە و بەتایبەتی لەدوای نەمانی میرنشینەکان له نیوەی دووەمی سەدەی نۆزده بەملاوە و ڕووخانی بزووتنەوەی ناسیونالیستیی کورد. بەبڕوای من، یەکێک له ڕەوشه کاریگەرەکانی کوردستان و وڵاتانی ژێردەستە، ئەوەیه که لەو وڵاتانەدا چینی ڕابەری سەردەم (بۆرژوازی) پەیدا نەبووە، که بێگومان ئەویش لەبەر هەلومەرجی داگیرکاری، چونکه داگیرکەران دەیانەوێت جەماوەری هەژاری ئەو وڵاته ڕاستەوخۆ لەژێر دەستی خۆیاندا بچەوسێننەوە، واته دەسەڵاتی داگیرکەران (لەسەدەی نۆزده بەولاوە) بەپلان و هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوام ڕێگەیان له پێگەیشتن و دروستبوونی چینی دەسەڵاتداری سەردەم، لەنێو کوردستاندا گرتووە. بەڵام بەدڵنیاییيەوە هەر له سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە، چینی چەوساوەی سەردەم کرێکاران و زەحمەتکێشان، وەکو بەشی زۆربەی کۆمەڵ له بندەستی دەسەڵاتی داگیرکەراندا ژیانی چەوساوە و کوله مەرگییان، درێژه پێ داوە. کورد له بواری فەرهەنگی، ئاینی و کۆمەڵایەتیشدا هەوڵی داوە وتارێکی گونجاو بۆ زەمینه سازکردن بۆ چوونه ناو قۆناغ و سەردەمی تازە، بەدی بهێنێت، بەڵام دەسەڵاتی گەورەی داگیرکەران، نەیهێڵاوە لەسەر ئەرزی واقیع ئەو چینه دەسەڵاتدار و سەرکردە نوییه بێته ژیانەوە. که بە وتەی مارکس: چینی بۆرژوازی دەورێکی لەڕادەبەدەر شۆڕشگێڕ و پێشکەوتووی له جیهاندا، بینیوە[٥]. ئەو کوردانەش، کە بەرەو دەوڵەمەند بوون و بۆرژوازی بوون دەچوون، بێگومان ڕوویان دەکردە پایتەخت و شارە گەورەکانی دەوڵەتی داگیرکەر، چونکه بەڕاستی هەلومەرجی سەرهەڵدان و گەشەکردنی سەرمایەداری له کوردستان بەتەواوی ڕێگەی لێ گیرا بوو، لەکاتێکدا دەوڵەتی داگیرکەر هەموو ئاسانکارییەکی بۆ مانەوەی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی (بەڵام بەمەرجی پاشکۆیی و نۆکەرایەتی بۆ خۆی) له کوردستاندا، دەکرد.

لەکاتی بەرپا بوونی جەنگی جیهانیی یەکەم و هەتا ساڵی ١٩٢١، واتە بۆ ماوەی ٧ ساڵ کورد و سەرانی کورد دەیانتوانی، سەبارەت بەپەیدا بوونی بۆشایی لە کوردستاندا، وەکو شۆڕشی گەورەی عەرەبی[٦] و بەرابەرایەتیی بنەماڵەی هاشمی، بتوانن لەگەڵ هێزە گەورەکانی جیهاندا (بەریتانیا) خۆیان رێک بخەن و بۆشایی "بێ سەر" بوونی کوردستان پڕ بکەنەوە، یان وەکو مستەفا کەمال و بزووتنەوەی تورکی سەربەخۆ و بەپشتیوانی هێزی جەماوەری وڵاتی خۆیان، دیسان ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە. بەڵام هەر وەکو باسمان کرد و سەبارەت بەو هۆکارانە، کە بەڕاستی هەموویان پێکەوە هۆکاری کاریگەر بوون. سەردەمی ئەو حەوت ساڵەی کە کوردستان بێ دەسەڵات بوو،، باشترین و زێرینترین سەردەم بوو بۆ ئەوەی کورد بتوانێت، هیچ نەبێت بەشێک لە وڵاتەکەی، کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، لەژێر ماندێتی «الانتداب» بەریتانیادا بەرەو دەوڵەتبوون بەرێت.

* لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و بەتایبەتی لە ساڵانی بیست بەدواوە، کورد بەرەو رووی هەلومەرجێکی زۆر نالەبار دەبێتەوە. لەم قۆناغەدا، کوردستان بەسەر چوار دەوڵەتی دیکەدا (واتە غەیرە کورد) دابەش دەکرێت و هەر بەشێک لە نیشتمانەکەی دەبێتە بەشێک لە وڵاتێکی دیکە. وتاری کوردی، فەرهەنگی کوردی، ئاوات و خواستی کوردی و تەنانەت کاریگەریی کوردی لەناو دینی ئیسلامیشدا بەرەو نەتەوەیی بوون و هەوڵدان بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی بوو، بەڵام، ئەمە وەکو بەشێک لە ئامانج و سەرخان، لەڕاستیدا لەواری کۆمەڵایەتی، ئابووری و تاڕادەیەکیش سیاسیدا، هێزێک نەبوو کە ئەو ئاوات و ئامانجە بەرەو ئاستێکی کردەیی «عملی» بەرێت و هۆی سەرەکیی ئەمەش ئەوە بوو کە کۆمەڵگای کوردەواری لەو سەردەمەدا و دوای رووخانی شۆڕشی نەهری و بەدرخان، بەبێ سەر مابووەوە. واتە بەهرەمەند نەبوو لە چینی سەردار و باڵادەستی ئەو سەردەمە کە دەیتوانی ئاڵوگۆڕ و بەرەو پێشەوە چوون لە بەرژەوەندی نەتەوەکاندا پێک بێنێت، کە بێگومان ئەویش چینی بۆرژوازییە. لەبەرامبەریشدا چینی کرێکاران نەیدەتوانی لە هەموو زەمینەکاندا (ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی) دەوری کاریگەر بنەخشێنێت و لەڕاستیدا بەشی هەرە زۆری خەڵک هەژار و زەحمەتکێش بوون و درێژەیان بەژیانی

کرێگرتەیی و کوله مەرگی دەدا، لەبن دەستی داگیرکەراندا.

دابەشکردنی کوردستان، بەسەر چوار دەوڵەتی نەتەوەی (فارس، تورک و عەرەب) و ئیقلیمی و نوێدا، کە ئەو دەوڵەتانە بێگومان لە ئیمپراتۆریاکان گچکەترن و دەتوانن دەستیان بگات بەهەموو شوێنەکانی ئەو وڵاتە، دامەزراندن و نوێکردنەوەی لەشکر و سوپاکانی ئەو دەوڵەتانە، پشتوانیی لەهێزە گەورەکانی ئەو سەردەمە (بەریتانیا، فەرەنسا و سۆڤیەت) لەو وڵاتانە و پاشان پەیدا بوونی چەکی نوێ و تەیارکردنی ئەو لەشکرانە بەو چەکانە، هەموو ئەمانە بزووتنەوەی کوردیان بەرەو رووی رەوشێکی بەتەواوی جیاواز و کاریگەر و دژوار کردەوە. بەبۆنەی بوونی ئەو هۆیانەی کە باسم کردن (بێگومان ئەو هۆکارانە لە سەردەمی پشێوی و نەخۆشی دوا سەردەمەکانی ئیمپراتۆریاکاندا سەریان هەڵنەدابوو، شانسی سەرکەوتنی بزووتنەوەی رزگاری و چەکدارانەی کوردی زیاتر بوو) شانسی سەرکەوتنی بزووتنەوەی رزگاری (چەکداری!) کوردی زۆر بەرەو کەمبوونەوە دەچوو. لەم سەردەمەدا دیسان و جارێکی دیکە (بەڵام زۆر خراپ) کورد پەنای بردەوە بەرچەک و هەڵایسانی شۆڕشی چەکداری سمکۆ، (١٩١٨- ١٩٣٠) حکومەتی کوردستانی جنووبی بەڕابەری شێخ مەحموودی حەفید (١٩١٩- ١٩٢٤)، شۆڕشی ١٩٢٥ی شێخ سەعیدی پیران، شۆڕشی ئاگری داغ ( ١٩٢٧- ١٩٣٠)و شۆڕشی دێرسیم ١٩٣٧و شۆڕشی بەرزان (١٩٣٢- ١٩٤٥) هەرچەندە ئەم شۆڕشانە وەکو کارێکی نەتەوەیی و هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی مافەکان، یان هیچ نەبێت وەکو بەرەنگارییەک بەدژی زوڵم و چەوسانەوە و هەڵاوێرکردن، بەڵام دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت، کە لەسەردەمی دەوڵەتی نەتەوەیی (ناوچەیی) و میلیتاریزمدا، هەڵگەڕانەوەی چەکداری گورزی کوشندەی لێ دەدرێت و ئەو ناوچەیەش کە شۆڕشەکەی تیادا بەرپاکراوە (کوردستان) تووشی وێرانکاری و سووتاندن دەبێت. یەکێکی دیکە لە بەدبەختییەکانی ئەو شۆڕشە (چەکداریانە) ئەوە بوو کە هێزە گەورەکانی دنیا بەپێی بەرژەوەندی خۆیان لایەنگری دەوڵەتە دابەشکەرەکانی کوردستان دەبن و دوژمنی ئەو شۆڕشانە. کارێکی دوژمنانە و ناکۆک بەو دەوڵەتانەی کە شۆڕشیان دژیان بەرپاکردووە و بەم کارەش دەبنە بزووتنەوەیەکی دەرەوە و یاخی لە یاسا «خارج عن القانون» و یاسای هیچ کام لە دەوڵەتانی دنیاش (کە بەشی کاروباری دەرەوە دەبێت بەرژەوەندییەکانی ئەو وڵاتانە

لەبەرچاو بگرێت) نایەوێ و ناتوانێت داکۆکی لەو بزووتنەوانە بکات، مەگەر بۆ خۆی ئەو دەوڵەتە، لەگەڵ دەوڵەتی ناوبراودا ناکۆک بێت و دیارە تەنها مەبەستی ئەو دەوڵەتەش بەکارهێنانی ئەو بزووتنەوانەیە بۆ مەرامی تایبەتی خۆی.

کورد دەیتوانی لە عێراق و لە ئێران، خەباتی خۆی بەئاراستەی خەباتی مەدەنی و سیاسیدا ببردایە، چونکە لەو وڵاتانە (لەو سەردەمەدا) ڕەوشێکی ئارام (نەک باش یان داواکراو) بەرامبەر بەکورد پیادە دەکرا، لە هەردوو ئەو وڵاتانەدا ژیانی پەرلەمانی و نوێنەرایەتی هەبوو، ڕێگە درابوو بە دەرچوونی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، ڕێگا درابوو بەدامەزراندنی پارت و سەندیکاکان، بێگومان کورد دەیتوانی لەو کەناڵانەوە خەباتی سیاسی و مەدەنی و نەتەوەیی خۆی بکات.

لەدوای دەسەڵاتدارێتیی دەوڵەتی پاشایەتی لە عێراقدا، بەشێکی کاریگەر لە سەرانی کورد، شێخ مەحموود و لایەنگرانی و پاشان بارزانییەکان، سەبارەت بەهەند نەگرتنیان بۆ سیاسەتی ئەو کاتەی دنیا، نەیانتوانی میکانیزمێک بۆ کاری خۆیان لەگەڵ دەسەڵاتی پاشایەتی و ماندێتی بەریتانیادا بدۆزنەوە. یەکەمین کار کە بزووتنەوەی کوردی کردی پەلاماردانی چەک و شۆڕشی چەکداریی نێو شاخەکانی کوردستان بوو. واتە پێکهێنانی ڕەوشێک کە بۆ کوردستان و بۆ عێراقیش نائاسایی بوو، هەرچەندە بەشێکی باشی دەسەڵاتی حکوومەتی عێراقی بەدەست کوردەوە بوو، بەڵام جووڵانەوەی چەکداری لێ نەگەڕا ئەو هەلومەرجە بەشێوەیەکی سیاسی و ئاشتی و بۆ بەرژەوەندیی کوردی بەکار بهێنرێ. ئەو کاتە زۆر لە پیاوە زانا و سیاسییەکانی کورد وەکو پیرەمێرد، تۆفیق وەهبی، ئەمین زەکی و سەعید قەزاز لەگەڵ ئەو بڕوایەدا بوون کە دەکرێت و دەتوانین ئێمەی کورد لەگەڵ دەسەڵاتی پاشایەتیدا ژیانێکی هێمن و ئارام بەسەربەرین و ئەوەندەی بۆمان دەکرێت بە مافەکانی خۆمان بگەین. مەبەستی من ئەوەیە کە نەدەبوو سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردی دژی ئاراستەی دەسەڵاتی دنیا کە بەریتانیا بەڕێوەی دەبرد ڕابووەستێت و دەیتوانی لەگەڵ ئەو ئاڕاستەیەدا خۆی بگونجێنێت و هەلومەرجێکی گونجاویش «مناسب» لەو وڵاتەدا بهێنێتە ئاراوە.

لە ساڵانی سی بەدواوە، هەر بەو جۆرە، بزووتنەوەکانی بارزانیش بەو ئاڕاستەیەدا

برا و بەردەوام ئەوانیش، هەتا ساڵی ١٩٤٥، بوونە هۆیەک بۆ زیاتر ناڵەبارکردنی ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کوردستان. هەڵوێستی من بەرامبەر بەو بزووتنەوانە ئەوە نییە کە نەدەبووایە ئەو جووڵانەوانە هەبن، بەڵکو لەوەدایە کە کورد دەیتوانی بەشێوەیەکی سیاسی (نەک چەکداری) خەباتی خۆی و داواکارییەکانی بەرەو پێش بەرێت و لەو بڕوایەشدام کە هەموو زەمینەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، حکوومەتی و فەرهەنگیی گونجاو بۆ بەرەو پێشەوە بردنی ئەو خەباتە لە گۆڕێدا بوو. من بڕوام وایە زۆر چاکمان کردووە کە بزووتنەوەیەکمان هەبووە بۆ بەدیهێنانی مافەکانی خۆمان و فراوانکردنی ئاست و چوار چێوەی داواکارییەکانمان، بەڵام خراپمان کردووە کە بزووتنەوەکەمان خستووەتە باری چەکدارانەوە و لەوەش خراپتر ئەوەیە کە هەموو بوونی کوردی و خەباتی کوردی و داواکاریی کوردیمان لە چەند هەزار چەکدارێکدا تەسک کردووەتەوە.

لە کوردستانی وابەستە بەعێراقەوە، لەکاتێکدا کە بزوووتنەوەی چەکداری هەبووە، بەردەوام یەکێک لە وڵاتە نەیارەکانی عێراق یارمەتیی ئەو بزووتنەوەی لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیدا داوە و بەمەش بزووتنەوەکە و بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکان دەبێتە بزووتنەوەیەکی دەرەوەی یاسا و شەرعیەت و ئەو حکوومەتەش (هەر بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکان) دەتوانێت بەوپەڕی هێزەوە ڕووبەڕووی ئەو هێزە و ئەو ناوچەیە ببێتەوە کە بزووتنەوە چەکدارییەکەی تیادا بەرپاکراوە، بێگومان لەڕەوشێکی بەو شێوەیە ناڵەبار، بیرکردنەوە لە خەباتی سیاسی و داواکاریی سیاسی و کۆمەڵایەتی و جەماوەری کارێکە و چاوەڕوان ناکرێت.

لە کوردستانی بن دەسەڵاتی ئێران، لەدوای کپبوونەوەی شۆڕشی چەکدارانەی سمکۆ (١٩١٨- ١٩٣٠) هەوڵ و بزووتنەوەیەکی وامان بەرچاو ناکەوێت کە بتوانێت لە بواری فەرهەنگی، سیاسی، کۆمەڵایەتیدا، کۆمەڵی کوردستان ڕابەرایەتی بکات و ناسنامەی کوردی لەو وڵاتەدا بەرەو باشتر بوون بەرێت. ئەگەر ئەوە بزانین کە سەردەمی پاشایەتی لە ئێران (١٩٢٥- ١٩٧٩) کورد دەیتوانی لە بواری فەرهەنگی ژ شارستانی و داواکاریی ئابووری و ژیانی پەرلەمانیدا بەشداری بکات و ئەو کاتە دەسەڵاتی شا بانگەوازی ئاریا میهری دەکرد و کوردیش زۆر چاک دەیتوانی وەکو

نەتەوەکانی ئاری سوود لەو هەلومەرجە وەربگرێت و بتوانێت لە پەنای ئەو ئاریایی بوونەدا، زۆرکاری یاسایی و شەرعی و سیاسی بۆ بەرژەوەندی خۆی بکات. بەڵام دیسان لە ١٩٤٥- ١٩٤٦، واتە دوای جەنگی دووەمی جیهان، کاتێک کە باکووری ئێران لە لایەن سۆڤیەت و باشووری لە لایەن بەریتانیاوە داگیر کرا بوو، بەڵام بە رەزامەندیی حکوومەتی ئێرانی لەناوەڕاستی ئێراندا "تاران"، کورد فرسەتێکی شۆڕشی چەکدارانەی بۆ هەڵکەوت و بە هاندانی شۆڤیەت و بەیارمەتی هێزە سەربازییەکەی بارزانییەکان (کۆماری کوردستانیان) ڕاگەیاند و لەناو چوارچێوەی ئێرانی شاهەنشاهیدا، کۆمارێکی کوردییان دامەزراند، ئەو دەمە کورد دەیگوت کە ئێمە نامانەوێت لە ئێران جیا ببینەوە و تەنها دەمانەوێت کە خۆمان حوکمی خۆمان بکەین، بەڵام ئەوەیان لەبیر چوو کە لە وڵاتێکی شاهەنشاهیدا، ناوچەیەکی کۆماری سەر بەو دەوڵەتە، مانای چی؟!

دڵسۆزی و فیداکاری و ڕۆمانسیزمی قازی محەمەد، لەدوای ئەوەی کە زۆر ئازایانە، دڵسۆزانە و ڕۆمانسییانە گەلەکەی خۆی بەجێ نەهێشت و ئێرانییەکان لەو شوێنەی (چوار چرا) کە کۆماری کوردستانی ڕاگەیاند، هەر لەو شوێنەدا لە سێدارەیان دا، بووە هۆی ئەوەی کە پاشان کورد (سەبارەت بەو فیداکارییە) دڵمان نەیەت کە ڕەخنە لەو شۆڕش و کۆمارە (ناوەختە بگرین!) و تا ئێستاش وەکو ڕەمزێک و بەشێک لە ناسنامەی کوردی شانازیی پێوە دەکەین و وێنایەکی ڕۆمانسی و کوردانەمان (لە قازیدا) بۆ ناسنامەی خۆمان، نەخشاندووە.

شەڕ و بەرگریی ئازایانەی مەلا مستەفای بارزانی، لە بەرامبەر هێرشی حکوومەتی عێراق، تورکیا و ئێران بووە داستانێکی گەورەی شۆڕش و شەڕی کوردی و سەرەنجام پەڕینەوەی بۆ سۆڤیەت و دیسان پابەند بوونەوەیەکی زیاتر بەئازایەتی و لەخۆبووردوویی، لە سەردەمی بوونی دەوڵەتە ناوچەییەکان و بەرژەوەندی ناوچەیی و جیهانی، لەسەر حسابی دڵسۆزی، فیداکاری و ئازایەتی کوردیدا (کە دەمێک بوو ئەو بەهایانە لە سیاسەت و بەرژەوەندیدا جێگایان نەمابوو). کۆماری مەهاباد و شۆڕشی کوردستان، و بەتایبەتی لەدوای ڕووخانی، بووە هۆیەک و بیانوویەک بەدەستی حکوومەتی شاهەنشاهیی ئیرانەوە کە پاشان لەگەڵ کوردا،

ڕەوشێکی نائارام پیادە بکات و کوردیش، هەتا ڕووخاندنی ئەو دەسەڵاتە، ژیانێکی گونجاوی بەخۆیەوە نەدی.

دوای ئاڵوگۆڕی ساڵی ١٩٥٨ و نەمانی دەسەڵاتی پاشایەتی و دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری لە عێراقدا، بۆ ماوەی ٣ ساڵ وەزعی کورد و خەباتی سیاسیی کورد بەرەو ئارامی دەچوو. لەبیرمان نەچێت کە گەورەترین دەسکەوتی ئەو کاتە، واتە ماددەی سێی دەستووری عێراقی کە دەڵێت: العرب والكرد شركاء في هذا الوطن، باشترین چەتر و چوارچێوە بوو کە کورد بتوانێت بەهۆیەوە بەشدارییەکی کاریگەر لە ژیانی سیاسیی عێراقدا بەقازانجی بەرژوەندییەکانی خۆی بکات. ساڵی ١٩٦١ بزووتنەوەی چەکدارانەی ئاغا و خاوەن موڵکەکانی کوردستان دژی سیاسەتی چاککردنی زەوی و کاروباری کشتوکاڵ، پەیدا بووەوە و پارتیش پاش چەند هەفتەیەک بووە بەشێک لەو بزووتنەوە و دیسان ڕەوشی کوردستان شێوایەوە. حکوومەتەکانی عێراق هەرچی لەدەستیان هاتبێت بەدژی بزووتنەوەی چەکداری و ئەو ناوچەیەی (کوردستان) ئەو بزووتنەوەیەی تیادا بەرپابووە درێغییان نەکرووە.

بە بڕوای من کورد و سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کوردی چ لە زەمانی پاشایەتی و چ لە زەمانی کۆماری، دەیتوانی بەشێوەیەکی سیاسی داواکارییەکانی خۆی بۆ پێشەوە بەرێت.

لەدوای هاتنی بەعس بۆ سەر دەسەڵات (١٩٦٣ و پاشان ١٩٦٨) ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە بەعسدا هەموو هێز و تینی خۆی دژی کورد بەکارهێنا و، بەعس دەبێت وەکو ئەنجامی بەرخوردی ناسیۆنالیزمیی عەرەبی بەرامبەر بەکورد حیسابی بۆ بکرێت، نەک وەکو سەرەتایەک. واتە ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە عێراقدا لە بوونی حیزبەکانی (الاستقلال، الوطني، الشعب، التجمع الوطني) بۆچوونێکی ئارامیان بەرامبەر بەکورد هەبوو لە کاتێکدا بەعس (وەکو ئەنجامێک کە بەشێک لە ئۆباڵەکەی وەبەر کورد دەکەوێت) حیزبێکی دڕندەی عەرەبی هەرچی لەدەستی هاتبێت دژی کورد درێغی نەکردووە. بزووتنەوەی کوردی توانیی بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠ (نەک ڕێکەوتننامە) بەدەست بهێنێت و دیسان هەلێکی گونجاو (نەک باش) بۆ خەباتی سیاسی و نەتەوەییی کورد هاتە ئاراوە. لەبیرمان نەچێت کە ئەو کاتە دەسەڵاتی

سۆڤیەت لە عێراقدا کاریگەر بوو، ئەمریکا وەزعی باش نەبوو سەبارەت بە عێراق، بەڵام دیسان سەرکردایەتیی کورد لەدوای ساڵی ١٩٧٥ کەوتەوە ناو بازنەی هێزە بێ دەسەڵاتەکان (مەبەستم دەسەڵاتی ئەوسای ئەمریکایە لە عێراق) و بەپێی پێداویستیی بزووتنەوەی چەکداری و بوونی شوێنێکی پشتی شەڕ کەوتینەوە داوی ئێران (کە وڵاتێکی ناکۆکە لەگەڵ عێراق) و بەم شێوەیە دیسان بووینەوە بەبزووتنەوەیەکی نایاسایی و کەوتینەوە ناو بازنەی مامەڵە پێکردنی دەوڵەتانەوە و سەرەنجامەکەی ڕێککەوتنی ئەلجەزائیر دژی کوردان بوو. ئەو دەسکەوتانەی کە کورد لە ساڵی ١٩٧٠ بەدەستی هێنا بوو، بریتی بوو لە شارەکانی سلێمانی، هەولێر و دهۆک و پاشان کەرکووک و خانەقین هاوبەش گەلێک زۆرتر بوو لەو فیدراڵییەی کە ئێستا بەدەست کوردەوەیە و تەنانەت لە سنووری ناوچەی حوکمی زاتی ساڵی ١٩٧٥یش کەمترە (مەبەستم سنووری زەمینیی ئێستای کوردستانی فیدراڵە).

بەم جۆرە و بەردەوام وەزعی لەباری کوردستانی باشوور، دوو لەسەر سێی هۆیەکەی لە ئەستۆی دەسەڵاتی بزووتنەوەی کوردیدایە (بەتایبەتی هەتا ساڵی ١٩٧٥ و دوای ئەو ساڵە کورد هیچ فرسەتێکی پێکەوە ژیانی ئاشتیی بۆ نەمایەوە سەبارەت بە بەهێزی و دڕندەیی دەسەڵاتی بەعس). لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە لەم وەزعە نالەبارەشدا، بەردەوام بزووتنەوەی کوردایەتی دوو بەش و چەند بەش بووە و ناکۆکی و یەکتر کوشتنی باڵەکانی کوردایەتی نەیهێشتووە لەناو خودی ئەو بزووتنەوەیەدا ڕەوشێکی ئارام و خەباتی سیاسی بەڕێوە بچێت. بەهۆی هەردوو هۆکارەکەوە (بزووتنەوەی چەکدارانەی و ناکۆکیی نێوان باڵەکانی ئەو بزووتنەوەیە) هەمیشە کەوتووینەتە بازنەی هێزە بێگانە و نامۆکان و گەمەمان پێ کراوە و لە بەرژەوەندی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان و هێزە گەورەکانی جیهان، بەکار هێنراوین.

سەردەمی هەڵوەشانەوەی خەلافەت و ڕاگەیاندنی کۆماری تورکیا لە لایەن مستەفا کەمالەوە، سەرەڕای ئەوەی کە کوردی دژی ئینگلیز و یۆنانییەکان بەکارهێنا، کە ئەویش سەبارەت بەنەبوونی ڕابەرانی هۆشیار و بەهێز لەنێو کورداندا، بەڵام بووە هۆی پچڕانی هەموو پەیوەندییەک لە نێوان کورد و تورکدا. پەیوەندیی دینی کە لەڕێگای خەلافەت و سوڵتانی عوسمانییەوە بۆ بەشێک لە کورد،

کە وەکو سەرچاوەیەکی دەسەڵاتی دینی بەحساب دەهات، بەردەوام هۆکارێکی گرنگی تێکشکانی کورد و شۆڕشەکانی بووە، لەم سەردەمەدا (سەردەمی کۆماری تورکیا) کۆتایی هات. باکووری کوردستان ئەو کاتە بەبەردەوامی (١٩٢١- ١٩٣٧) لە ڕەوشی هەڵگەڕانەوە و شۆڕشکردندا بوو. شۆڕشی کوردەکانی ئەستانبول (١٩٢١)، شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران (١٩٢٥)، شۆڕشی ئارارات (١٩٣٠) و شۆڕشی دێرسیم کە هەر یەکەیان بەجۆرێک دەبێت لێک بدرێتەوە و هەر یەکەیان لە شێوەیەک لە سیفەتەکانی بەهرەمەندن، بزووتنەوەی چەکدارانەی کوردی، بەرەو ڕووی ڕەوشێکی تراژیدیی زۆر گەورە کردەوە کە یەکێکیان سەرکوتی دڕندانەی دەوڵەتی نەتەوەیی و میلیتاریستی تورک بوو، ئەوی دیکەشیان گەمە و پیلانی نێودەوڵەتی هێزە گەورەکانی دنیا بوو دژی شۆڕشی ئەو نەتەوەیە.

شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە شوباتی ١٩٢٥، لەلایەن زلهێزەکانی دنیاوە هەر یەکە بەجۆرێک لێک درایەوە و مامەڵەیان پێ کرد. چاپەمەنییەکانی تورکیا ڕایان گەیاند کە تەواوی ناوچەکە لە دەستی کورداندایە و بزووتنەوەکە سروشتێکی دینی هەیە و ئامانجی ئەوەیە کە یەکێک لە کوڕەکانی سوڵتان عەبدولحەمید بخاتەوە سەر کورسی خەلافەت. دەسەڵاتی دەوڵەتی تورکیا و مستەفا کەمال، شۆڕشی پیرانیان کردە بیانوویەک بۆ لەناوبردنی ڕابەرانی جووڵانەوەی کوردی، جا لەم شۆڕشەدا بەشدار بووبن یان نا_ بزووتنەوەی چەکدارانەی ساڵی ١٩٢٥ بەرپابوو کە ئەندامانی کۆمیسیۆنی نێودەوڵەتی بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ و دیاریکردنی سنووری تورکیا- عێراق لە ناوچەکەدا بوون، هەر بەو بۆنەوە مستەفا کەمال دەیوت: (تورکیا لە مەترسیدایە، بەریتانیا لەپشت سەری کوردانەوەیە، دژی تورکیا لە کوردەکان سوود وەردەگرێت... پیاوانی بەریتانیا لە ناوچەکانی کورد دێن و دەچن، خێڵەکان چەکدار دەکەن و ئەوان هان دەدەن، بەریتانیا دەیەوێت مووسڵ و نەوتی ویلایەتی مووسڵ بۆ ئەو بێت، کلیلی مووسڵ و عێراق لە دەستی کوردانایە)(٧). هەر بۆیە دەوڵەتی تورکیا بەهەموو جۆرێک هەوڵی لەناوبردنی ئەو شۆڕشەی دا. فەرەنسییەکان دەیانوت: ئەم شۆڕشە بە پیلانی بەریتانیا هەڵایساوە، بەریتانییەکان دەیانوت بەیارمەتی فەرەنسا و سۆڤیەت بەرپابووە و سۆڤیێتییەکان

لەسەر زبانی ڕۆژنامەی ئەیزفستیا دەیانوت: ئەم جووڵانەوە چەکدارییە لەلایەن هێزی دەرەبەگ و دژە شۆڕشی کورد بەرپاکراوە کە بوونەتە ئامرازی دەستی بەریتانیا. بەم شێوە، شۆڕشی کوردستان، وێڕای دڕندەیی دەوڵەتی تورک، کەوتە گەمەی هێزە گەورەکانەوە و سەرجەم پیلانی هەموویان لەناویان برد و کوردیش جگە لە گیانبازییەکی ڕۆمانسی و تراژیدی هیچی دیکەی دەست نەکەوت، ئەوەی مایەوە سەروەرییەکی چەکداری و خۆبەختکردنی ڕابەرانی کورد و چوونە سەر پەتی سێدارە، بەوپەڕی ئازایەتی و قارەمانییەوە لە لایەن شێخی پیران و هاوەڵانییەوە.

شۆڕشی ئارارات (١٩٢٧- ١٩٣١) بەرەهبەریی کۆمیتەی «خۆیی بوون»، کە لە بەهاری ساڵی ١٩٢٧ لە دامێنی چیاکانی ئارارات لە لایەن نوێنەرانی چوار ڕێکخراوی نەتەوەیی کورد پێک هات. ڕێکخراوەکانی "پێشکەوتنی کوردستان- تعالی کردستان"، "ڕێکخراوی کوردستان- تشکیلات کردستان"، "نەتەوەیی بوونی کورد- ملیت کرد" و "کۆمیتەی سەربەخۆیی" بڕیاریان دا خۆیان لەناو ڕێکخراوێکی نوێ بەنێوی «خۆیی بوون» هەڵبوەشێننەوە. کۆمیتەی «خۆیی بوون» چەند گۆڕان و پێشڕەوییەکی نوێی بۆ جووڵانەوەی کورد هێنایە گۆڕێ کە تا ئێستاش لەناو بزووتنەوەی کوردیدا دەنگدانەوەی هەیە. یەکگرتنی چوار ڕێکخراوی سیاسی و فەرهەنگی و چەندین کەسایەتیی سیاسی و ڕووناکبیر لە ڕێکخراوێکی نەتەوەییدا، بۆ یەکەمین جار هەر بە هۆی «خۆیی بوون»ەوە بیر و باوەڕی پێشکەوتوو خواز و سۆسیالیستی لە چوار چێوەی ڕێکخراوێکی سیاسی هاتە ناو گۆڕەپانی شۆڕشی کوردەوە، «خۆیی بوون» بۆ یەکەم جار، ئاڵای کوردستانی بەڕەنگەکانی سوور، سپی، سەوز و خۆرێکی زەرد لە ناوەڕاستدا کردە ئاڵای کۆماری کوردستان. بانگەوازی کۆماری ئارارات بەیەکێک لەو کارانە دەناسرێت کە لێکدانەوەی تایبەت بەخۆی دەوێت. هەر وەکو باسمان کرد تورکەکان، فەرەنسییەکان و شورەوییەکان شۆڕشی پیرانیان بەدەرەبەگایەتی و یارمەتی بەریتانیا بۆ گێڕانەوەی خەلافەت بۆ تورکیا تاوانبار دەکرد، بۆیە خۆیی بوون ناچار بوو کەناوی "کۆمار" لە خۆی بنێت بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو بوختانانەی کە ڕەواییان دەدا بە سەرکوتی شۆڕشەکانی کورد لە لایەن تورکیا و بەیارمەتیی پیلانی نێودەوڵەتی. کارێکی شۆڕشی ئارارات هەوڵدانی

بەدەربەست بوو بۆ نەهێشتنی یەکجاریی دردۆنگ نێوان کورد و ئەرمەن و کارێکی وای کرد کە نەک هەر تەنها ئەرمەنەکان لایەنگری لە شۆڕشی کورد بکەن، بەڵکو یارمەتیی ئەوانیشی وەکو ڕێگاکانی پەیدا کردنی چەک مسۆگەر کرد. ئارارات لە بەرامبەر دەوڵەتەکانی ئێران، عێراق و سووریاش هەڵوێستێکی سیاسیی هۆشیارانەی نواند، بەوەی کە ئەم شۆڕشە دژی ئەوان بەرپا نەبووە و تەنها داواکاریی «خۆیی بوون» لەم وڵاتانە ئەوەیە کە مافی زیاتر بەکوردەکانی چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانە بدرێت. ئارارات سەبارەت بەوەی کە خۆی بیر و باوەڕی پێشکەوتنخوازی و سۆسیالیستی هەبوو، وای دەزانی کە شووروەویش یارمەتیی دەدا و بۆیە بنکەی بەرپاکردنی شۆڕشی بردە چیاکانی ئارارات بۆ ئەوەی "ناوچەی شۆڕشگێڕی چەکدار"ی خۆی لەو دەوڵەتە نزیک بکاتەوە. بەڵام ڕابەرانی ئارارات ئەوەیان لەبیر چوو بوو کە پەیماننامەی سۆڤیەت لە بەهاری ١٩٢١ لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی ئێران و تورکیا، کە یەکێک لە بەندەکانی ئەوەبوو کە دەبێت شووروەوی ڕێگە لە جیابوونەوەی بەشێک لەو وڵاتانە بگرێت و یارمەتی نەدات، کە بێگومان ئەو بەشەش کورد و شۆڕشی کوردی بوو. سۆڤیەتیش هەر وەکو فەرانسە، بەڵام بەنیاز و بەڵگەی جیاواز، فراوانبوونی بیری سەربەخۆیی کوردستانی بەپیلانێکی بەریتانی دەناساند، لە کاتێکدا بەریتانیا وەکو یەکەم زلهێزی دنیا، دەورێکی کاریگەری هەبوو لە دابەشکردنی کوردستاندا. بەم شێوەیە کورد لە هیچ کام لە هاوکێشە سیاسی و نێودەوڵەتییەکاندا جێگەی نەبووەوە و گەمەی پێ کرا و بوو بە قوربانیی بەرژەوەندی و پیلانی ئەو هێزە گەورانە، بەقازانجی سەرکوتی داگیرکەران دژی ئەو نەتەوەیە.

هەر سێ دەوڵەتی ئێران، تورکیا و عێراق بۆ دژ وەستانی شۆڕشی ئاگری داغ کەوتنە بەستنی ڕێکەوتنامە و پیلان دژی کوردان. ئێران دژی شۆڕشی سمکۆ و عێراق و بەریتانیا دژی شۆڕشی بارزان، بەڕابەریی شێخ ئەحمەد و تورکیاش دژی کۆماری ئارارات، بەو شێوەیە کورد بە شۆڕشی خۆی هەر سێ دەوڵەتی یەک خست دژی خۆی و تەنانەت چەند ساڵێک پێش پەیمانی سەعد ئاباد ١٩٣٧، کە لەو ساڵەدا ئەو سێ دەوڵەتە بەسەرپەرشتیی بەریتانیا دژی کورد و کۆمۆنیزم ڕێکەوتنیان ئیمزا کرد. ئەم شۆڕشەش هەر وەکو شۆڕشەکانی دیکە بووە قوربانیی بێ هێزیی ڕەهبەریی کوردی، گەمە و پیلانی نێودەوڵەتی هێزە گەورەکانی دنیا (بەریتانیا،

فەرانسە و شوورەوی) و درندەیی دەوڵەتە میلیتاریستە داگیرکەرەکانی کوردستان.

بێگومان لە ڕەوش و هەلومەرجێکی بەو شێوەیەدا، کە هیچ کام لە لایەنەکانی لە بەرژەوەندی شۆڕشی کوردیدا نییە و تەنانەت خودی بەرپاکردنی ئەو شۆڕشەش کە بێگومان لە ئاوەها هەلومەرجێکدا کە ئەنجامەکەی هەر شکستە، لە بەرژەوەندی ئەو نەتەوەیەدا نییە و سەرەنجام سەرکوتی زیاتر، داگیرکردنی زیاتر و سەپاندنی دەسەڵاتی سەربازی بەسەر کوردستاندا و پاشان فراوانبوونەوە و قووڵبوونەوەی پانتایی و قووڵایی شکستی کوردی دەبێت، بەشێک لە ئاسنامەی شۆڕشە چەکدارییە یەک لەدوای یەکەکانی کوردستان.

* لە سەرەتای ساڵی ۱۹۳۷ دەوڵەتی تورکیا یاسایەکی وای دانا کە هەلومەرجی سەرکوتی دەوڵەتیی دژی کوردان بەشەرعیەت دەناساند: دەزگای بەڕێوەبردنی ناوچەکانی کوردنشین وەستێنرا بوو، لەو ناوچانەدا حاڵەتی سەربازی و نائارامی ڕاگەیاندرا بوو، فەرماندە سەربازییەکانی تورک، بەدەسەڵاتی ویلایەتەکان دانرا بوون، دادگا ناوچەییەکان کە ئەوانیش هەر سەربازی بوون، دەیانتوانی مەرگ و سێدارەدان بەسەر خەڵکیدا جێبەجێ بکەن و دەسەڵاتی تەواویان بۆ کاروباری سەربازی درابوویە، جگە لەزمانی تورکی زمانەکانی دیکە یاساغ کرا بوون و تەنانەت کتێبی دەرەوەی تورکیاش قەدەغە کرا بوو.

سەید ڕەزای دێرسیم کە یەکێک بوو لە ڕابەرە گەورەکانی کوردە عەلەوییەکانی ناوچەی دێرسیم و ڕۆژئاوای کوردستان، لە دەسپێکی ئەم شۆڕشەدا بەیاننامەیەکی بڵاوکردووەتەوە، وەکو هۆکار و داواکارییەکانی بەرپا بوونی شۆڕش چاوی لێ دەکرێت کە تیایدا:

"ساڵەهایە دەوڵەتی تورکیا هەوڵی لەناوبردنی میللەتی کورد دەدا و لەم ڕێگایەدا هەموو جارێک پەنای بردووەتە بەر سەرکوتی خەڵکی ناوچەکە، زمان و چاپەمەنی و ئاخاوتن بەکوردی بەتەواوی قەدەغەکراوە، کۆچی زۆرەملێ و بەردەوام و ڕێکخراوی دەوڵەت و چۆڵکردنی ناوچە بەپیت و ئاوەدانەکانی کوردستان لە لایەن دەوڵەتەوە کارێکە کۆتا نایەت و کۆچاندنی خەڵکیش بێگومان بەرەو ناوچە ناخۆش و بێ پیتەکانی ئاناتۆلیا دەبێت. خەڵکی کورد

لەم کۆچەدا بێجگە لە هەژاری، مەینەتی و مەرگی بەکۆمەڵ هیچی دیکەی بەرنەکەوتووە و بۆیە ناچار بووە کە بەچەک داکۆکی لەخۆی بکات، هەر وەکو چۆن لە ساڵی ١٩٣٠ لە کێوەکانی ئارارات و دۆڵەکانی زیلان و بایەزید شۆڕشی هەڵگیرساند. ئێستا سێ مانگی بەردەوامە کە لە ناوچەی ئێمە جەنگی سەخت درێژە دەکێشی، وێڕای نایەکسانیی هێزەکان و چەکەکان و سوودی دەوڵەت لە فڕۆکە جەنگییەکان و بۆمبای سووتێنەر و وێرانکەر، من و هاونیشتمانانم پەلاماری هێزەکانی تورکمان ناکام هێشتووەتەوە. فڕۆکەکانی تورک لەبەرامبەر بەرگریی کوردە شەڕکەرەکاندا دێهاتەکان بۆمباران دەکەن و دەیان سووتێنن، ئافرەتان و منداڵانی بێ دیفاع شەهید دەکەن، دەوڵەتی تورکیا تۆڵەی شکستی خۆی بەم شێوەیە دەکاتەوە. زیندانییەکان پڕپڕن لە خەڵکی کوردستان، خوێندکارەکان بەدەسرێژی تفەنگەکان دەکوژرێن، یان بەداردا دەکرێن، یا بەناوچە دوورەکانی تورکیا نەفی دەکرێن. سێ ملیۆن کورد کە لە نیشتمانی خۆماندایین، خوازیاری هیچ نین، بێجگە لەژیانی ئاشتی و برایەتی و پاراستنی نەژاد، زمان، دابونەریت و فەرهەنگی خۆمان"[٨].

ئەوەی خوێندمانەوە، بەیانێکی ڕاست و دروستی هۆیەکانی هەڵگیرسانی شۆڕش بووە، زۆر جاریش، هەر وەکو هەموو شۆڕشەکانی سەدەی بیست، تەنها بەرگری لەخۆکردن بووە.

بەڵام سەرەڕای سەلماندنی هەموو ئەو ڕاستییانە دەبێت هۆی گەورەی شکستی بزووتنەوەی دێرسیم بزانین. پێش ئەم ڕاپەرینە، کوردستان، هێندە نەبوو لەحاڵەتی شۆڕشی شکست خواردووی ١٩٢٥ی پیران و ١٩٢٧- ١٩٣١ی ئاگری داغ هاتبووە دەرێ کە بێگومان ئامادەیی سەربازیی دەوڵەتی تورک بەدژی هەر کارێکی لەبابەتی شۆڕشی چەکدارانە، حاڵەتێکی سروشتیی ئەم حکوومەتە (میلیتاریستە!) دەبێت کە بەشێکی ئەو ئامادەییە سەربازییە، هەڵبەتە دژی کورد و شۆڕشی کورد دەبێت. دووەم، هەر ئەو توانا سەربازییانەی کە سەید ڕەزا دەربارەی دەوڵەتی تورک باسی دەکات بۆ خۆی دەتوانێت گورزی کوشندە لە بزووتنەوەیەکی چەکداری گەمارۆ دراوی وەکو (شۆڕشی دێرسیم) بدات و لەناوی بەرێت. بیرکردنەوە لە شۆڕشی چەکداری

لەم هەلومەرجەدا و بەبوونی ئەو دوو هۆکارەی کە باسم کردن، تەنها دەبێتە بەرەنگارییەکی بێ هیوا و بێگومانیش ئاکامەکەی هەر شکست دەبێت. سێیەم، دیسان ئەم شۆڕشەش لە پیلانی نێو دەوڵەتی کەمی نەبوو، هێزە گەورەکانی دنیا و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، هیچ کەمتەرخەمییەکیان دژی شۆڕشی کوردان نەکرد. ئەم ڕاپەرینەش بێجگە لەوەی کە یەکەمین ڕاپەڕینی کوردە عەلەوییەکانی تورکیایە، هەر شکست و تراژیدی بوو بە نسیب.

شۆڕشی پیران ۱۹۲۵ لە ناوەڕاستی باکووری کوردستان، شۆڕشی ۱۹۲۷-۱۹۳۱ ئارارات لەوپەڕی باکووری ڕۆژهەڵات و شۆڕشی دەرسیم ۱۹۳۷ لە ڕۆژئاوای کوردستانی باکور وێڕای ئەوە کە هەر یەکە لە یەکێک لە ناوچەکانی کوردستاندا بەرپابووە، بەڵام هەرسێکیان نەیانتوانی سەرکەوتنی بەرچاوی سەربازی بەدەست بێنن و هەریەکەیان نەیانتوانی کە لەچەند ساڵێک زیاتر بخایەنێت، هەرسێکیان لەگەڵ پیلانی دەوڵەتانی داگیرکەر و زلهێزەکانی دنیا بەرەوڕوو بوون، هەرسێکیان شکستی گەورە و تراژیدییان بۆ کورد بەجێ هێشت، هەرسێکیان بوونە هۆی بەهێز بوونی دەوڵەتی سەربازیی تورکی و سەرەنجام هەرسێکیان هەر وەکو شۆڕشەکانی سمکۆ، شێخ مەحمود و بارزان ناسنامەیەکی شکست و مەرگەساتیان بۆ کورد پێک هێنا و سەرەڕای ئازایەتی، گیانبازی و خۆفیداکاری ڕابەران و جەماوەریش (کە بێگومان دەرۆستی دەزگای سەربازی ئەو کاتەی دەوڵەتەکان نەدەهات)، بەڵام دیسان نسکۆ، نەهامەتی و ماڵوێرانی سەر گەلی کوردیان زیاد کرد.

ئەم سێ شۆڕشە و هەر وەکو شۆڕشەکانی دیکەی پارچەکانی کوردستان، بنکەی هەڵایسانیان هەر ناوچە شاخاوی لادێ نشین بوو، هێزی سەرەکییان بنەماڵە و خێڵە چەکدارەکانی کوردستان بوو، هەرچەندە یەکێک لە شۆڕشەکان «ئاگری داغ» ڕابەرایەتییە سیاسییەکەی بەدەست چەند ڕابەرێکی شاری و خوێندەوار و تەکنۆکراتەوە بوو، بەڵام سەرجەم هێزی شەڕکەریان لە خەڵکانی لادێ نشین بوو، بۆ چی دەبێت ئاوا بێت؟!

پاش شکستی شۆڕشە گەورەکانی ناسیۆنالیزمی کورد ۱۸٤۳- ۱۸٤۷ی بەدرخان و ۱۸۷۸- ۱۸۸۲ی نەهری، کوردستان بە "بێ سەر" مایەوە، واتە ڕابەرایەتییەکی

سەردەم نەبوو کە بتوانێت کوردستان بەرێتە قۆناغێکی دیکەوە. ئەو سەردەمە میرنشینەکان یەک لەدوای یەک، بەرەو نەمان چوون، هەرچەندە سەرخانی سیاسی و فەرهەنگی و دینی مژدەی هاتنی چینی نوێی "بۆرژوای نیشتمانیی "دەدا، بەلام هێز و کاریگەری و دەسەلاتی ئابووری داگیرکەران نەیهێشت لە واری ئابووری و کۆمەلایەتیدا، چینێکی لەو جۆرە بەدەسەلات و شارنشین لە کوردستاندا پەیدا بێت و تەنانەت ئەوانەش کە خاوەنی پارە بوون و لە شارەکانی کوردستاندا بوون لەبەر بێ ئارامیی سیاسی و سەربازی و لە لایەکی دیکەش لەبەر فشاری بەردەوامی داگیرکەران، کوردستانیان بەجێ هێشت و بەم شێوەیە شارەکان بێجگە لە ژمارەیەکی کەمی ڕووناکبیران نەیدەتوانی لە شۆڕشەکاندا بەشداری بکات و ڕێگا خۆش بوو بۆ دەسەلاتی لادێکان، خێلەکان و بنەمالەکان بەسەر شۆڕشەکاندا. لەڕاستیدا ئەمە ئەنجامێکی سروشتیی ڕەوشی ئابووری- سیاسی- کۆمەلایەتی ئەو کاتە دەبێت و ئەگەریش نوخبەی (کەمایەتی) سیاسی و فەرهەنگی و نەتەوەیی شارەکانیش جار بەجارێک دەسەلاتی شۆڕشیان بەدەستەوە بێت، بەلام دلنیابن کە هێزی کاریگەر و بەڕێوەبەری شۆڕشی چەکدارانە کوردستان، هەر لادێکان و چەکدار و پێشمەرگەکانی لادێ دەبێت.

کوردستان بەشی باکوور و ڕۆژهەلات، لە سالانی چل و پەنجا و شەست و حەفتاکاندا تاڕادەیەک بارێکی ئارامی بێ شۆڕش و بێ ماف و بێ ژیانێکی دیموکراسی و شایستە بە مرۆڤ لەو کاتەدا، بەخۆوە بینی و بێجگە لە بەردەوامکردنی ژیانی ژێردەستەیی هیچی دیکە زیاد نابێت بۆ نەتەوەکە و ناسنامەکەی لەم ٤٠ ساڵە و لەو دوو پارچەیەدا. بەلام باشووری کوردستان بەردەوام لە حالەتی شۆڕش و ڕاپەڕیندا بووە و هەرچەندە شکستی گەورەی سالی ١٩٧٥ کاریگەریی گەورەی کردە سەر تەواوی جوولانەوەی کوردی، بەلام چەند سالێک کەم دوای ئەوە، شۆڕشی نوێی باشوور و ڕۆژهەلات دەستی پێ کردەوە.

پەراوێز و سەرچاوەکان

(١) کریس کۆچیرا، جنبش ملی کرد، ترجمە، ابراهیم یونسی، تهران , ١٣٧٣
(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) هەمان سەرچاوە.

(٤) هەمان سەرچاوە.

(٥) ماركس، انجلز، البيان الشيوعي، موسكو، دار التقدم.

(٦) بەکارهێنانی (شۆڕشی گەورەی عەرەبی) وەرگیراوە لە سەرچاوە عەرەبییەکانەوە وەکو وەسف کردنی ئەو شۆڕشە یان (ئەو خۆڕێکخستنە) لە لایەن نەتەوەپەروەرانی عەرەبەوە. مەرج نییە من بڕوام وابێت.

(٧) کریس کۆچیرا، هەمان سەرچاوە.

(٨) کریس کۆچیرا، هەمان سەرچاوە.

مارسی ٢٠٠٢

# ڕەوشی جیهانی و پرسی کورد

خەباتی نەتەوەیی کورد، بۆ ڕزگاربوون لە داگیرکردن و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی کەوتووەتە ژێر کاریگەریی دوو هۆکاری گەورەو چارەنووسسازی نێودەوڵەتی و ناوچەیی، بەجۆرێک کە لەڕابردوو، ئێستاو ئایندەشدا دەتوانن دەوری بڕیاردەرو کاریگەریان هەبێت لەسەر پرسی ئەم نەتەوەیە. کاریگەریی جیهانی و ناوچەیی لەپرسی کوردی لە دوو سەردەمی زۆر گرنگ و چارەنووسسازدا دەوری زۆر گەورەیان بینیوە، یەکەمیان سەردەمی گەمارۆی سەپێندراوی هێزە ناوچەیی و جیهانییەکانە کە توانیویەتی بۆ ماوەی نزیکەی پێنج سەدە، واتە سالانی ١٥٠١- ١٩٩١ز، تەواوی خەبات و تێکۆشانی کوردی بخاتە ژێر کاریگەریی نیگەتیڤی خۆیەوەو بەئاشکراو ڕاستەوخۆ گورزی جەرگبڕ لە بزووتنەوەی کوردی بۆ ڕزگاری بوەشێنێت. لەم سەردەمەدا سەبارەت بەڕێکەوتن و پیلانی نێودەوڵەتی و ڕێکخستن و هێزی ناوچەیی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان، کورد نەیتوانیوە لەو گەمارۆ سەپێنراو و ئەو سنوورانەی کە هێزەکانی ناوچەیی و جیهان، کە بەبالای کوردیاندا بڕیبوو، ڕزگاری ببێت، چونکە زۆر بەسادەیی و ئاشکرا کورد نەیدەتوانی دەرۆستی ئەو گەمارۆیە بێت. سەردەمی دووەم، سەردەمی گرنگیدان بە پرسی کوردو خەباتی کوردانە لەلایەن هێزەکانی جیهانی و ناوچەییەوە، بەمەبەستی پڕکردنەوەی بۆشاییی دەرەوەی دەسەلاتی[1] ناوچەیی و جیهانی سەبارەت بەکوردو بزووتنەوەی کوردایەتی، وەکو بەشێک لەسیاسەت و ستراتیژی نوێی خۆیان بۆ کێشەی کورد. بەواتەیەکی تر ئەگەر سەردەمی یەکەم لەلایەن هەردوو هێزی جیهانی و ناوچەییەوە سیاسەتێکی دژ بەکوردو گەمارۆدانی کوردی هەبوو، ئەوا لەم سەردەمەدا (کە لە ساڵی ١٩٩١ بەدواوە دەست پێدەکات و تا ئێستا بەردەوامە) سیاسەتێکی کوردی و گرنگیدان بەکوردستان لەلایەنی هێزی جیهانی بڕیاردەرو هێزی ناوچەیی و ئیسلامی دژ بەهێزو سیاسەتی جیهانی بەرچاو دەکەوێت.. بۆ زیاتر ئاشکراکردن و

ڕوونکردنەوەی ئەم باسە، وای بەباش دەزانم کە هەردوو سەردەمەکەی خەباتی کوردی بۆ ڕزگاری و ڕەوش و سیفەت و کاریگەرییەکانی ئەو دوو سەردەمە فراوانتر باس بکەم:

**سەردەمی یەکەم**، سەردەمی گەمارۆی جیهانی و ناوچەیی دژی بزووتنەوەی کوردی (١٥٠١- ١٩٩١)

پاش دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی (١٥٠١- ١٧٢٢)و پەیدابوونی هێزێکی ئیسلامی شیعە مەزهەبی ئێرانی و هەوڵی ئەو دەوڵەتە لاوە بۆ گەشەکردن و فراوان بوون و بەرەو پێشەوەچوون، بۆ بوون بە هێزێکی ئیمپراتۆری و ناوچەییی کاریگەر، یەکەمین پریشکی وەبەر کوردی نزیکی خۆیان و کوردی بەنەژاد ئارییایی کەوت. ئەو کاتە بەشی زۆری کورد لەسەر مەزهەبی سوننە بوون و ئەمەش لەگەڵ هەوڵ و ئاواتی سەفەوییەکان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی شیعەو ئێرانیدا نەدەهاتەوە، یەکەمین بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ کوردەکاندا بەرپا بوو، هەوڵی شا ئیسماعیلی سەفەوی و دەوڵەتەکەی بۆ داگیرکردنی کوردستان و بە زۆر بەشیعەکردنی خەڵک و دروستکردنی پەرژینێکی مەزهەبی دژی دەوڵەتی بەهێزو دەسەلاتداری سوننە مەزهەبی عوسمانی، وای دەخواست کە سەرەتا ئەم بەرەنگارییە بکەوێتە کوردستانەوە، چونکە تەواوی سنوورەکانی نێوان عوسمانی (سوننی)و سەفەوی (شیعە) لە کورد پێک هاتبوو.

کورد و سەرانی میرنشینە کوردییەکان، یان دەبوو تەسلیم ببن بە مەزهەبی شیعەی ئێرانی یان دەبوو بەردەوام بن لەسەر سوننی بوونی خۆیان و ببنە هێزێکی یەدەک و شەڕکەری عوسمانی دژی ئێرانی هاونەژادی خۆیان. هێرشی دینی ئیسلام و خەلافەتی ئیسلامی یەک لەدوای یەک بەجۆرێک کوردی لەبەر یەک ترازاندبوو و هەڵوەشاندبوو، کە کورد بەهۆی زمان و نەژادی بەشێک بوو لە میللەتانی ئاریانی (ئێرانی)و بەهۆی دینیشەوە بەشێک بوو لە درێژکراوەو قەڵەمڕەوی دەسەلاتی عوسمانی سەرەنجام سەرانی میرنشینە کوردییەکان بەهۆی مەلا ئیدریسی بەدلیسی سەر بەسوننەی عوسمانی و شێخی تەریقەتی نەقشبەندی بەرەو عوسمانییەکان ساغ بوونەوە. واتە کورد سیاسەتێکی دینی و ئیسلامی (سوننەتی)

گرته بەرو، کە بێگومان نەیدەتوانی وا نەکات. چونکە ڕەوشی ئەو سەردەمە ڕەوشێکی دینی و ئیمپراتۆری بوو، واتە کورد نەیدەتوانی سیاسەتێکی جیا لە سیاسەتی ئیسلامی هەبێت و سەرەنجامیش زیانی گەورەو کۆیلەبوون بوو بەنسیبی کوردان. سوڵتانی عوسمانی لەدوای جەنگی چاڵدێران، لەگەڵ شانزە کەس لە میرانی کورد، پەیمانێکی بەست کە تیایدا، مافی دەسەڵاتداریی ئەوانی بەشێوەی خودموختاری هەر لە مەلاتیەوە هەتا دەریاچەی وان بەرەسمی ناسی و لەم پەیمانەدا، چوار مادەی گرنگ و کاریگەری (بۆ عوسمانی و بۆ کورد) تێدابوو:

١- دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانی کورد، سەربەخۆیی خۆیان دەپارێزن.

٢- شێوەی دەسەڵاتداریتی پشتاوپشت دەبێت، واتە لەدوای باوک کوڕەکان دەچنە سەر دەسەڵات،

٣- کوردەکان دەبێت لە هەموو جەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بەشداربکەن،

٤- دەوڵەتی عوسمانی لە بەرامبەر بە دەستدرێژی دەرەکی دژی دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانی کوردستان، یارمەتیدەر دەبێت.[٢]

ئەگەر بەچاوێکی ورد تەماشای ئەم ڕێکەوتنە بکەین تەنها خاڵی یەکەمی لە بەرژەوەندی کوردا بوو (کە ئەویش بێگومان زۆری تەخایاند، چونکە ئەم ڕێکەوتنە لە ساڵی ١٥١٤دا مۆرکراو لە ساڵی ١٥٣٠ بەدواوە سوڵتانی عوسمانی دەستی کرد بە لێدانی میرنشینە کوردییەکان و یەک لەدوای یەک لەناوی دەبردن)و خاڵی دووەمیش لە بەرژەوەندی سەرانی کوردو بنەماڵەکانیاندا بوو (ئەو سەردەمە سەردەمی دەسەڵاتی بنەماڵەو دینە یان مەزهەب، واتە بناغەی ڕەوایی دەسەڵات، چ میرنشینی یان ئیمپراتۆری، بنەماڵە بەهێزە دەسەڵاتدارەکان و پشتیوانیی دین یان مەزهەبەکانە بۆ ئەو دەسەڵاتە). بەڵام خاڵی (٣)و (٤) کە بەمەبەستی سەرەکیی ئەم ڕێککەوتنەیە، بەتەواوی لەبەرژەوەندی دەوڵەتی عوسمانیدایە، دەوڵەتی عوسمانی لەم ناوچەیەدا کە کوردی تێدا نیشتەجێیە، شەڕەکەی تەنها لەگەڵ ئێراندایە، کە بێگومان کوردەکانی ڕۆژئاوای ئێران یەکەمین خەڵکن کە ڕووبەڕووی شەڕ دەبنەوەو لە ڕاستیدا تەواوی جەنگی ئێران و عوسمانی کەوتە ناوچە کوردنشینەکانەوە، کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی عوسمانی کران بەگژ کوردەکانی ڕۆژئاوای ئێراندا، زۆرینەی کوردیش لەلایەن

عوسمانییەوە کرا بەگژ ئێراندا. من بۆیە ئەم خاڵە دەوروژێنم چونکە کاتێک کە کورد دەکرێت بەگژ ئێراندا، بێگومان دەکرێت بەگژ سەرچاوەکانی ئێرانی و ئاریانی بوونیشدا هەر لە زمان، فەرهەنگ، دین، خاک و شارستانی کە هەموو ئەم سەرچاوانە تا ئەوکاتە سەرچاوەی هاوبەشی نێوان کورد، ئێران بوون، بەم جۆرە کورد کرا بە گژ بەشێک لە سەرچاوەکانی بوونی خۆیدا، سەرەنجام، کورد بێبەری دەبێت لە بوونی تا ئەوکاتەی خۆی، ئەم جارەش وەکو جارەکانی پێشوو کورد بێبەش دەبێت لەناسنامەی خۆی و لەئێراندا دەکرێتە کەمایەتییەکی دوژمن بەزۆرایەتیی شیعەی ئێرانی و لەمەودوا (لە ساڵی ١٦٠٠ بەدواوە) کۆچی زۆرەملێ و ئەنفالی کوردی لەلایەن شاعەباس و دەوڵەتی سەفەوی دەست پێ دەکات. هەر بەو جۆرەش کورد لەلای عوسمانی دەبێتە کەمایەتی و سەبارەت بە بەهێزی و زەبرو زەنگی عوسمانی کورد ناچاردەکرێت لەبەردەستی نەژادێکی جیاواز، بێگانە و دوژمندا، ژیانی کۆیلەیی و ژێردەستی بەسەربەرێت، هەرچەندە ئەمە یەکەم جار نەبوو کە کورد سیاسەتێکی ئیسلامیی پەیرەو دەکرد، لە راستیدا لەهەردوو لای عوسمانی و سەفەویدا بەسەریا سەپێنرابوو، بەڵام گەورەترین زیان و کاریگەریی نێگەتیفی درێژ ماوەی بۆ کورد بەدیاری هێنا.

پاشان عوسمانییەکان کوردەکان، دەکەنە پرد و سەرەرێگای داگیرکردنی جیهانی عەرەبیش، واتە لە دوای ساڵی ١٥١٦ بەدواوە (دوای رێککەوتن و دابەشکردنی کوردستان لە ١٥١٤دا) هێرشی عوسمانی بەپشتیوانیی کورد (بەپێی خاڵی سێی پەیمانی ناوبراو) بۆ داگیرکردنی وڵاتانی عەرەبی دەست پێ دەکات. ئەم دوو دەوڵەتە گەورەیەی جیهانی ئیسلام، سەرەرای ئەوەی کورد دابەش و کۆیلە دەکەن لەنێوان خۆیاندا، دەبنە دوو زلهێزی ناوچەیی و هەر بەو بۆنەیەشەوە، دەتوانن لە هێزو بەرژەوەندی جیهانیشدا دەورو کاریگەرییان هەبێت و سەرەنجام رەوشی ناوچەیی و جیهانی بەئارەزووی ئەم دوو دەوڵەتە دەبێت بەدژی کورد. هێزو دەسەڵاتی هەردوو دەوڵەت و ئیمپراتۆریی ئێرانی و عوسمانی تەواوی رەوشی ناوچەکەی گۆری و دەوڵەتی عوسمانی توانیی بەشێکی زۆری ناوچەی ئیسلامیی رۆژئاوا، بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و دەوڵەتی سەفەویش بووە هێزێکی ئیسلامی دژ بەعوسمانی لە

جیهانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا. بەڵام وێڕای هێزو دەسەڵاتی جیهانی و ناوچەیی ئەم دوو ئیمپراتۆریایە، بە شۆڕش و ڕاپەڕینی کوردی بۆ بەدەستهێنانی مافەکان هەر بەردەوام بووە. کاتێک میرنشینێک دەڕووخا، لە شوێنێکی دیکەی کوردستاندا میرنشینێکی دیکە پەیدا دەبوو، لەو سەردەمانەدا هەمیشە دەسەڵاتی ناوچەیی لە وڵاتی کورداندا هەر بەردەوام بووە.

ئەم ڕەوشە ئاماژە بۆ دوو هۆی گرنگ دەکات: یەکەم، هێزو دەسەڵاتی ئەو دوو ئیمپراتۆریایە نەیان دەهێشت میرنشینە کوردییەکان لەوە زیاتر گەشە و فراوان ببن کە هەڕەشە لە دەسەڵاتیان و هەژموونیان لە کوردستاندا بکەن و دووەم، وێڕای هێزی ئەمان، بەڵام بەرهەنگاریی کوردی بەجۆرێک بووە کە هەمیشە دەسەڵاتی سەربەخۆ یان نیمچە سەربەخۆ لە کوردستاندا هەبووەو بەردەوام کورد لە هەوڵی دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆیدا بوون. بۆیە ئەم قسانە دەکەم، چونکە لە جیهانی ژێردەسەڵاتی سەفەویدا تەنها کورد میرنشینی هەبووەو لەجیهانی ژێردەسەڵاتی عوسمانیشدا کورد (لەم دواییانەشدا میسر، واتە لە سەدەی نۆزدە بەدواوە) دەسەڵاتی خۆیان هەبووەو سەرجەمی ناوچەو وڵاتانی دیکە ڕاستەوخۆ لەلایەن ئەو دوو ئیمپراتۆریایەوە بەشێوەی ویلایەت، فەرمانڕەوایی کراوە دیسان نابێت ئەوەشمان لە بیر بچێت کە بەردەوام دەسەڵات و هەژموونی جیهانی و ناوچەیی لە بەرژەوەندی ئەو دوو دەوڵەتەداو لە زیانی کێشەی کوردیدا، بەئەنجام گەیشتووە.

دوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی پاش ئەوەی دەبنە دوو زلهێزی ناوچەیی و دوو هێزی کاریگەری گرنگ لەسەر ڕەوشی جیهانی و سەرەنجام ونبوونی بەرژەوەندی کورد لەو نێوانەدا، واتە تەنها خوێندنەوەی بەرژەوەندی هێزە گەورەکانی دنیا (ڕووسیا، بەریتانیا، نەمسا، فەرەنساو پاشانیش ئەڵمانیاو ئەمریکا)و بەرژەوەندی دوو زلهێزی ناوچەیی ئیسلامی (سوننە و شیعە)و قوربانیدان بە بەرژەوەندی کورد، دەبێتە ڕەوشێکی بەردەوام و دەسەڵاتدار بەسەر بەرژەوەندی و هێزی جیهانی و ناوچەییدا، ئەم ڕێکخستنە، پیلانە، ڕەوشە نێودەوڵەتی و ناوچەییە بەردەوام دەبێت و ئەو گەمارۆ جیهانییەی بەسەر کوردا دەسەپێت و ئەم هەلومەرجە هەتا سەردەمی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بەردەوام دەبێت.

# سەرهەڵدانی بزووتنەوەی نەتەوەییی کورد

بزووتنەوەی نەتەوەییی کورد، لە ساڵی ١٨٤٣ بەدواوە لە سەردەمی باوکی ناسیۆنالیزمی کورد (بەدرخان پاشا) دەست پێ دەکات.[٣] ئەم بزووتنەوەیە گەلێک هێزو توانای گەورە پەیدا دەکات و بەشی هەرە زۆری کوردستانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی ڕزگار دەکات، بەلام یارمەتی و هاوکاریی هێزە جیهانییەکان (ڕووسیا، بەریتانیا، نەمسا و ئێران) بۆ دەوڵەتی عوسمانی بەدژی بزووتنەوەی بەدرخان بەبیانووی پشتیوانی لە ئەرمەنییەکان دژی کورد، گورزی کوشندەی گەیاندە بزووتنەوەی کوردی.

بەشی زۆری زانستکاران و لێکۆڵەرەوەکان لەسەر ئەوە هاوڕان کە کارە گرنگەکانی بەدرخان پاشاو ڕاپەڕینی کوردستان کە بریتین لە(لێدانی سکەی پارە، هەڵکردنی ئالای سەربەخۆی کوردستان، دامەزراندنی لەشکری ڕزگاری، نەدانی باج بە بابی عالی، جیاکردنەوەی سنووری کوردستان، خوێندنەوەی وتاری هەینی بەناوی پاشای کوردستان بەدرخان، چوون یەک کردنی هاوولاتییان و نەهێشتنی سیاسەتی جیاکردنەوەو هەلاواردنی عوسمانی لەنێوان ئیسلام (پلەیەک)، مەسیحی (پلە دوو)، جوولەکە (پلە سێ)و بەدرخان ڕای گەیاند کە هەموو هاوولاتییان پلە یەکن و لە ماف و ئەرکدا یەکسانن) بەباشترین بەیاننامەی ناسیۆنالیزمی سەربەخۆخوازی کوردی دادەنرێت. لەکاتێکدا دەبێت ئەوە بزانین کە ئەم بزووتنەوە کوردییە، زۆر لەپێش بزووتنەوەی نەتەوەییی ئیتالیا (١٨٦٠)، بزووتنەوەی یەکخستنی ئەڵمانیا (١٨٧٠)و یەکێتی ئەمریکا (١٨٦١) بوو کە ئەمەش هێزی بزووتنەوەی کوردی لەو سەردەمەدا پیشان دەدات. بەلام یەکێک لە کارە خراپەکانی بەدرخان، بەداخەوە لێدانی مەسیحییە ئەرمەنییەکان بوو کە باشترین بەهانەی دایە دەستی ولاتانی ئەوروپایی کە پشتیوانی لە دەوڵەتی عوسمانی بکەن دژی کورد کە ئەوان (ئەوروپییەکان) لە خوایان دەویست بەدرخان و کورد ئەو سیاسەتە ئیسلامییە هەڵەیە پیادە بکەن بۆ ڕەواییکردنی دژایەتی کوردی و سەرەنجام سەپاندنەوەی پیلانی نێودەوڵەتی و بەهێزکردنی گەمارۆی جیهانی و ناوچەیی دژی کوردو لە بەرژەوەندی عوسمانی و جیهانی.

بزووتنەوەی نەهری (١٨٧٨- ١٨٨٢)یش هەر بەو شێوەیە، وەکو بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی و سەربەخۆیی خواز (بێگومان ئەم جارە بەبێ پیادەکردنی هەڵەکەی بەدرخان و هەوڵدان بۆ گرتنەبەری سیاسەتێکی دینیی جیاواز لە عوسمانی و ئێرانی و بەئاشکرا ڕاگەیاندنی شێخ عوبەیدڵلای نەهری کە ئەم نەتەوەیە لەهەموو شتێکدا جیاوازە لە عوسمانی و ئێرانی، لە زمان، فەرهەنگ، خاک، دابونەریت و تەنانەت لە دینشدا جیاوازین لەوان کە مەبەستی شێخ لەوەبوو کە کورد پەیڕەوی لە تەسەوفی کوردی دەکرد، وەکو ئیسلام بوونێکی کوردی یان پاراستنی ناوەڕۆکی ئاینی کورد لەناو ئیسلامدا)[٤] لەلایەن پیلان و بەرژەوەندی نێودەوڵەتی و ناوچەییەوە لەناودەبرێت و هەموو هێزە گەورەکانی ئەوسای دنیا (بەریتانیا، ڕووسیا، نەمسا، ئێران و ئەمریکا) بەئاشکرا و ڕاستەوخۆ کەوتنە پیلان گێڕان بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کوردی. زۆرێک لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە سەرەتای ڕێککەوتن و پەیمانی ئەمریکی و ئێرانی لە ساڵی ١٨٨٢دا لەسەر حیسابی جەستەی برینداری شۆڕشی کوردی بوو[٥].

## سەردەمی ئیمپریالیزمی ئەوروپی

ئەم ڕەوشە بەردەوام دەبێت هەتا سەردەمی هاتنی ئیمپریالیزمی ئەوروپی بۆ ناوچەکە و دەستپێکردنی پیلان و ڕەوشێکی نوێ، بەڵام بۆ کورد هەر هەمان ڕەوشی دژ بەکورد (واتە کۆن) لە ساڵانی نێوان ١٩١٨- ١٩٩١ هەر بەشێوەی جاران، واتە گەمارۆی جیهانی و ناوچەیی دژی کورد و بەقازانجی بەرژەوەندی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان، بەردەوام دەبێت. سەردەمی هاتنی ئیمپریالیزمی ئەوروپی (بەریتانی و فەرەنسی)و دروستکردنی چەندین دەوڵەتی بەناو نەتەوەیی (تورکیا، ئێران، عیراق، سووریا)و چەندین دەوڵەتی عەرەبی و دیسان دابەشکردنی کوردستان و هێنانەدی پیلانێکی نوێی جیهانی و ناوچەیی، بەشێوە نوێ و بەناوەڕۆک کۆن (سەپاندنەوەی ئابلۆقەی جیهانی و دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان).

بەرژەوەندی دەوڵەتانی ئیمپریالیست و تیۆری دەوڵەتی نەتەوەیی ئینگلیزی و فەرەنسی و هەوڵی ئەوان بۆ دامەزراندنی چەندین دەوڵەتی دەستکردی وابەستە

بەخۆیان لەسەر حیسابی بەرژەوەندی کورد و نەتەوەکانی ئەمازیگ، قبتی و باشووری سوودان، ولاتانی ئەورووپی لەو کاتەدا سیستەمێکی دەوڵەتیی دروستکراویان هێنایە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئەم ناوچانەیان کرد بەچەند دەوڵەتێک کە تا ئێستا هیچ کامیان نەیانتوانیوە بگەنە ئاستی نەتەوەیی بوون[٦]. لەم سەردەمەدا پاش ئەوەی جارێکی دیکە کورد لەلایەن دەوڵەتانی گەورەی ئەورووپییەوە دابەش کرایەوە، بۆ چوار پارچەو دیسان ڕووبەڕووی ئابلوقەیەکی بەهێزتر بوویەوەو ڕەوشەکەی بەجۆرێک گۆڕانی بەسەرداهات کە بەڕاستی کورد، بەبێ پشتیوانیی هێزی جیهانی و ناوچەیی لەو هاوسەنگییەی کە بەسەر ناوچەکەدا سەپێنرابوو، نەیدەتوانی ڕزگاری ببێت. ئەمجارەیان کوردیان دابەش کرد بەسەر چەند دەوڵەتێکدا، کە وێڕای ئەوەی خاوەنی سەروەری و سەربەخۆیی خۆیان بوون، بەلام هەر یەکێکیان لەلایەن هەژموونی یەکێک یان زیاتر لە دەوڵەتە گەورەکانەوە دەپارێزرا، کە ئەویش لەپێناوی بەدیهێنانی جۆرێک بوو لە هاوسەنگی و جێگریی بەرژەوەندییەکانی نێوان خۆیان لەگەڵ بوونی ناکۆکی و ململانێی جیهانیشدا لەسەر ناوچەکانی هەژموون. ئەم هاوسەنگییە نەدەبووایە تێک بچێت، ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان ناچارکرد لە چوارچێوەیاندا بژی، بوونە (لەڕاستیدا کرانە) ئەندامی نەتەوە یەککگرتووەکان و بەم جۆرە هەموو ڕێگاکانی هێزە گەورەکانی دنیا، ڕەوشی ناوچەیی و پەیمان و یاسا جیهانییەکانی لێ قەدەغە کرا کە بچووکترین یارمەتی بۆ کێشەکەی پەیدابکات و شۆڕشەکانی کوردیش لەپشتی دیوارێکی بەهێزی ئابلوقەی سیاسی، جیهانی، ئابووری و ناوچەییدا، زیندانی کران و پیلانێکی نێودەوڵەتی و ناوچەیی ئەم جارەش بەسەر کورددا سەپێنرایەوە[٧].

پاش ئەوەی کە ئیمپریالیزمی بەریتانی هاتە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و دەستی کرد بەدروستکردنی چەند دەوڵەتێکی بەناو نەتەوەیی، لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی و لێک هەلوەشانی ئیمپراتۆریی عوسمانی، چەندین (دەوڵەتی- نەتەوە)ی ئێران، تورکیا، سووریا، عیراق و ئوردن دامەزران و بەخشڵی نەتەوەیی ڕازێنرانەوە. گیروگرفتی سەرەکیی ئەم شێوازە لە دەوڵەت لە ولاتانی دواکەوتووی پەرەنەستێنی فرەنەتەوەیی وەکو ئێران و تورکیا و عیراق و سووریا لەوەدایە دەوڵەت بەشێوەیەکی

میکانیکی بووەتە چەمکێکی سیاسی و سەرخانی نەتەوە باڵادەستەکان و هەرگیز نوێنەرایەتیی ئەو نەتەوانە ناکا کە لەژێر چەتری دەسەڵاتی خۆیاندا کۆیان کردوونەتەوە. لێکۆڵینەوەی پسپۆران دەریان خستووە، لە جیهانی ئەمڕۆدا، سنوورە نەتەوەیی - سیاسییەکان، واتە دروستبوونی دەوڵەتەکان لەسەر بناغەی ڕەواییی نەتەوەیی بوون، لەزۆر وڵات یەکتری ناخوێننەوە و پێکەوە نەگونجاو و ناکۆکن، تەنیا ١٢ دەوڵەتی نەتەوەیی لە دنیادا لەباری نەتەوەیییەوە یەکدەست و یەک ڕەنگ و یەک نەتەوەن، ئەوانی تر تێکڕا، دەوڵەتی نەتەوەیی نەگونجاون. تەنانەت لە ٣٩ وڵاتدا پڕنفووزترین بەشی نەتەوەیی دەسەڵاتداریان لە ٥٠٪ دانیشتوانی وڵاتەکەشیان کەمترن، زۆربەی ئەو دەوڵەتە نەتەوەییانە، فرە نەتەوەین و لەڕەوشی ئاشتی یان شەڕدا بەزۆر پێکەوە دەژین(٨).

هاتنی ئیمپریالیزمی بەریتانی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە، واتە پاش ئەوەی هندستانی داگیرکرد دەیەویست کە ڕێگای نێوان هندو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەورووپا زەمانەت بکات. دەبینین هەموو هەوڵی بەریتانیا بۆ ئەوەیە کە ئەم ڕێگایە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەبەردەستی هێزی خۆی یان وابەستە بەخۆیدا بێت. بەریتانیاو پاشان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش و پاشان سەرهەڵدان و بەهێزبوونی یەکێتیی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا ڕەوشی ناوچەکەیان وا لێ کرد کە لەهەردوو لاوە یارمەتی و پشتیوانیی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان بکرێت و کوردیش جارێکی دیکە بکرێتەوە بەقوربانی. بۆ زیاتر ناسین و ئاشکراکردنی ئەو سەردەمانە پێویست دەکات چەند خاڵێک لەسەر هەلومەرجی ئەوکاتەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەرەنجام و گەشەکردنی ئەو ڕەوشانە بەپێی پیلانی نێودەوڵەتی و هەژموونی جیهانی ئاماژە پێ بدەین:

١- بنیاتنەرانی ئیمپراتۆریای بەریتانیای مەزن، لەپێش جەنگی یەکەمی، جیهانی لەو بڕوایەدا بوون باشترین ڕێگا بۆ پاراستنی ڕێگای هیندستان ئەوەیە کە لە سنووری دەسەڵاتی ئاساییاندا، چەند قەوارەیەکی دروستکراوی وا پێک بهێنن کەیان دەبێت ڕاستەوخۆ لەژێر کۆنترۆڵی خۆیاندا بن یان دەبێت ڕزگارو سەربەخۆ بن لە هەژموونی هەر دەوڵەتێکی دیکەی گەورەو بەتایبەتی هەژموونی

ڕووسیا.. سەرەنجام بەریتانیا ئەم وڵاتانەی خستە ناو چوارچێوەی هەژموونی خۆیەوەو دەوڵەتەکانی (ئەفغانستان، ئێران، سیکیانگ و تبت) کێشەی گەورەی بەریتانیا (لە سەدەی نۆزدەدا) ڕووسیای قەیسەری بوو، کە بەردەوام لەهەوڵی سەرنەکرتنی ئەم سیاسەتەدا بوو، چونکە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابوو کە بگاتە ئاوە گەرمەکانی (کەنداوی فارس، دەریای عەرەبی و ئۆقیانووسی هیندی) یان بەهۆی کوردستانی عوسمانی و لەڕێگای کوردستانی ئێرانەوە یان لەڕێگای ئەفغانستانەوە. بەریتانییەکان بۆ ڕێگەگرتن لە هەژموونی ڕووسی تەنها دوو ڕێگایان لەبەر دەمدا بوو یان دەبوایە ڕووسیایان هاویەش بکردایە لەو سیاسەتەدا یان دەبوو پارێزگاری سەربەخۆیی ئەو وڵاتانەیان بکردایە وەکو ناوچەی قەدەغەکراوی سیاسیی نێوان هەردوو زلهێزە جیهانییە دەسەڵاتدارەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (بەریتانیا و ڕووسیا)و سەرەنجام وەکو سیاسەتێکی پێویست و ناچاری (پاش چەندین جەنگی ناوچەیی وەکو جەنگی دوورگەی قەرم، جەنگی ئەفغانستان و جەنگی سیکیانغ) لەسەر سیاسەتی دووەم ساغ بوونەوەو ئەم سیاسەتەش دوو بەرئەنجامی گرنگی لێ پەیدابوو:

أ- هەر لاوازبوون و دابەشکردنێکی ئەو وڵاتانەی کە کەوتوونەتە نێوان دەسەڵاتی بەریتانیاو ڕووسیا وا دەکات کە بەشی هەژموونی ڕووسیا بەرەو زیادبوون بچێت و سەرەنجام هاوسەنگی و ڕەوشی ناوچەکە تێک بچێت و ڕێگای هیندستان و ئاوی گەرم بۆ ڕووسیا بکرێتەوەو بەریتانیا هەڕەشە لە دەسەڵاتی بکرێت لەم ناوچەیەدا.

ب- ئەگەر ئەم ناوچانە پشێوی و ئاژاوەی تێدابێت، هەم ئەو دەوڵەتانەی کە بەریتانیا پێی باشە، دەوڵەتی بەهێزو سەربەخۆبن بەرەو لاوازبوون دەچن و هەم بەریتانیاش مەسرەفێکی زۆری دەوێت بۆ پاراستنی ئەو ئاسایشە، ئێرانێکی سەربەخۆ و بەهێز یان تورکیایەکی بەهێز کە هاوپەیمان بێت لەگەڵ بەریتانیادا بمێنێتەوە باشترە لە ئێران یان عوسمانییەکی بێ هێز کە بەئاسانی دەبوونە پارووپەکی چەور لەبەردەم هێرش و هەژموونی ڕووسیا. سەرەنجام بەریتانیا بەئاشکراو ڕاستەوخۆ دەستی کرد بەپشتیوانی و یارمەتیی ئەو دوو دەوڵەتە

داگیرکەرەی ئەوسای کوردستان و دژی هەر بزووتنەوەیەکی کوردی ڕادەوەستا[٩].

(٢) ئەم هاوسەنگییە بە کۆتاییهاتنی سەردەمی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریی بەریتانیا لە ناوچەکەدا (کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست و سەرەتای نیوەی دووەمی) تێک نەچوو، بەڵکو هەر ئەو دەوڵەتانەی کە دەبوواپە لەو شوێنانەدا هەبن (پاکستان، ئەفغانستان، ئێران، تورکیاو عیراق و سووریا) بەدەسەڵات و بەرەکەتی بەریتانیاو (فەرەنسا) کرانە دەوڵەتی نەتەوەیی بەهێزی سەربەخۆ و ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکان و پارێزراو لەلایەن هەژموون و هاوسەنگیی جیهانییەوە. بەریتانیا، فەرەنسا و ڕووسەکان سیاسەتێکی نارۆشن و نادیاریان لە بەرامبەر کورد گرتەبەر (سەردەمی شەڕی یەکەم) بۆ ماوەیەکی کەم وازیان لەکورد هێنا و هیچ هەوڵێکیان نەدا، بۆ یارمەتیدانی و بەتایبەتی سیاسەتی بەریتانیا لەنێوان پیشاندانی سۆز و گەمارۆدان و سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کوردان بۆ ماوەی دە ساڵی دوای یەکەم جەنگی جیهانی، بەردەوام بوو تا سەرەنجام بەئاشکراو لە بەرژەوەندی وڵاتانی ناوچەکە، بزووتنەوەی کوردی سەرکوت کرد.

سیاسەتی سەرکوتی بەریتانیا لە هەمبەر شۆڕش و دەسەڵاتی شێخ مەحموود و یارمەتیدانی دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆنالیستی عەرەبی عیراقی، هەمان یارمەتی و پشتیوانیی عوسمانی بوو لەلایەن بەریتانیاوە دژی شۆڕش و ڕاپەڕینی نەتەوەیی کورد لە سەدەی نۆزدەدا، لەپاش دۆزینەوەی سەرچاوەکانی نەوتی کوردستانی باشووروو گازی سرووشتی و نەوتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، جارێکی دیکە ئەم سیاسەتە جێگیرو هاوسەنگەی دژی کورد، یارمەتیدانی دیکەی بۆ پەیدابوو. ئەم سامانە بەیارمەتی و پشتیوانیی هێزی گەورەی ئەوسای دنیا (بەریتانیا) بخرێتە خزمەتی هەردوو دەوڵەتی ناسیۆنالیستی عەرەبی و فارسی (عیراق و ئێران).[١٠]

(٣) پاش هاتنی سۆڤیەت و هەوڵدانی بۆ بەدەستهێنانی ناوچەی هەژموونی خۆی، ئەویش وەکو بەریتانیا، هەمان سیاسەتی لەلایەنی خۆیەوەو بۆ بەرژەوەندی خۆی پیادەکرد. واتە سیاسەتی ئەوەی مادام ئەو وڵاتانە (ئێران، تورکیا، عیراق،

سووریا، ئەفغانستان) بەتەواوی بەشێک نین لە ناوچەی دەسەڵاتی خۆی، بۆیە دەبێت نەبن بەناوچەی بەتەواوی پاوانکراو لەلایەن بەریتانیاوە. سۆڤیەتیش کەوتە یارمەتیدانی بەهێزی و سەربەخۆیی ئەو دەوڵەتانە و پشتگیریی ئەو دەوڵەتانە دژی هەر شۆڕش و راپەڕینێکی کوردی یان هەر نەتەوەیەکی دیکە (ئەرمەن، ئاشوور، ئۆزبەک) بۆ دابڕینی بەشێک لە خاکی ئەو وڵاتانە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوە بزانین، ناوچە هەرە دەوڵەمەندەکانی ئەو سێ دەوڵەتە (تورکیا، عێراق و ئێران) هەر لە کوردستاندایە، واتە هێزێکی دیکەی بەدەسەڵاتی دنیا بووە هۆکارێکی کاریگەری مانەوەی جێگیری ناوچەیی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان، دژی کورد، بەڵام لە روانگەی مەنتیق و بەرژەوەندی خۆی.

(٤) لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی، حاڵەتێکی شاز و هەڵاواردە دروست دەبێت کە ئەویش پشتیوانیی کاتیی سۆڤیەتە بۆ دامەزراندنی کۆماری کوردستان (مەهاباد) کە نامۆیە بەم سیاسەتەی پێشووی جێگری و هاوسەنگی نێوان (بەریتانیا و سۆڤیەت) بۆ پشتیوانی و بەهێزکردنی دەوڵەتانی بەناو نەتەوەییی داگیرکەری کوردستان. هاندانی ستالین و پشتیوانیکردنی دامەزراندنی کۆماری کوردی، کۆماری ئازەری و داوای ئەرمەنستان بۆ هەرێمەکانی قارس و ئەردەهان لەژێر دەسەڵاتی تورکیادا، لەکات و سەردەمی بێهێزبوون و لەرزۆکیی ئەم جێگری و هاوسەنگییەدا و هەمان هیوای سۆڤیەتەکان (هەروەکو رووسەکانی پێشوو) بۆ گەیشتن بەناوچەکانی ئاوی گەرم و (ئەمجارە نەوت)، بەڵام لە سەردەمێکدا کە ئەو وڵاتانەی ناوچەکە بەرەو لاوازی دەچوون بەسوودوەرگرتن لە ناو و جێگاو ئایدۆلۆژیای سۆڤیەتی و بەتایبەتیش لەپاش سەرکەوتنەکانی بەسەر ئەڵمانیای نازیدا. سووربوونی رۆژئاوا بەسەرکردایەتیی ئەمریکا بۆ هەڵنەوەشانەوەی ئەم (جێگری و هاوسەنگییە)و مانەوەی رەوشی پێش جەنگی دووەم، رێگەی لەمانۆڕی سۆڤیەتی گرت بۆ بەناو پشتیوانی لە کوردو ئازەر و ئەرمەن و مۆڵدانی هێزەکانی لەسەر سنوورەکانی تورکیا- بولگاریا، زیادکردنی هێزەکانی لەسەر سنووری ئێران شکستی هێناو سەرەنجام هەردوو کۆماری کوردی و ئازەری وەکو گەڵای پایز وەرین. سیاسەتی نەتەوە یەککرتووەکانیش دیسان دڵنیایی لەوە کردەوە کە

ئەم هەلومەرجە جێگیرەی پێشوو، بەردەوام دەبێت و جارێکی دیکە و لە سەردەمێکی نوێتردا هەمان پیلانی کۆنی گەمارۆی سیاسی و جیهانی بەسەر کوردا سەپێنرایەوە.(١١)

(٥) سیاسەتی (جێگیربوون و هاوسەنگی) جیهانی و ناوچەیی کە لەلایەن هەردوو بەرەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات و دەوڵەتانی ناسیۆنالستی داگیرکەری کوردستانەوە پیادەیان دەکرد دژی کورد دەبێتە بەشێک لە سیاسەتی جیهانی و سەرەنجام هەموو فراکسیۆنە نێودەوڵەتییەکانی ئیسلامی، عەرەبی، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایی بەشداریی تێدا دەکەن و بەپێی مەنتیقی هاوسەنگی و بەرژەوەندی نێودەوڵەتی، کورد دەبێتە دابەشکراو و داگیرکراوێکی نێودەوڵەتی و بەم جۆرە هەموو دەرگاکانی لێ دادەخرێت و هەموو خەبات و هەوڵەکانی دەکەوێتە ژێر بەزەیی و کاریگەریی ئەم جێگری و گەمارۆ جیهانی و ناوچەییە. شەڕی ساردیش لەدوای جەنگی جیهانیی دووەم، خوێنێکی نوێ دەکاتە دەمارەکانی ئەم سیاسەتە و بۆ ماوەیەکی نزیکەی نیو سەدەی دیکە ئەم سیاسەتی گەمارۆیە دژی کورد بەردەوام دەبێت، لە ماوەی نزیکەی ئەم سەدو پەنجا ساڵەی دواییدا، یەک ڕەوشی گەمارۆو پیلانی نێودەوڵەتی و ناوچەیی دژی کورد بەم جۆرە دەبینین:

ڕۆژئاوا (بەریتانیا و ئەمریکا) + دەوڵەتانی ناوچەیی دژی کورد.

یەکێتیی سۆڤیەت و بلۆکی ڕۆژهەڵات + دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان دژی کورد.

تەنانەت بوونی کۆمۆنیزمێکی ناوچەیی و بەناو نێونەتەوەیی نەیدەتوانی لەو هاوسەنگییەی دژ بەکورد ڕزگاری ببێت و هەرچەندە بەشێکی زۆری ڕابەران و جەماوەری کۆمۆنیزی ناوچەیی (ئێران، تورکیا، عیراق و سووریا) لە کورد پێک هاتبوون، بەڵام ئەوانیش بەشێک بوون لەو پیلانە جیهانییەو سەرەنجام بوونە پاشکۆی سیاسەتی جیهانی و ناوچەیی دژی کورد. بەڵام لە جەمسەری سۆڤیەت و ڕۆژهەڵاتەوە، بوونی سۆڤیەت و بزووتنەوەیەکی کۆمۆنیستی بەهێز لە کوردستاندا لە ساڵانی پەنجا، شەست، حەفتا و هەشتاکاندا، وا لێک دەدرایەوە کە دەتوانرێ بەهۆی ئەو بلۆکەوە کورد لەو گەمارۆیە دەرباز بکات و هەر بۆیەش بەردەوام بەشێک لە

بزووتنەوەی کـورد پەیڕەویی لەو بەرەیە دەکـرد، بەڵام مـەخـابن ئەم سـیـاسـەتەش کەلێنێکی بۆ کورد نەکردەوەو بۆ ڕزگاربوون لەو جێگرییە جیهانییە.

کورد لەم سەردەمـەدا (١٥٠ ساڵی دوایی) نەیدەتوانی و لەراستیـدا نەیان دەهێشت بچێتە ناو هیچ لەو دوو هاوکێشە جیهانی و ناوچەییە و لەهیچکام لەو دوو بەرەیەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا نەدەخـوێنرایەوە، ئەگەرچی بەشێک لە بزووتنەوەی کوردی سـەر بەڕۆژئاواو بەشەکەی دیکەی سەر بەڕۆژهەڵات بوو، بەڵام ئەو دوو بەرەیە هەردووکیان بەیەک چاو تەمـاشـای پرسی کـوردیان دەکـرد، ئەویش ئەوەیە کـە جـێگای کـورد لە جێگیـری، هاوسەنگیی هـەژمـوون و بەرژەوەندی هیچ کـامیـاندا جێگەی نەدەبووەوە هەوڵی بزووتنەوەی کوردی بۆ نزیکبوونەوە جارێک لە ڕۆژئـاواو جارێک لەڕۆژهەڵات، هەر بەمەبەستی شکاندنی گەمارۆی سەپێنراوی سەر کورد بووەو هەر بۆ کرانەوەی کـەلێنێک بـووە بۆ دەربازبـوون لە ژیانی ژێردەسـتی، دابەشکردن و چەوسـانەوەی ڕەوشی جیهانی و ناوچەیی.

٦- بوونی ڕوسیـای قەیسەریی، ڕکابەری بەریتـانیا و پاشان یەکێتیی سۆڤیـەتی دژی بەریتانیـا و ئەمریکا و ڕۆژئاوا لەسـەر هەژموونی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەمیشە وای دەخـواست کـە لەم ناوچەیەدا پەیمـان و تەرتیـبـێکی سـەر بەڕۆژئـاواو لە بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتە ناوچەییانە بەدی بهێنرێت. پەیمانی سەعد ئابادی ساڵی (١٩٣٧) نێوان (تورکیـا، عیـراق، ئێران، ئەفغـانستـان)و بەچاودێریی بەریتـانیـاو پاشان پەیمانی بەغدای ساڵی ١٩٥٥ نێوان (تورکیا، عیراق، ئێران، ئەفغانستان و پاکسـتـان) بەچاودێریی بەریتـانیـاو ئەمـریکا دژی کـۆمـۆنیـزم و بزووتنەوە کوردییەکانی ئەو وڵاتانەی کە کوردیان تێدادەژی. پاش سـاڵی ١٩٥٨ عیـراق لە پەیمانی بەغـداد هاتە دەرەوەو ئەو پەیمانە نەمـا و پەیمانی ڕێکەوتنی ناوەندی CENTO وەکو بەشێک لە پەیمانی ناتۆ لە نێوان (تورکیـا، ئێران، ئەفغـانسـتان و پاکسـتـان) هاتەدی. دوای سـاڵی ١٩٧٩و پاش شـۆڕشی ئیـسـلامـیی ئێـران و دەرچوونی ئێران لە هەژموونی ئەمریکی و ڕۆژئاوایی و داگیرکردنی ئەفغـانستان لەلایەن سۆڤیاتەوە، ئەم پەیمانە (CENTO) هەڵئەوەشێتەوەو بەم جۆرە ئەم ناوچەیە لە تورکیاوە هەتا پاکسـتـان، دەبێتە ناوچەیەکی پڕ لەپشێوی و ئاژاوەو شوێنی

زۆرانبازی و ململانێکان. لەم سەردەمە بەدواوە بزووتنەوەیەکی ئیسلامی بۆ بەرۆژهەڵات و ڕۆژئاوا سەری هەڵدا بەیارمەتی و پارەی عەرەبی و خەلیجی لە پاکستان، ئەفغانستان، تورکیا، عیراق و وڵاتانی دیکەی عەرەبی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەو سەردەمە لەساڵی ١٩٧٩ بەدواوە هاوپەیمانیی نێوان بەرەی ئیسلامی (جگە لە ئێران)و ئەمریکا و ڕۆژئاوا دژی سۆڤیەت و کۆمۆنیزم دەبینین کە (ڕووبەڕووبوونەوە گەرمەکە لە ئەفغانستاندا دەبێت، ڕۆژئاواو جیهانی ئیسلامی و موجاهیدانی ئیسلامی ئەفغانی دژی کۆمۆنیزم و سۆڤیەت لەوپەڕی توندیدا دەبێت).

هەر بەپێی مەنتیق و بەرژەوەندی ڕۆژئاوایی ڕێگەگر لە هاتنی سۆڤیەت بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەتی بۆ خەلیجی فارس، دەریای عەرەبی و ئۆقیانووسی هیندی. لەم سەردەمەدا ڕەوشی بەهێز و کاریگەری سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئیسلامی و بزووتنەوەی عەرەبی لە ئەنجامی پارەو یارمەتیدانی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی و بەتایبەتی وڵاتانی کەنداو بۆ بزووتنەوە ئیسلامییەکان و یارمەتیی ڕۆژئاوا بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی و بزووتنەوەی ناسیۆنالیستیی عەرەبی دژی هێرش و هەژموونی کۆمۆنیزم و سۆڤیەتن لە ناوچەکەدا. لەلایەکی دیکەوە یارمەتیی وڵاتە عەرەبییە ڕادیکالەکانیش (سووریا، یەمەن، لیبیا) لەلایەن سۆڤیەتەوە دژی بەرەی ڕۆژئاوا. بەم جۆرە ئەوەی قازانجی سەرەکیی کرد، بزووتنەوەی ئیسلامی و عەرەبی بوو لەلایەن هەردوو بەرەی جیهانییەوە و ئەوەی کە جارێکی دیکە زیانی کاریگەری بەرکەوت، بزووتنەوەی کوردی بوو.

جارێکی دیکە و لە ڕەوشێکی نوێتردا (سەردەمی ١٩٧٩ بەدواوە)، هەردوو بەرەی جیهانی (ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات)، کەوتنە پێشبڕکێ بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییی پەیدابوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەدوای هەڵوەشانەوەی پەیمانی سەنتۆ و پەیدابوون و بەهێزبوونی بزووتنەوەی ئیسلامی و عەرەبی لە ناوچەکەدا. لەم سەردەمەدا (١٩٧٩-١٩٩١)، کورد خراپترین ڕەوشی ئەنفال و لەناوبردنی لە عیراق و ئێراندا ڕووبەڕوو بووەوە و لە تورکیاشدا لە ساڵی ١٩٨٠و لەدوای کۆدێتای سەربازی و هەتا ئێستا هەر بەو جۆرە کەوتووەتە بەر هێرش و ئاوارەکردن و لەناوبردنی نەتەوەیی و نەژادی،

سەرەڕای هەژاری و برسێتی و بێکاری.

لەم سەردەمەدا، ئەگەر ولاتێک یان دەوڵەتێکی گەورەی دنیا پشتیوانییەکی کاتیی لە پرسی کورد کردبێت وەکو هەوڵی فەرەنسا بۆ پشیتوانی لە کورد لەساڵی ١٩٨٩و بەبۆنەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن حکوومەتی عیراقەوە بۆ قەلاچۆکردنی کورد، بەلام ئەویش دیسان نەیتوانی لەو ڕەوشەی بەرژەوەندی جیهانییە، دەربازبێت. لە ساڵی ١٩٨٩ بە دەستپێشکەریی ئەمریکی و فەرەنسی و بەپێی یاداشتەکانی (کلیر بۆن پێل)، سەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی، کۆنگرەیەکی نێو دەوڵەتی لە پاریس بەسترا، دژی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، لەم کۆنگرەیەدا نەیانهێشت نوێنەرانی کورد بەشداری لەو کۆنگرەیەدا بکەن و تەنانەت نوێنەرانی ئەوکاتەی کوردیان (ڕازی کردا) کە لەو کۆنگرەیەدا بەشداری نەکەن و لەکۆنگرەکەشدا نە ناوی ئەو دەوڵەتەیان هێنا کە ئەو چەکەی بەکارهێنابوو (عیراق)و نە ناوی ئەو گەلەشیان برد کە ببووە قوربانی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی (کورد)و بەم جۆرە، جارێکی دیکە، گەمارۆی سەپێنراوی جیهانی و ناوچەیی و عەرەبی و ئیسلامی نەیهێشت تەنانەت ناوی کورد وەکو قوربانییەکی گەمارۆ و چەوسانەوەی جیهانی و ناوچەیی ببرێت.[١٢]

**سەردەمی دووەم**؛ سەردەمی گرنگیدان بەپرسی کوردو پڕکردنەوەی بۆشاییی دەرەوەی دەسەلات (OUT OF CONTROL)

سەرکەوتنی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بەسەر عیراقداو وەدەرنانی هێزەکانی سەدام حسێن لە کوێت (مانگی شوباتی ١٩٩١) بەسەرەتای قۆناغێکی نوێی گرنگی مێژوویی دادەنرێت لەسەر ئاستی جیهانی و ڕاگەیاندنی سیستەمی نوێی جیهان. ڕەوشێکی کاریگەری گەورەش بەقازانجی بزووتنەوەی کوردی پەیدادەبێت و دەستپێکی نەمانی گەمارۆی جیهانی و ناوچەیی بەسەر کوردا دێتە کایەوەو گرنگیدان بەکێشەی کورد لە هەردوو بەرەی جیهانی و ناوچەییەوە دەست پێ دەکات. لە ٢٤ ئۆگۆستی ١٩٩١ هێزەکانی لیبرالی و دیموکراتی ڕووسیا بەبێ جەنگ توانییان سەرکەوتن بەسەر کۆمۆنیزمدا بەدەست بهێنن و قۆناغ و ڕەوشێکی نوێیان لە سەرتاسەری کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتدا بەدی هێناو بەم شێوەیە کۆتاییی

سەردەمێکی مێژوویی گرنگ و چارەنووسسازیان لەسەر هەلومەرجی جیهانی و ناوچەیی و شکستی ئیدۆلۆژیای کۆمۆنیستی و هەڵوەشاندنەوەی سیستەمێکی حکوومی، ئابووری و سیاسییان ڕاگەیاند.

هەردوو دیاردە گرنگەکەی ساڵی ۱۹۹۱ (لێدانی عیراق لەلایەن ئەمریکا و هاوپەیمانانەوە، شکست و هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت) هاوکات و نزیک دەبێت لەگەڵ ڕاپەڕینی سەرتاسەریی باشووری کوردستان و کاتی ئەو ڕاپەڕینە و ئاوارەبوون و کۆڕەویی ملیۆنی کوردی عیراق کە بەگەورەترین بزووتنەوەی کۆچی دانیشتووانی وڵاتێک دادەنرێت، لەدوای ئاوارەکردنی ئەرمەنییەکان لە تورکیا، پاش جەنگی یەکەمی جیهانی یەکەم[13]. سەرەنجام ڕاپەڕین و کۆڕەو، دوو بەرئەنجامی گرنگی جیهانی بەقازانجی بزووتنەوەی کوردی لێ دەکەوێتەوە. پاراستنی نێودەوڵەتی بۆ کورد و قەوارەی کوردی و بڕیاری ٦٨٨ی نێودەوڵەتی بەدەستپێشکەریی فەرەنسا و ئەمجارە بەهۆی کوردەوە، یاسایەکی گرنگی نێودەوڵەتی (دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتەکان لەلایەن هێزە گەورەکان و نەتەوەیەکگرتووەکانەوە) ڕەت دەکرێتەوە و بەقازانجی کورد و خەڵکی عیراق، ئەو بەندەی یاسای UN کاری پێ ناکرێت و زەمینە ئامادە دەکرێت بۆ هەڵوەشانەوەی.

هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت و هاتنی ڕاستەوخۆی هێزە گەورەکانی دنیا (ئەمریکا و بەریتانیا) بۆ ناوچەی هەرە گرنگی ڕۆژهەڵاتی ناوین و نەمانی مەترسیی هەژموونی سۆڤیەتی لەم ناوچەیەدا و هێزی سەرەکیی پاوانکەری ناوچەکە، دەبێتە ئەمریکا، بۆ زیاتر شارەزابوون لەسەر ئەم ناوچەیە، پێویست دەکات کە ڕەوشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی عەرەب لە چەند خاڵێکدا باشتر شی بکەینەوە:

یەکەم: لە ئەنجامی ڕکابەریی توندی سۆڤیەت و ئەمریکا لە ساڵی ۱۹۷۹ (پاش داگیرکردنی ئەفغانستان، شۆڕشی ئیسلامیی ئێران و جەنگی ئێران- عیراق) ئەم ناوچەیە بووە ناوچەیەکی پڕچەک و جێگای یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان و ڕوودانی کارەساتە گەورەکانی جەنگ و ڕێکەوتنی سەرهەڵدانی ئیسلامی و عەرەبی لەگەڵ ئەمریکاو ڕۆژئاوا دژی هەژموون و پەلاماری سۆڤیەتی بۆ ناوچەکە، ڕەوشەکەی

بەقازانجی دەوڵەتانی ناوچەکە گۆڕی و یارمەتی و هاوکارییەکی لەئەندازەبەدەر بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەلایەن ئەمریکاوە پێشکەش کرا و سەرەنجام لەم دەیەیەدا ١٩٧٩- ١٩٨٩ زۆرترین دەستکەوت وەبەر دەوڵەتانی ناوچەکە کەوت.

بەڵام پاش نەمانی مەترسیی سۆڤیەتی و هاتنی ڕاستەوخۆی هێزەکانی ئەمریکاو بەریتانیا بۆ کەنداوی فارس و تورکیاو ناوچەکە، پێویستی دەکرد کە لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە کە خۆیان نەیاندەتوانی (سەبارەت بەپاراستنی بەرژەوەندییەکانیان، لەگەڵ ئەمریکادا) ڕاستەوخۆ دژایەتیی هاتنی هێزەکانی ئەمریکاو بەریتانیا بکەن، بۆیە دەستیان کرد بە یارمەتیدانی بزووتنەوە ئیسلامییەکان بۆ پڕکردنەوەی بنیاتنانی سیاسەتی دژی ئیسرائیل و ئەمریکی و بەریتانی. کاتێک ئەو دەوڵەتانە خۆیان ئەو کارەیان پێ نەدەکراو ئەو کارەیان بە بزووتنەوە ئیسلامییەکان سپارد. ئەوان (بزووتنەوە ئیسلامییەکان) بەڕێکەوتنی شاراوە و ناڕاستەوخۆ دەستیان کرد بە هاندانی جەماوەر و شەقامی عەرەبی دژی ئیسرائیل و ڕۆژئاوا. ئەگەر ئەوە بزانین کە لەساڵی ١٩٩١ بەدواوە گفتوگۆی عەرەبی- ئیسرائیلی بەچاودێریی ئەمریکا بەرەو پێشەوە دەچوو کە پاشان ساڵی ١٩٩٣ ڕێکەوتنی ئۆسلۆی لێ پەیدابوو، دەوڵەتە عەرەبییەکانی بەشدار لەگەڵ بەرژەوەندی ئەمریکی و ڕۆژئاوایی و گفتوگۆ لەگەڵ ئیسرائیلدا، خۆیان بەئاشکرا سیاسەتێکی لایەنگریان لەو ڕەوشە هەبوو، بەڵام لەڕێگای بزووتنەوە ئیسلامییەکانەوە، ناڕاستەوخۆ دژایەتیی بوونی ئەمریکا لە ناوچەکە و هەڕەشەیان لە ئیسرائیل دەکرد.

بەم شێوەیە لەلایەن هەموو ئەو دەوڵەتانەوە، هێزێکی یەدەکی عەرەبی- ئیسلامی هەڵگری بیروباوەڕی ناسیۆنالستیی عەرەبی و ئیسلامیزمی سوننی سازو بەهێزکرا بۆ دژایەتیکردنی ئەمریکاو ئیسرائیل، بەڵام دەوڵەتەکانی (سووریا، عیراق، لیبیا و سوودان) کە خۆیان ڕاستەوخۆ دژی ئەمریکا و ئیسرائیل بوون، پێویستییان بەو کارە نەبوو، بۆیە تەماشا دەکەین لەم وڵاتانەدا لەو جۆرە بزووتنەوە ئیسلامییە- عەرەبییە بەرچاو نەدەکەوت، چونکە دەوڵەت و جەماوەری عەرەبی پێکەوەو بەئاشکراو ڕاستەوخۆ خرابوونە دژی هەژموونی ئەمریکی و بوونی ئیسرائیل.

بەبڕاوی من، ئەمە یەکەم جارە، لەدوای هەڵوەشانەوەی خەلافەتی عەباسی، کە

وتاری ئیسلامی عەرەبی (سوننی)و بزووتنەوەی پان عەرەبیسم بەو هێزە بەرینەوە، یەک بگرێت، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر سیاسی، گونجاو و هاوچەرخ و بەپێی پێوەرەکانی ئێستای دنیای سیاسەت. دەوڵەتە عەرەبییە بەناو میانڕەوەکان (میسر، مەغریب، توونس، سعوودیە و خەلیج، ئوردن، لوبنان و دەسەڵاتی فەلەستینی) توانییان زۆرترین قازانج لە ئەمریکاو ڕۆژئاوا بەدەست بهێنن، دەوڵەتە عەرەبییە ناسیۆنالیستەکان (سووریا، لیبیا، عیراق و سوودان) هەروەکو جاران بەئاشکرا دژی ئەمریکاو ئیسرائیل و ڕۆژئاوا کاریان دەکردو پاشان بزووتنەوە ئیسلامییە بەهێزەکانی ناو وڵاتانی میانڕەوی عەرەبیش بەرەو بەهێزبوون دەچوون و بەسیاسەتێکی دژی ئەمریکی- ئیسرائیلی جەماوەری عەرەبییان ساز دەکردەوەو بەم شێوەیە لەهەرسی بەرەکەدا، جارێکی دیکە عەرەب خۆی ڕێکخستەوەو بەرەیەکی ئیسلامی- سوننی- عەرەبی بەهێزو کاریگەری (ڕانەگەیەنراوی!) دژی ئەمریکا و ڕۆژئاواو بەهاکانی بەدەستهێنانی. سیاسەتی ئەمریکاو ڕۆژئاوا بەدژی سۆڤیەت و دەستنەبردن بۆ هەڵوەشانەوەی جێگیری و هاوسەنگییەک کە نزیکەی سەد ساڵ پێشتر بەریتانیا لەم ناوچەیەدا دروستی کردبوو، سەرەنجام زۆرترین دەستکەوتی بۆ عەرەب بەدیاری هێناو هێدی هێدی دەوڵەتە عەرەبییەکان توانییان بەرەیەکی سیاسی، ئابووری، عەسکەری و دینی لە دنیادا دروست بکەن.

دووەم: یەکێک لە کێشە هەرە ئاڵۆزەکانی دوای شکستی سۆڤیەت و هەڵوەشانەوەی بلۆکی ڕۆژهەڵات، مەسەلەی ئەفغانستان و سەرکەوتنی بزووتنەوەی تالیبانی سوننی مەزهەب بەدژی ئەمریکاو توندڕەویی ئیسلامی بوو، کە بەیارمەتیی عەرەبی ئەفغان، پارەی سعوودیەو خلیج و کارئاسانیی پاکستان بوو. هەڵبژاردنی ئەفغانستان لەلایەن ئوسامە بن لادنی سعوودی و ڕێکخراوی «القاعدە» بەیارمەتی پارەو پشتگیریی ئاشکرای سعودیە و خەلیج و ناچاربوونی سیاسەتی پاکستانی بۆ ڕێگەگرتن لە نفووزی ئێرانی، فرسەتی گونجاویدا بەدەسەڵاتی ئیسلامی- عەرەبی کە ئەو شوێنە بکەنە بنکەیەکی عەرەبی- ئیسلامیی دەرەوەی جیهانی عەرەب و لە شوێنێکدا کە میللەتێکی هەژار، نەزان و دواکەوتووی تێدایە، کە زەمینەی پەرەسەندنی سیاسەتی ئیسلامی توندڕەوی (سوننە)ی تێدایە، وڵاتێکە کە خەڵکێکی

زۆری تیادا دەژی کە چەندین ساڵە ناسنامەی ئیسلامییان بووەتە کارێکی پێویست و ناچاری بەدژی داگیرکەرە نائیسلامییەکانی (بەریتانیا و سۆڤیەت) نزیکە لە پاکستانی بە ناسنامە ئیسلامی- سوننی (لەبەرامبەر هەرەشەو هەژموونی هندی نائیسلام و هیندو پاکستان هەر لەیەک نەژادن- ئۆردوو- بەڵام جیاوازییان تەنها لە هیندۆس بوون و ئیسلام بووندایە) واتە ئیسلام بەشێکە لە ناسنامەی (ئەفغانستان و پاکستان). دەبێ بزانین کە پاکستان چەکی ئەتۆمیی هەیە و تەماعی بزووتنەوەی ئیسلامی عەرەبی لە خەڵکێکی شەڕکەر، برسی، نەزان و دواکەوتووی ئەو ناوچەیە، هێزی ئەتۆمی و پاشان بوونی چەندین کۆماری ئیسلامی- سوننە مەزهەبی (ئۆزبەکستان، تاجیکستان، تورکمانستان، قەرغیزستان و کازاخستان) کە باشترین دەروازە بۆیان ئەفغانستانە، چونکە ئەو وڵاتانەش پاش ئەوەی لە یەکێتیی سۆڤیەت جیابوونەتەوە هەر بەیار ماونەتەوەو لەلایەن سیاسەتی نوێی جیهانی پڕ نەکراوەتەوە و هێشتا لە(دەرەوەی دەسەڵاتن) هەروەکو بریجینسکی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا OUT OF CONTROL ناوی هێناوە.

بەم جۆرە، هێزی چەکدارو پارەداری عەرەبی ئەفغان (ئوسامەو قاعیدە) شەڕکەرێکی زۆر و زەوەندی تالیبان (سوننە مەزهەب)، وڵاتێکی بێ خاوەن و مەجبوور بە هەر یارمەتییەک وای کرد تەماع و تەرتیبی عەرەبیَ ئەویَ بکاتە یەکێک لە شوێنە گرنگەکانی پیادەکردنی سیاسەتی تیرۆریزمی- ئیسلامیی ئاشکرا، هەڕەشەکردن لە دنیاو بەتایبەتی دنیای ئەمریکی و ڕۆژئاوایی (کە ئیسرائیل بەشێکە لەو).

سێیەم: پاش شکستی سۆڤیەت و هاتنی ڕاستەوخۆی ئەمریکا بۆ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ناعەرەبی (جۆرج لینچۆفسکی لە کتێبە ناودارەکەیدا _«الشرق الاوسط في الشؤن الدولية- » ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکات بە دوو بەشەوە (القلب العربي والحزام الغير العربي)و بەتایبەتی تورکیاو پشتیوانی ڕاستەوخۆی ئەمریکا بۆ دامەزراوی سەربازیی پاکستان و ڕێگەگرتن لە نفوزی ئیسلامی و هیندی لەو وڵاتەدا، زەمینەی جەماوەریی پەیدابوونی هێزی ئیسلامییش لەو وڵاتانەدا پەیدابوو، ئەمجارەش بەیارمەتی و موبارەکەی هەردوو مەڵبەندە گرنگەکەی ئیسلامی

سوننەی عەرەبی (سعوودیە و ئەزهەر) پارەیەکی زۆر بۆ ئەو بزووتنەوە ئیسلامییانەی ئەو وڵاتانەش ڕەوانە کراو ئەمەش بەچاوپۆشیی سەرانی ئەو دەوڵەتانە. دەبێت ئەوە بزانین کە سەرانی دەوڵەتی پاکستانیش (هەروەکو عەرەبە سەر بەئەمریکییەکان) ناتوانن خۆیان بەڕاستەوخۆ و ئاشکرا دژی هەژموونی ئەمریکی و ڕۆژئاوایی جەماوەری ئەو وڵاتە سازبدەن، بۆیە ئەوانیش پێویستییان بەو کارە هەیە. تورکیاش هەر هەمان شێوە پێویستی بەو سیاسەتە هەیەو پەیدابوونی بزووتنەوەی ئیسلامی (سوننی) بە هێزی تورکی دژی ڕۆژئاوا و ئیسرائیلیش، هەر لە ئەنجامی ئەو سێ هۆکارەوە دەبێت، کە ئەمانەن، بوونی زەمینەیەکی ئیسلامیی؛ چونکە هەموو ئەو وڵاتانەی کە ناومان هێنان ئیسلام بەشێکە لە ناسنامەی نەتەوەییان، چاوپۆشیی ئەو دەوڵەتانە لە سەرهەڵدان و بەهێزبوونی ئەو بزووتنەوانە، بۆ بەرپاکردنی کارێکی دژی ئەمریکایی کەخۆیان ناتوانن پێی هەڵبسن و یارمەتی ماددی و مەعنەویی عەرەبی (سعوودیە و خەلیج) بۆ ئەو بزووتنەوانە. بەم شێوەیە ڕەوشی وڵاتانی ئیسلامیی ناعەرەبی (پشتێنەی ناعەرەبی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پاکستان) دەبێتە دژی ئەمریکی و ڕۆژئاوایی و ئیسرائیلی.

تورکیا: دەوڵەت و دامەزراوەی سەربازی، ناچارە کە پەیڕەوی لە سیاسەتی ئەمریکی بکات، بەڵام بزووتنەوەی ئیسلامی (ڕەفاو فەزیلەت و حزبوڵڵا) دەتوانن بەئەرکی دژی ئەمریکی هەڵبستن، چاوپۆشیی تورکیا لەو بزووتنەوەیە (بە مەرجێک دەستووری تورکی ڕێگەگرە لە دروستبوونی حزبەکان لەسەر بناغەی دینی)و هەوڵی ئەو دەوڵەتە دژی بوونی حزبی کوردی و چاوپۆشی نەکردن، دەتوانێت بەڵگەیەکی بەهێزی ئەو پرسە بێت.

عێراق: دەوڵەتێکی ناسیۆنالیستی عەرەبی شۆڤێنی، بەئاشکرا دژ بەئەمریکاو ئیسرائیل. لە عیراقدا ڕێگا بە سەرهەڵدانی ئاشکراو ڕەسمیی بزووتنەوەی ئیسلامی نەدراوە، لەبەر سێ هۆ، یەکەم لەبەرئەوەی عێراق خۆی وەکو دەوڵەتێک بەئاشکرا دژی ئەمریکاو ئیسرائیلە. دووەم سوننەی عەرەبی هەمیشە پەیڕەوی لە سیاسەتی عیراقی کردووە، سێیەم: بزووتنەوەی ئیسلامی شیعە مەزهەبی عیراقی بەشێک نییە لە وتاری عەرەبی- ئیسلامی بۆیە دەبینین فەرامۆش کراوە لەلایەن ناوەندە

عەرەبییەکان (سعوودیەو خەلیج و میسر)و بەڕاستەوخۆ و ناشکراش لەلایەن دەوڵەتەوە سەرکوت دەکرێت.

ئێران: وڵاتێکی بونیادگەری ئیسلامی شیعە مەزهەبی ئێرانی دژ بە ئەمریکا و ڕۆژئاوا. هەرچەندە سەرهەڵدانی ئیسلامی لە ئێراندا شاز و ناتەبایە لەگەڵ سەحوەی ئیسلامی- سوننی- عەرەبی، بەڵام لەو جێگایەدا کە دژی ئەمریکاو ڕۆژئاوایە، دەچێتە پاڵ بەرەی ناوبراوەوە. بەبڕوای من یەکێک لەو وڵاتانەی کەگەلێک زیان لەڕەوشی سەرهەڵدان و بەهێزبوونی بەرەی ئیسلامی- عەرەبی- سوننی (ڕانەگەیەندراو) دەکات ئێرانە، لەبەر ئەم هۆیانە: یەکەم هەر چواردەوری ئێران ئیسلامی سوننەیەو بەتەنها خۆی لەو ناوەڕاستەدا شیعەیە، دووەم، لەکاتی سەرکەوتن و هێرشی ئەو بەرەیەو شکستی ئەمریکاو ڕۆژئاوا یەکەم وڵات لەدوای (کوردستان) ئێران دەبێت کەدەکەوێتە ژێر بەزەیی هێرش و هەژموونی عەرەبییەوە. سێیەم، ئەگەر ئێران فریای ناسنامەی ئێرانیی خۆی نەکەوێت (هەرچەندە شیعەگەری بەشێکە لەو ناسنامەیە) لە بەرامبەر ئەو هەژموونە ئیسلامییەدا (کە شیعەی ئێرانی و لوبنانی تیادا کەمایەتییەکی زۆر کەمن، بەڵام جیهانی عەرەبی- ئیسلامی- سوننی ئێستا پێویستی بەتێکدانی ئەو بەرە دژی ئەمریکا- ئیسرائیل نییە)، ناسنامەی بەرەو کزبوون دەچێت. لەکاتی سەرکەوتنی بەرەی ئەمریکی- ڕۆژئاوایی، ئێرانی دژی ئەو بەرەیە (بەتایبەتی پاش ١١/٩) هیچی بەرناکەوێت لەبەر پیادەکردنی سیاسەتێکی ئیسلامی وەبەر سزا دەکەوێت. دامەزراوی دینی ئێرانی دەزانێت لەکاتی سەرکەوتنی بەرەی عەرەبی- ئیسلامی- سوننەدا هیچ نەبێت بۆ ماوەیەکی دیکە دەتوانێت دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت، ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە تەمەنی ڕابەرانی دامەزراوی دینیی لە ئێران ئەوەی بەرەوە نەماوە و ناشتوانێت وەکو پابەندبوونێکی دینی و ئایدۆلۆژی ئاشکرای دژی ئەمریکی بچێتە بەرەی ڕۆژئاواوە. لەگەڵ سەرکەوتنی بەرەی ئەمریکی- ڕۆژئاواییدا، ئەو بەشەی دەوڵەتی ئێرانی وەبەر گورزی کاریگەر دەکەوێت و بۆماوەیەک جیهانی ڕۆژئاوا ناچاردەبێت لەگەڵ دەسەلاتی ڕەسمیی کۆماری ئێرانی (ئیسلامی!) مامەڵە بکات.

ئەفغانستان، لەلایەن بەرەی عەرەبی- ئیسلامی- سوننییەوە بەتەواوی کۆنترۆڵ و

داگیر کرابوو هەر بۆ پەشە دەسەلاتدارانی تالیبان نەیاندەتوانی ئوسامە بن لادن و قاعیدە تەسلیمی ئەمریکا بکەن. چونکە لە راستیدا ئەوان (تالیبان) شاگردو دروستکراوی بەرەی ناوبراون و ئەوان لەلایەن ئەو بەرەیەوە دەپارێزران، کە ئوسامە بن لادن رەمزی گرنگی ناشاشکرای ئەو بەرەیە.

پاکستان: ولاتێکی پڕ لە دانیشتووانی سوننەی ئیسلامی و خاوەنی چەکی ئەتۆمی و ولاتێکی پڕ لە پشێوی و کودێتای سەربازی. دەوڵەتی پاکستان هەر لەدروست بوونییەوە لە ساڵی ١٩٤٧ بەسەرۆکایەتیی محەمەد عەلی جناح وەکو پارێزراوێکی بەریتانی و ئەمریکی ماوەتەوە، بەلام هەر بەپێی هەمان مەنتیقی سەرهەڵدانی بزووتنەی سوننەی ئیسلامی، دژی ئەمریکی و رۆژئاوایی بووەتە خاوەن بزووتنەوەیەکی وەها بەهێز، کە دەتوانێت جەماوەری پاکستان دژی سیاسەتی ئەمریکی هان بدات. لە رێگای پاکستانەوە و پاش پیادەکردنی سیاسەتی ئیسلامی (واتە ئیسلام بەشێک بێت لە دەوڵەت و سیاسەت) مەترسی لەسەر هیندستان، چین و ئاسیای ناوەراست دروست دەکات.

بەم شێوەیە پەیدابوونی بەرەیەکی ئیسلامی- سوننی عەرەبیی رانەگەیەنراوی بەهێز، پرچەک، پارەدار و خودان لە شوێنێکی ستراتیژی وەکو دوورگەی عەرەبی و میسر، عێراق و ولاتانی شام و بەهاوپەیمانیی ئیسلامی ناعەرەبی (تورکیا، ئێران، ئەفغانستان و پاکستان و تەنانەت ئیندونیسیا و مالیزیاش) دەتوانێت مەترسییەکی گەورە لەسەر بەرژەوەندی تەواوی دنیا دروست بکات. یەکەمین مەترسی دژی ئیسرائیل دەبێت و هەرەشەی لێ دەکرێت لەلایەن باڵە توندرەوەکانی ئەو بزووتنەوەیە (حەماس و جیهاد)، پاشان هەرەشە لە کوردستان دەکرێت (دواتر بەباشتر باسی دەکەین)، هەرەشە دەبێت لەسەر کۆمارەکانی ئاسیای ناوەراست و هەژموونی رووسی لەو ناوچەیەدا، هەرەشە دەبێت لە هیندستان بەهاندانی ئیسلامی هیندستان کە نزیکەی ١٥٠ ملیۆن کەس زیاتر دەبن، ئیسلامی کشمیر، هەرەشە لە چین بە هاندانی ئیسلامییەکانی چین و هەرەشەی جیددیتر دەبێت لە هەردوو ولاتانی ئەندونیسیا و مالیزیا وەکو دوو ولاتانی ئیسلامی- سوننەی پڕ دانیشتووان و دەوڵەمەند و خاوەن جێگای گرنگ لە نێوان هەردوو ئۆقیانووسی هیندی و ئارام و سەرەنجام ئوسترالیاو فلیپینیش دەکەونە بازنەی ئەو هەرەشەو مەترسییەوە.

# کاریگەریی بەرەی ئیسلامی- سوننی- عەرەبی لەسەر کوردستان

هەروەکو باسمان کرد سەدەکانی پێشوو (١٥٠١- ١٩٩١) دەتوانرێت بە سەردەمی گەمارۆی جیهانی و ناوچەیی دابنرێت و دژی دۆزی کوردی و ئەو جێگیری و هاوسەنگییانەی کە بەردەوام بوو لەسەر کورد، هەرچەندە چار بەچار هێزە دەسەڵاتدارەکان ئاڵوگۆڕیان دەکرد، بەڵام هەمان ڕەوشی دژ بەکورد هەر بەردەوام بوو. لەدوای ساڵی ١٩٩١ ڕەوشێکی دیکە بۆ کوردستان پەیدابوو، لەگەڵ پەیدابوونی بزووتنەوەی کوردی لەهەر سێ وڵاتی تورکیا، ئێران و عێراق (حکوومەتی کوردستان) وەکو دەزانین بەردەوام کۆسپی گەورەی بەردەم کێشەی کورد (بەتایبەتی لەدوای هاتنی بەریتانیا) فەرامۆشکردنی ئەو وڵاتانە بووە بۆ کورد و زۆرجاریش ئاشکراو ڕاستەوخۆ دژی کورد چوونەتە پاڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە، پاش نەمانی هەژموون و هەڕەشەی سۆڤیەتی بەسەر ئەم ناوچەیە و هاتنی ئەمریکا بۆ ناوچەکە، بەڵام هێشتا بۆشاییەکی دەرەوەی کۆنترۆڵی جیهانی کە ئەمریکا سەرکردایەتیی دەکات، هەیە. واتە هەروەکو لە سەرەتاوە و بەپێی لێکدانەوەکەی بریژنیسکی وتمان کوردستانیش دەبێتە بۆشاییەکی دەرەوەی دەسەڵات و لەلایەن هەردوو بەرەی ئەمریکی- ڕۆژئاوایی و ئیسلامی- سوننی- عەرەبی چاو براوەتە کوردستان و هەر یەکێکیان دەیەوێت ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە، کە لە ئەنجامی سەدان ساڵ داگیرکردن و چەوسانەوەی کوردستانەوە پەیدابووە.

لەلایەن بەرەی ڕۆژئاواوە کوردستان دەبێتە پانتاییەکی جوگرافی و قووڵاییەکی مێژوویی، ناسنامەیی و سیاسی بۆ لەبەریەکترازانی سێ هێزی گەورەی ئیسلامی (عەرەبی، تورکی و فارسی) کە دەسەڵات و خەلافەتی ئیسلامی لەم سێ نەتەوەیەوە سەرچاوەی دەگرت و نەمری و شانازیی ئیسلامیش دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتی ئەو سێ نەتەوەیە بەسەر ناوچەکەدا. سەرەنجام وەکو مەنتیقی مێژوویی- ئەسنوگرافی و سیاسی، ئیسلام، دەبێتە پایەیەکی بەهێزی ناسنامە و بوونی نەتەوەیی ئەو سێ هێزە و لە بونیادیاندا ئیسلام بەهێز دەبێت. لەبەرئەوەی کورد بەدرێژایی مێژووی

ئیسلامی کۆیله و چەوساوەی ئەو سێ دەسەڵاتە ئیسلامییە بووە، بۆیە وا چاوەڕوان دەکرێت کە بەهۆی کوردەوە سیاسەتێکی نائیسلامی لە کوردستان و ناوچەکەدا پیادە بکرێت، سیاسەتی نوێی ئەمریکی و ڕۆژئاوایی لەدوای بانگەشەی سیستەمی نوێی جیهان بۆ ئارایشتدانەوەی جیهان و گۆڕینی نەخشەی سیاسیی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جێگیریی نێودەوڵەتیی ئایندە، وا دەخوازێت کە هێزە گەورەکان سیاسەتێکی داڕێژراو لەسەر بناغەی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی- دیموکراتی و هاریکاریی ناوچەیی، ڕێکخستنی جیهانی لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ڕۆژهەڵاتی دوور، ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ئاسیای ناوەڕاستدا بەپێی ئەم تیروانینە هاوسەنگ بکەنەوە. بەرئەنجامی ئەم سیاسەتەش، کە بێگومان شکست و هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریی سۆڤیەتی، باشترین زەمینەی بۆ ئەم کارە (نەخشەیە!) ڕەخساند، ئەوەیە کە لەبەرامبەر هەر هەوڵێک، بیروباوەڕێک و سیاسەتێکدا بووەستن کە بناغە و ڕەوایی دەداتە دەست دەوڵەت و هێزەکان کە لەدەرەوەی سنووری خۆیان چالاکی بکەن. تاکە بەرەیەک کە ئێستا دژی ئەو ستراتیژە (نەتەوەیی، دیموکراتی و هاریکاریی ناوچەیی و جیهانی)یەدا دەوەستێت بوونی بیروباوەڕو هەوڵی بەرەی (ئیسلامی- سوننی- عەرەبی)یە. بۆیە دەبێت ئەمریکا و ڕۆژئاوا دژی ئەو بەرەیە خۆیو دنیا سازبدات و زەمینەی ستراتیژی خۆی لە ناوچەکەدا، فەراهەم بکات..

یەکێک لەو ناوچە گرنگانەی کە ڕێگەو ڕەوایی دەدا بەئەمریکا کە کاری تێدا بکات و ڕێکخستنی ئایندەی بۆ ساز بکات، بێگومان کوردستانە.

کورد، وەکو نەتەوەیەکی چەوساوەی ژێردەستی سێ هێزی ڕەسەنی ئیسلامی، دەتوانرێت لە هەموو میللەتێکی دیکە زیاتر ئەو سیاسەت و ستراتیژەی تیا پیادە بکرێت. لەبەرئەوەی کێشەی سەرەکیی کورد، ئەوەیە کە خاوەن قەوارەو دەوڵەتی نەتەوەیی- دیموکراتیکی خۆی نییە، واتە چەوسانەوەی سەر کورد، چەوسانەوەی دینی نییە و کەس ڕێگەی لێ نەگرتووە کە ئیسلام نەبێت، بەڵکو چەوسانەوەیەکی نەتەوەیی و نەژادییە و هەر لێرەشەوە ئەو هەموو کارەساتانە لە ئەنفال و جینۆسایدەی بەسەردا هاتووە. ئەگەر نەتەوە غەیرە عەرەبییەکانی وەکو (تورک، ئەفغانی، پاکستانی، ئاسیای ناوەند و ئەندۆنیسیایی و مالیزیایی) ئیسلام بەشێک

بێت لە ناسنامەیان، ئەوا ڕێک بەپێچەوانەوە ئیسلام هێزێکی چەوسێنەری ناسنامەی کوردی بووە لەڕابردوودا.

هەوڵی بەرەی ئەمریکا- ڕۆژئاوا بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییی کوردی (ئەگەرچی لە بەرژەوەندی خۆیانە)، بەڵام گەلێک قازانجی گەورەی بە کوردیش کردووە، یارمەتیدانی بزووتنەوەی نیشتمانی- دیموکراتی کوردستان لەڕێگای یارمەتیدانی هەردوو هێزە سەرەکییەکەی کوردستان، پاراستنی ناوچەی ئاسایشی کوردی و حکومەتی کوردستان و پشتیوانیی دیبلۆماسی و سیاسی بۆ کورد، لەلایەن هەرسێ فراکسیۆنە گەورەکەی ڕۆژئاواوە (ئەمریکا، بەریتانیا و سۆسیال- ئەنترناسیۆنال) کە ئێستا ئەوان سیاسەتی کوردیان هەیە (دەبێ ئەوە بزانین کە دوو زلهێزی دیکەی جیهان چین و ڕووسیا تا ئێستا سیاسەتی کوردییان نییە)، بڕیاری ٦٨٨ی نێودەوڵەتی کە زۆرترین قازانجی بۆ کورد. باشترین سیاسەتیش کە تا ئێستا لەلایەن ڕەوتی دەسەڵاتداری دنیاوە، بۆ کورد کرابێت و بەم جۆرە کورد ئێستا بەشێکە لە ستراتیژو سیاسەتی غەربی و ئایندەش ئەم ئاسۆیە باشتر دەنەخشێنێت.

لەلایەن بەرەی ئیسلامی- عەرەبی- سوننی (ناوچەیی): کورد وەکو پردێک بۆ پێک بەستنەوەی هەرسێ هێزە ئیسلامییەکە چاوی لێ دەکرێت و بە سوودوەرگرتن لەوە کە کورد بەشی زۆری ئیسلام و سوننەن، هێشتا کورد سیاسەتی دینی- نەتەوەیی نییە (واتە سەرچاوەکانی دینی کوردی نەخراونەتە خزمەتی ناسنامەی نەتەوەیی، کە ئەمەش بەتەنها بەدەسەڵاتی کوردی دەکرێت، ئەگەرچی زەمینەکەش لەناو کوردبووندا هەیە) بۆیە دەبینین لە ڕواڵەتدا کورد بەشی زۆری دەبێتە ئیسلام (باشتر ئەمە باشتر ڕوون دەکەینەوە). کورد بەردەوام و تا ساڵی ١٩٩١ لەلایەن هێزە گەورەکانی دنیا فەرامۆش و زۆرجاران سەرکوتی ڕاستەوخۆش کراوەو بەکورتی کوردستانیش وەکو ئەفغانستان و ئاسیای ناوەڕاست، بەشێکە لە بۆشاییی دەرەوەی دەسەڵات و هێشتا بەیار و نەکێڵدراوە و سیاسەتی هێزێکی جیهانی یان ناوچەیی کۆنترۆڵی نەکردووە.

هەروەکو چۆن کوردستان دەتوانێت بەشێک بێت لە سیاسەت و ستراتیژی ئەمریکی- ڕۆژئاوایی بۆ جێگیرکردنی ڕەوشی ئاسایش و هاوسەنگیی جیهانی و

ناوچەیی، بەپێی بنەمای نەتەوەیی- دیموکراتی- هاریکاریی جیهانی و ناوچەیی، هەر بەو شێوەیەش (لە کاتی شکستی بەرەی یەکەمدا) دەتوانێت بەشێک بێت لە ستراتیژی ئیسلامی- سوننی- عەرەبی و سەپاندنەوەی هەمان ژیان و ڕەوشی خەلافەتی ئیسلامی (ڕاشدی، ئەمەوی، عەباسی، عوسمانی و سەفەوی) بەسەر کوردستانداو دیسان دابەش و داگیرکردنەوەی کوردستان و نەهێشتنی ترووسکاییی ئەو بوون و ناسنامەیەی کە تا ئێستا بەهۆی خەبات و شۆڕشی کوردی بەدەست هاتووەو پارێزراوە، بەرەی ناوبراویش هەروەکو بەرەی ئەمریکی وازی لە گەمارۆی ناوچەیی دژی کورد هێناوە (باشترین خاڵی بەیانکردنی ئەو گەمارۆیە بە بەشداری ڕاستەوخۆی دەوڵەتانی ئیسلامی و عەرەبییە دژی هەموو شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردو دەنگ نەکردن و شاردنەوەی جینۆساید و ئەنفالی کوردیشە لەم ساڵانەی دواییدا)و لە بری ئەو سیاسەتە ئەوانیش هەستاون بەسیاسەتی پڕکردنەوەی بۆشاییی کوردی و لەڕێگای ئەحزابی ئیسلامیی دەستکرد و وابەستەی خۆیانەوە. دەبێت هەموو بپرسین بۆچی لەپێش ڕاپەڕیندا حزبی ئیسلامیی کوردی بەهێزو چەماوەری بوونی نییە، ئەگەر چالاکی ئیسلامییش هەبووایە وەکو تاک و گرووپی زۆر بچووک هەبوون، بەڵام لەدوای ڕاپەڕین حزبی ئیسلامیی چەکدار و پارەدار لە کوردستاندا دەردەکەون. هەردوو بەرەی عەرەبی و ئێرانی لەسەر ئەوە ڕێک دەکەون کە یارمەتیی حزبە ئیسلامییەکانی کوردستان بدەن و بەم جۆرە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بزووتنەوەیەکی ئیسلامی (حازرو ئامادە) بۆ کوردستان دروست دەکرێت.

هەرچەندە زەمینەکانی شەڕی ناوخۆی بێ مانا و بێ هۆی کوردی، زەمینەی ئیسلام بوونی کورد و فرسەت وەرگرتن لە وەزعی خراپی ماددیی خەڵک (بەتایبەتی پێش بریاری ٩٨٦) ئەم بزووتنەوانە بەچەکی ئێران و پارەی سعوودیە و خەلیج بەهەردوو باڵی چەکدار و سیاسی (بەناو ریفۆریست و دیموکراتی) هاتنە کوردستانەوە و پشتیوانیی مادی و سەربازیی ئەوان وای کرد کە ئەو حزبانە ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو گەشەکردن بچن. ئەم حزبانەش هەروەکو تالیبان و بەعس هیچ دەورێکی نیشتمانییان نەبوو لەخەبات دژی داگیرکەرانی ئەو وڵاتانە، بەڵام لەدوای ڕزگاربوون و بەماوەیەکی زۆر کورت، لە عیراق ١٩٥٨- ١٩٦٣ بەعسیان کردە حزبی سەرەکی و دەسەڵاتدار، لە ئەفغانستان ١٩٨٩- ١٩٩٤ تالیبان دەسەڵاتی داگیرکرد، لە

کوردستان ۱۹۹۱- ۱۹۹٦ حزبە ئیسلامییەکان سازو دروست کران و لە ئەنجامی پارەی سعوودی و خەلیجی و ئیبتزازی دەوڵەتانی ئیقلیمی، ئەم حزبانە بوونە یان کرانە (یەک شەویلەی پەل قەویلە)و برابەشی بزووتنەوە و ڕاپەڕین و دەسەڵاتی کوردی و لە یەکەمین فرسەتی هێرش و هەژموونی جیهانی و ناوچەییدا کارەساتی گەورەیان لە کوردستان خوڵقاند و حزبێکی چەکداری تیرۆریستی ئیسلامی- عەرەبی- ئەفغانییان لەکوردستاندا قوت کردەوە و قەسابخانەیەکی لە شێوەی جەزائیریان بۆ ئاواییی «خێڵی حەمە»ی ناوچەی شارەزوور، سازکرد.

## جیهانی پاش ۹/۱۱

داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن ئوسامە بن لادن و قاعیدەوە، لەڕێگای تالیبانەوە، بە سەرەتای ڕەوشێکی نوێ و تەرتیبێکی تازە دادەنرێت لە جیهاندا، بێگومان پاش ئەوەی کە لە سالانی رابردوودا ۱۹۷۹- هەتا ئێستا لە هەموو ئاراستەکانی جیهانی، عەرەبی- ئیسلامیدا هێزێکی پەدەکی ئیسلامی و جەماوەری دێتە کایەوە و دەتوانێت شەقام و جەماوەری ئیسلامی و عەرەبی دژی بەرەی ڕۆژئاوا بخاتە کار. هەڕەشەی ئیسلامی بە هێزی پاکستان لە ئاسایشی هیند و چین، هەڕەشەی ئیسلامی پاکستان لە ئەندونیسیاو فلیپین و ئوستورالیا، هەڕەشەی تالیبان و ئیسلامیزمی ئەفغانستان لە کۆمارە ئیسلامییەکانی سۆڤیەتی جاران و ئاسایشی ناوچەی نفووزی رووسیا، هەڕەشەی جیهانی ئیسلامی و عەرەبی لە هەژموونی ئەمریکا- ڕۆژئاوا لەسەر جیهان و تەنانەت لەسەر خودی ئاسایشی ئەمریکی و ئەورووپی هەروەکو لە هێرشەکانی تیرۆریزمی ئیسلامی ئەم سالانەی دواییدا دەبینین و کە لە۱۱ ۹/ی ئەمساڵدا کارەساتی گەورەی بەشەری و تیرۆریستییان لە واشنتۆن و نیویۆرکدا نایەوە. هەموو ئەمانە پێویستی بە بوونی بەرەیەکی دیکەی جیهانی هەیە کە بەسەرۆکایەتیی ئەمریکا کە هێزە سەرەکییەکانی ئەمانەن: ئەمریکا، ئەورووپا، ڕوسیا (کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست)، چین، هیندستان و ئوستورالیاو تەواوی بەرەی دیموکراسی و بەدژیشیان بەرەیەکی ئیسلامی- عەرەبی- سوننی (ڕانەگەیەندراو) ئەویش لە ترسی شکستی چاوەڕوانکراوی هێزی گەورەو کاریگەری

سەربازی، مالّی، شارستانی و جەماوەریی بەرەی یەکەم، نەوەکو لە دنیای پاش ١١/٩و پیرۆزی بەرەی یەکەمدا، هیچیان بەر نەکەوێت (کە بێگومان جگە لە فەرامۆشکردن و پاشان توورەبوون هیچیان بە نسیب نابێت).

ئەگەر ئەوە بزانین لە جەنگی دژی عێراق لە سالّی ١٩٩١، بەشی هەرە زۆری دەولّەتانی عەرەبی و ئیسلامی ڕاستەوخۆ چوونە پالّ ئەمریکاو هاوپەیمانی جیهانی و ناوچەیی بۆ ڕزگارکردنی کوێت، بەلاّم هیچ دەولّەتێکی ئیسلامی و عەرەبی (جگە لە تورکیا، پاکستان و ئاسیای ناوەڕاست کە ئەوانیش بەشێوەیەک لە شێوەکان هەست بەترسناکیی هەژموونی عەرەبی ئیسلامی دەکەن لە جیهانی ئیسلامدا) نەچوونە پالّ شەڕی ئەمریکی- ڕۆژئاوایی دژی تالیبان و بن لادن و تەنانەت جەماوەر و شەقام و دامەزراوە ئیسلامییەکانیش (کە هەندێکیان ڕەسمین وەکو ئەزهەری میسر و جەمعیەتی عولەمای پاکستان)و میدیاکانی ڕاگەیاندنی عەرەبی، بەئاشکرا چوونەتە پالّ بەرەی دژی ئەمریکی.

ئەم ڕەوشە نوێیەی جیهان ڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر دنیای ئیسلام و عەرەبی دەبێت (بێگومان پاش سەرکەوتنی بەرەی یەکەم)و هەموو ئەو ولاّتانەش کە چوونەتە پالّ ئەو بەرەیە، دەستکەوت و قازانجیان وەبەر دەکەوێت و ستراتیژی نوێی ئەمریکا و ڕۆژئاوا دژی پان عەرەبیسم و پان ئیسلامیزم(١٤) لە سەدەی نوێدا دادەڕێژرێت و ڕێکخستن و هاوسەنگییەکی نوێی جیهانی دیموکراتی دادەمەزرێت و شەڕی ساردی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەت (روسیا!) لەناودەچێت و چینیش دەکەوێتە ناو بازنەی ڕۆژئاوا و هەروەکو چۆن لە دوای شەڕی دووەم ژاپۆنی ئەوپەڕی ڕۆژهەلاّت کەوتە ناو بازنەی دیموکراتی و ڕۆژئاوایی.

## ئەلّتەرناتیفی کوردی

لە دوای سالّی ١٩٩١ بەدواوە دوو هەلومەرجی گرنگی کاریگەر لە بەرژەوەندی کوردیدا هاتووەتە کایەوە، یەکەم، پێکهاتنی دەسەلاّتێکی کوردی و درێژخایەن ١٤ سالّ و دووەم، بووژانەوەی کوردی لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، کە ڕێگای هاوکاری و کۆدەنگی هێزە کوردییەکان لە دەوری ئەلّتەرناتیفێکی گونجاو بۆ ڕەوشی

نوێی جیهان و کورد دەرەخسێت.

أ- هاریکاریی هێزە سەرەکییەکانی کورد، لە دەوری بەرنامەی نەتەوەیی-دیموکراتی و هاوکاریی ناوچەیی و جیهانی لەگەڵ بەرەی نوێی پێکهاتوو دژی بەرەی بونیادگەری تیرۆریزمی ئیسلامی کە هەرچی زیاتر بەرەو دیموکراسی بوون و گفتوگۆی شارستانییەکان و سیستەمی نوێی جیهان بەبێ دابەشبوون بەسەر جەمسەرەکان و بەرەوچاوکردنی پاراستنی بەرژەوەندییەکان. هێزە سەرەکییەکانی کورد مێژووی پرسەروەری و پرشنگداریان لە بزووتنەوە و ناسنامەی کوردیدا هەیە، دوای ڕێککەوتنیان دەتوانن هێزێکی کاریگەر لە ناوچەیەکی هەستیار و گرنگدا، پێک بهێنن کە جیهان و ناوچەکەش ناچاردەبن وەکو پێداویستییەکی سیاسی و جیۆپۆلەتیکی لەگەڵ پرسی کوردیدا ڕێکەوتن سازبدەن. دەرچوونی هەر یەکێک لەو هێزانە و بەشداری نەکردن لەو پەیمانە جیهانی و ناوچەیدا بەدژی تیرۆریزمی ئیسلامی، دەبێتە خاڵێکی لاوازو کاریگەری نێگەتیف لەسەر بەرژەوەندی کورد. هێزە سەرەکییەکانی کوردستان، پێویستە لە دەوری پەیمانێکی نەتەوەیی و دیموکراتی کوردستان کۆببنەوە و هاوپەیمانی خۆیان لەگەڵ بەرەی دیموکراتی و جیهانی پاش ۹/۱۱ ڕابگەیەنن، بەو پێیەش چیمان پێ دەکرێت بۆ سەرخستنی پێداویستییەکانی ئەو بەرەیە، لە ناوچەکەدا دریغی نەکەن.

ب- پەیمانی کوردی لەدەوری نەتەوەیی و دیموکراتی بوون دەتوانێت ئەڵتەرناتیفێکی باش و گونجاو و بەپەلە بێت بۆ ئەم سەردەمە، بەو هۆیەوە دەتوانین بۆشاییی بڕیاری کوردی پڕبکەینەوە و لەقەدەر پێداویستی هەنگاوی گونجاو بهاوین. ئەگەر ئاگاداری بیروڕای شارەزایانی سیاسی و ستراتیژی ئەمریکا ببین و بزانین ئەوان سەبارەت بەڕەوشی نوێی جیهان و پرسی کوردی دەڵێن چی، بۆمان دەردەکەوێت کە دەتوانین بۆ مەیسەرکردنی بەرژەوەندی خۆمان لەگەڵ بەرەی ئەمریکی- ڕۆژئاواییدا یەک بگرینەوە لەسەر بناغەی سیاسەتی نوێی ئەمریکا لە ناوچەکەدا کە دامەزراوە بەپێی بونیادی نەتەوەیی، دیموکراسی و هاریکاریی جیهانی کە دەبێت لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە مافی ڕەوای نەتەوەکان

بەرِەسمی بناسرێت و ئەم مەسەلەیە لە ئەوروپای رۆژهەلات و ئاسیای ناوەراست و رۆژهەلاتی ناوین پیادە بکرێت و کوردەکانیش ئەو سیاسەتە بیانگرێتەوە[١٥].

ریتشارد نیکسۆن کە سەرۆکی سالانی حەفتای ئەمریکا و قسەکەری بالی راستی سیاسەتی ئەمریکییە لەو باوەرِەدایە کە نیگەرانیی ئەمریکا بۆ کورد، دەبێت هەمان نیگەرانیی ئەمریکا بێت بۆ قوربانییانی کوشتاری یەهودەکان لە دووەم جەنگی جیهانی کە لە دلسۆزی راستەقینەوە سەرچاوەی گرتووە، نەک لە بەرژەوەندی جیۆپۆلۆتیکی، هەرچەندە ئەو کارەساتانەی کە دامێنگیری ئەم دوو نەتەوەیە (کورد و یەهود) بوون لەم بەرژەوەندییە سیاسییانە جیا ناکرێتەوە.[١٦]

## کوردستان و نەخشەیەکی نوێ لە خۆرهەلاتی ناوین!

ئایا دیپلۆماسیی ئەمریکاو رۆژئاوا جارێکی دیکە دۆسیەی کورد دەگرنەوە ئەستۆی خۆیان؟ کە لە رابردوودا بەردەوام چاوپۆشییان لێ کردبوو، بگرە زۆرجاریش دژی کاریان کردبوو. بە شێوەیەکی ترسناک پرسی کورد گەلێک کارەسات و مەرگەساتی گەورەی دیوە، تا سەرەنجام ئەمریکاو رۆژئاوا لە سەرەتای سالانی ١٩٩٠ بەدواوە سیاسەتی کوردییان پەیداکردەوە. یەکێک لەو دیاردانەی کە دەمانەوێت باسی بکەین کرنگیی چاپەمەنی و میدیای ئەمریکایە، سەبارەت بە کێشەی کورد. لە سالی ١٩٩١ بەدواوە بە شێوەیەکی ناسروشتی ئەو گرنگیدانە لە لایەن سیاسەتمەداران و رۆژنامەوانانەوە دەرکەوت، لەو سالەدا دوو کەس لە سەرنووسەرانی زۆر کاریگەری ئەمریکی کە ئەوانیش (جیم هوگلاندو ستیفن رۆزنفیلد) لە رۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) بۆ یەکەم جار (لایەنی باشی) دابەشکردنی عێراقیان باس کرد[١٧]، لەو کاتەی کە دروست چاپەمەنییەکانی فەرەنسا بانگەوازو پشتگیریی یەکێتیی خاکی عێراق دەکەن. جیم هۆگلاند نووسیبووی: سەردەمی ئەوە بەسەرچووە بە ترسەوە باس لە گۆرِانەکان بکەین، سەرنووسەری واشنتۆن پۆست دەلێ: تەلیسمی دەسکاری نەکردنی سنوورەکان شکستی خواردووە، بە تایبەتی لە ئەوروپا، شورەویی جاران و یوگوسلافیا. ئەی بۆچی هەولْ نەدەین ئەو تەلیسمەش لە خۆرهەلاتی ناوەراست لەناوبەرین و وەختی ئەوە هاتووە کە "واشنتۆن یەکێتیی خاکی عێراق، وەکو

بەهایەکی پیرۆز کە بووەتە مایەی ڕۆژە ڕەشی و کارەساتی نەتەوەکان، سەیرنەکات".

ستیفن ڕۆزنفیلد لە ڕۆژنامەی «هیرالد تریبۆن» لە وتارێکی دژ بە «دانیال بیمان»، لێکۆڵیاری میت: (دابەشبوونی عێراق بۆ سێ پارچە، سێ کێشە دروست دەکات)، ئاوا وەڵام دەداتەوە: دابەشبوونی عێراق کۆتایی بە هەڕەشەی بەردەوامی ڕژێمی سەدام حوسێن لە دژی وڵاتانی کەنداو و ناوچەکە دەهێنێ، یارمەتیی شیعەکانی باشوور و کوردەکانی باکوور دەدات، خواستەکانیان پیرۆز بکەن. ستیفن ڕۆزنفیلد لە دوای پەسەندکردنی ئەوەی کە تێزی دابەشنەکردنی عێراق بە پێچەوانەی "شەپۆل و گۆڕانکاری و هاوکارییەکانی ئێستای جیهانە" بەو شێوەیە ئەنجامی گرت کە سەر کۆماری ئەمریکا ناتوانێ چاو لەم پەیوەندییە بپۆشێت. هەر پاشەکشەیەکی نێودەوڵەتی، هەر جۆرە نەیارییەک لە دژی پرسی کورد، تەنها ناوچەکە دەخاتە ئاستانەی تەقینەوە.

ئاشکرایە کە سەرەتای چارەسەری پرسی کورد بەوە دەبێت، کە لانی کەم پێویستە ڕێگاچارەی دیموکراتی لە چوارچێوەی سیستەمی فیدراڵیدا بەسەر دەوڵەتانی ناوچەکەدا بسەپێنرێت و لە عێراق و تورکیاوە دەست پێ بکرێت. ئەگەر ئەو دەوڵەتانە چارەسەری دیموکراتییان پەسەند نەکرد، ئەرکی سەرشانی ئەمریکاو (ڕۆژئاوایە!) لە ڕێگای دەسکاری کردنی سنوورەکانەوە (تەلیسمەکانەوە!) چارەسەری گونجاو بۆ پرسی کوردو نەخشەیەکی نوێش بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدی بهێنن. دیارترین و گونجاوترین ڕێگاچارەش پاراستن و گەشەپێدانی ئەزموونی ئێستاو بەهێزکردنی دەسەڵات و پارلەمانی کوردە لە باشووری کوردستان. ئەویش بەوە دەبێت کە ئەمریکا ڕایب گەیەنێت کە ئەم "دینامیک" و "ئەزموونە" دەتوانێ بەرەو دەوڵەتی سەربەخۆی کورد لە کوردستانی وابەستەکراو بە عێراق، بچێت. دەبێت زۆر چاک ئەوەش بزانین کە ئەم سیاسەتە دەبێتە هۆی نارەزایی دەوڵەتانی ناوچەکە، هەر لە سووریا بگرە هەتا عەرەبستانی سعوودی و میسرو توونس و ئۆردون. بەڵام سەردەمی ئەوە هاتووە کە بە دوو بەیان و بە دوو زمان کۆتایی بهێنین، واتە دەبێت سیاسەتی ئەمریکا ڕۆشنتر بدوێ و بە ئاشکرا ڕێگاچارەی نیشتمانی- دیموکراتی و هاریکاریی ناوچەیی کە بووەتە ستراتیژی نوێی جیهان، بدرێت بە گوێی ئەو دەوڵەتانە. ئەمریکا

دەبێت بە ڕاشکاوی بڵێت کە جیهان و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەشداربوون لە ستەم و چەوسانەوەی کوردان، جارێکی دیکە وتەکەی «جۆناسان ڕاندڵ» دووپارە نەبێتەوە: (پاش ریسوایی، چی ماوە بۆ لێبووردن)(١٨).

بەهانەهێنانەوە، بۆ ئەوەی کە ئەمریکا نایەوێت بە هۆی کوردستانەوە "ئیسرائیلی دووەم" سازبکات، ناتوانێت دەرمانی هیچ دەردێک بکات. واتە نە بەردێک دەخەنە سەر ئاوەدانی کوردستان و نە دەتوانن دەوڵەتانی ناوچەکەش ڕازی بکەن. ئەمریکا دەبێ وڵاتانی عەرەبی وادار بکات و ڕێگاچارەی کۆتاییهێنان بە کارەساتی کوردان پەسەند بکەن و ئەگەر ئەم چارەسەرەش ببێتە هۆی دابەشبوونی عێراق(١٩). بەرژەوەندی دەوڵەتانی عەرەب لەوەدایە، بە تایبەتی لە ئایندەدا لە جیاتی پاراستنی هەلومەرجی ئێستا کە سەرچاوەی هەموو مەترسییەکانە، چارەیەک بۆ کێشەی کورد پەیدابکرێت ئەگەر ئەو چارەسەرە بە بەهای دابەشبوونی "وڵاتێکی برای خۆشیان" بێت.

سەردەمێک بوو هەموو هەوڵە دیپلۆماتی و سەربازییەکانی تورکیا بۆئەوە بوو کە "ناوچەی ئاسایشی" تایبەت بە خۆی لە خاکی باشووری کوردستاندا سازبکات. کاتێک کە سلێمان دەمیریل سەرۆکی تورکیای پێشوو بە ئاشکرا دەیوت ویلایەتی مووسڵ "هەمیشە سەر بە تورکیایە" یان ئەوەی کە تانسۆچیلەری وەزیری دەرەوەو پاشان سەرۆک وەزیران لە مەسعوود بارزانی داوای دەکرد "دەورێکی زیاتر بدرێت بە تورکمانەکان" ئایا تورکیا بەم کارانەی دەتوانێ بانگەوازی ئەوە بکات کە ڕێز لە یەکێتیی خاکی عێراق دەگرێت، یان ئەم بەهانەیە تەنها دژی کورد بەکاردەهێنێ؟ چونکە تورکیا بەردەوام یەکێک بووە کە دەستێوەردانی لە یەکێتیی خاکی عێراقدا کردووە.

بەڵام لە دوای ڕووخانی بەعس و سەدام و ئازادکردنی تەواوی باشووری کوردستان لە لایەن هێزی پێشمەرگە و ئەمریکا و هاوپەیمانانەوە، دوو ئاماژەو ڕەوشی گرنگ سەبارەت بە نەخشی تورکیاو کاریگەری لەسەر کوردستان پەیدابوون: یەکەم، تورکیا لە پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق و ڕووخانی دەسەڵاتی بەعس و سەدامدا، نەیویست هیچ ڕۆڵێکی کاریگەر ببینێ و بگرە بووە کۆسپ لە بەردەم

هاتنی هێزەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانان لە خاکی خۆیەوە بۆ عێراق و بەمەش لە گرنگترین و کاریگەرترین گۆڕانکاریی سیاسیدا لە ناوچەکە بەشدار نەبوو، کە ئەمریکا ڕابەریی دەکرد ئەم هەڵوەمەرجە نەخشی تورکیای وەکو هاوپەیمانێکی نەریتی ئەمریکاو ڕۆژئاوایی لاواز کرد. دووەم، گرەوی تورکیا لەسەر هێزو کاریگەریی تورکمانەکانی عێراق لە هەڵبژاردنی گشتیی سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥دا بە تەواوی شکستی خوارد و ئەم هێزە پاشکۆیەی تورکیا نەیتوانی دەنگێکی وا بە دەست بهێنێ کە بانگەوازەکانی تورکیا بسەلمێنێ. بەدەستهێنانی دەنگی یەکەم لە لایەن لیستی برایەتیی کوردەوە لە شاری کەرکوک، کە تورکیا بە شاری تورکمانی وابەستە بە خۆی دەزانێ، تەواوی بانگەوازی ناڕاستی تورکیای لەم شارەدا ئاشکراکرد.

ئێرانیش هەمیشە کاردانەوەو دەستێوەردانەکانی لە کوردستانی باشوورو هێرشەکانی ڕوو لە زیادبوون بووە. لە دوای ڕووخانی سەدام یارمەتیدانی تیرۆریزمی سوننەی ئیسلامی لە لایەن دەوڵەتی (شیعەی) ئێرانی یەکێکە لە ڕەوشە ترسناکەکانی ئەم دەوڵەتە دژی پرۆسەی ئازادی و دیموکراسی لە عێراقدا. دروستکردن و یارمەتیدانی هێزە ئیسلامییەکان لە باکوورو باشووری عێراقدا، هەر لە لایەن ئێرانەوە بووە. هەر ئەو دەوڵەتە نەبوو کە دەیویست شۆڕشی ئیسلامی لە عێراقدا بەرپابکات و ڕژێمێکی ئیسلامیی وابەستەو هاوشێوەی خۆی بخاتە سەر دەسەڵات. بەمجۆرە ئێران چۆن دەتوانێت لایەنگری لە یەکێتی خاکی عێراق بکات؟ یان ئەویش، ئەم دروشمە تەنها دژی کوردو دەسەڵات و هەرێمی کوردستان بەکاردەهێنێ!

ئەمریکا (ڕۆژئاوا) چەند ڕەخنەی سەرەکییان لە دەوڵەتی ئێران هەیەو ئەو دەوڵەتە بە یەکێک لە هۆکارەکانی ناجێگیریی سیاسیی ناوچەکەو پشێویی جیهانی لە ڕەوشی تیرۆریزمدا دەزانن. ڕەخنەکانی ئەمریکا لە بەرامبەر ئێران ئایندەی ئەو دەوڵەت و (وڵاتە!) دیاری دەکات و بەم شێوەیە:

أ- ڕەخنەی ئەوان لە هەمبەر چالاکیی ئەتۆمیی ئێران بۆ کاری سەربازی و چەکداری.

ب- هەڵوێستی دژی ئەمریکا لە بەرامبەر هەوڵی ترسناکی ئێران بۆ یارمەتیدانی تیرۆریزمی ئیسلامی لە عێراق و ناوچەکە.

ج- پێشێلکردنی بەردەوامی مافەکانی مرۆڤ لە ئێران.

د- ڕەچاونەکردنی مافی نەتەوەو نەژادەکانی غەیرە فارس لە ئێران.

لە دوای ڕاپەڕینی ئاشتیخوازانەو خۆنیشاندەرانەی تەواوی کوردستانی ئێران هەر لە شنۆوە هەتا کرماشان و ئیلام و پاشان ناڕەزاییی خەڵکی عەرەبی خوزستان لە دژی ڕژێم، یەکێک لە ڕووداوە گرنگەکان ئەوە بوو کە هەڵوێستی ئەمریکاو لەسەر زمانی وەزارەتی دەرەوە یارمەتیدەرو لایەنگری مافی ئەو نەتەوانە بوو لە بەرامبەر چەوسانەوەی دەوڵەتی ئێرانی. لە دوای یازدەی سپتامبەرو ڕووخاندنی دەوڵەتی تاڵیبان، ئەمریکا ئێرانیشی خستە «تەوەری شەڕو تیرۆر»ەوەو ئەم دەوڵەتە دوا ساڵەکان یان دوا ساتەکانی خۆی دەژمێرێ.

سووریا، بۆ ماوەی زیاتر لە چارەکە سەدەیەکە لە هەوڵی پیلانە لە دژی دەسەڵاتی بەعسی سەدام و بەردەوام لە کاردا بووە بۆ سەرنگونی دەوڵەتی عێراق و هێنانە سەر دەسەڵاتی بەعسێکی هاوشێوەو وابەستەی خۆی بە ناوی (یەکێتی لەگەڵ عێراق) ئایا سووریا مافی ئەوەی هەیە ئەم دروشمە بەرز بکاتەوە. تەنها هۆکار بۆ ڕێکەوتنی سووریا لەگەڵ دروشمی یەکێتیی خاکی عێراق، تەنهاو تەنها بۆ دژایەتی کردنی کوردە. دیسان لە دوای یازدەی سپتامبر ئەمریکا سووریاشی خستە تەوەری شەڕو یارمەتیدەری تیرۆریزمی ئیسلامی و ڕەخنەو نەیاری ئەمریکا لە هەمبەر ئەم وڵاتە دوو لایەنی دیکەش دەگرێتەخۆ، هەڵوێستی دژی سووریا لە بەرامبەر پرۆسەی ئاشتیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە نێوان (ئیسرائیل و فەلەستین)، یارمەتیدانی سووریا بۆ تیرۆریستانی ئیسلامی لە عێراقی دوای سەدام حسێن.

بەم جۆرە هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان بەسەردا دابەش کراوە، وەکو دەوڵەتانی دەرەوەی جیهانی شارستانی و دیموکراسی ئەژمار دەکرێن، یان هیچ نەبێت هەموویان ڕێگرن لە پرۆسەی سازدانەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەسەر بناغەی دەوڵەتانی (نیشتمانی- دیموکراتی- هاریکاریی ناوچەیی) کە بناغەیەکی گرنگی سیستەمی نوێی جیهانە. بزووتنەوەی نیشتمانی و دیموکراتیکی کوردستان و لە

هەموو پارچە داگیرکراوەکانیدا هەر ئێستا چووەتە ڕەوشێکی زۆر لەبارو گونجاو، ئێستا بزاڤی کوردی (جگە لە بزووتنەوەی کوردستانی باکوور) بە یەکێک لە هاوپەیمانە گرنگەکانی ئەمریکاو ڕۆژئاوا دادەنرێت لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا. ئەم دوو ڕەوشە، واتە ڕێگری و کۆسپی دەوڵەتانی (عێراق، ئێران، تورکیاو سووریا) لە پرۆسەی ئازادی و دیموکراتیی ڕۆژهەڵاتی ناوین و هاوپەیمانی بزاڤی کورد لەگەڵ ئەمریکاو بەریتانیاو خۆرئاوا دەبێتە دوو سەرەتاو ئاماژەی گرنگ کە جارێکی دیکە ئەوە دەسەلمێنێ، کە کورد بووەتە بەشێک لە سیاسەت، بەرژەوەندی و ڕێوشوێنی ئەمریکاو ڕۆژئاوا لە ناوچەکەدا. ئەمەش سەرەتایەکی دیکەیە بۆ ئایندەی گەشی بزاڤی کوردی.

دەوڵەتی نوێی عیراق و پرۆژەی دەستووری عێراق و پرسی کوردان لەم وڵاتەدا بە پێشەنگی بزاڤی کوردستان دادەنرێت و ئێستا کورد لە هەموو زەمینەکانی کوردستانی، هەرێمایەتی و جیهانیدا وەکو هێزێکی کاریگەرو بەشداری گرنگ، لە پرۆسەی سیاسی عێراقدا بڕیاری بە دەستە. ئیدارەی کوردستان و سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان، دەسکەوتێکی نوێی ئەم سەردەمەیە لەپاڵ ئەوەی کە سەرۆکی کۆماری عێراق لە کوردەو بەبێ فراکسیۆنی کوردی لە پارلەمانی عێراقدا، هیچ پرۆژەو کارێک مەیسەر نابێت. لە هەڵبژاردنی سەرەتای ۲۰۰٥دا، کورد دەنگی یەکەمی لە شاری کەرکوک بەدەست هێنا. ئێستا تەواوی ناوچەکانی کوردستانی باشوور ئازاد کراوە، یان ڕاستەوخۆ بەدەست کوردەوەیە (وەکو، خانەقین) یان کورد تیا زۆرایەتییە و زۆربەی کارو ئیدارەکانی لە دەستە، وەکو (کەرکوک).

ڕاپەڕینی ئاشتییانە و خۆپیشاندان و نارەزاییی سەرانسەری کوردستانی ڕۆژهەڵات، ترسی بیست و شەش ساڵەی جمهووریی ئیسلامیی شکاند و ئەمجارە شارە کوردە شیعە مەزهەبەکانی کرماشان و ئیلامیشی گرتەوەو شیعەگەراییی دەوڵەتی ئیسلامی لە هەمبەر بزاڤی کوردانە و دیموکراتیکدا تێک دەشکێ و هەڵوێستی ئەمریکاش دژی ئەو دەوڵەتەو لایەنگری لە مافی مرۆڤ و مافی نەتەوەکان، دەبێتە سەرەتای کۆتاییی کۆماری ئیسلامی.

تورکیا ناتوانێ بۆ هەمیشە جەنگی دژی کورد، بە ناوی جەنگ دژی "تیرۆریزم!"

بەردەوام بکات، ئەم جەنگە ناوخۆیە کە هەتا نیوەی ساڵی ١٩٩٦ بیست و دوو هەزار کوژراوی لێ پەیدابوو بە شێوەیەکی ترسناک ئاسایشی تورکیای خستووەتە مەترسییەوە. کە یەکێک لەو مەترسییانە بە دەسەڵات گەیشتنی حزبی ڕەفای ئیسلامی بوو بە سەرۆکایەتیی ئەربەکان و ئێستاش حزبی عەدالەتی ئیسلامی لەسەر کارە. باشترین بەرژەوەندی دۆستانی تورکیا (ئەمریکاو ئەوروپا) لەوەدایە کە ئەو دەوڵەتە ڕازی بکەن کە ئایندەی تورکیا بەرەو ئەوروپا لە کەناڵی چارەی کێشەی کوردەوە تێپەڕ دەبێت، یان وەکو دەڵێن (ڕێگای تورکیا بۆ ئەوروپا بە دیاربەکردا تێپەڕ دەبێ). دیلی بیروباوەڕی تەسکی نەژادپەرستی تورکی، ناکارایی کەسانی لیبرال لەنێو بەرپرسانی تورک لە زەمینەی چارەسەری کێشەی کورد، چەوسانەوەی بەردەوامی حکوومەت و کۆمەڵ لە لایەن سوپاوە، تورکیای خستووەتە توندوتیژییەکی فراوانەوەو هێندەی نەماوە ئەو وڵاتە بەرەو تەقینەوە بڕوات.

سووریا کە بەشێکە لە دەوڵەتانی «تەوەری شەڕ» و بە هاوکار و یارمەتیدەری تیرۆریزم ناسراوە لە لایەن ئەمریکاوە، بازنەی هەرە لاوازە لە ناوچەکەداو بزاڤی کوردیش سەرەتای کاروانی خۆی دەست پێ کردووە و هێزە کوردییەکان بەرەو جۆرێک لە خەباتی هاوبەشی کوردانە و دیموکراسی هەنگاو دەنێن. سەرئەنجام سێ ڕەوشی زۆر بەهێزو کاریگەر لە قازانجی بزووتنەوەی کوردستان پەیدابووە، کە ئەو سێ زەمینەیە دەتوانێت گۆڕانکاریی گەورە لە ئایندەی نزیکدا لە بەرژەوەندی کورد پەیدا بکات.

ئەو سێ ڕەوشە کاریگەرەش ئەمانەن:

١- تەواوی دەوڵەتانی داگیرکاری کوردستان لە لایەن هێزی بڕیاردەرو دەسەڵاتداری جیهانییەوە کەوتوونەتە بەر ڕەخنەو نەیاری و تەنانەت هەردوو دەوڵەتی (ئێران و سووریا) خراونەتە بەرەی شەڕەوەو زۆر گومان و ڕەخنەی ئەمریکا بەرامبەر باڵی (شیعەو سوننەی عەرەبی لە دەوڵەتی عێراقدا هەیە) و تورکیاش بەو شێوەیە.

٢- لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا بزاڤێکی بەهێزو کاریگەری کوردی هەیە بۆ ئازادی و دیموکراسی، ئەمانە وێڕای ئەو هێزە کاریگەرەی کە کورد لە عێراقدا هەیەتی.

٣- نزیکبوونەوەی ئەمریکا و بەریتانیا و ڕۆژئاوا لە مافەکانی کورد بۆ ئازادی و دیموکراسی و هەر لەو ڕێگایەوە نزیکبوونەوەی لە هێزە سیاسییەکان.

بەدەستهێنانی مافەکانی خەڵکی کوردستان و پارچەکانی بۆ ئازادی و دیموکراسی و جێبەجێبوونی دروشمی مافی فیدراڵی بۆ هەریەکێک لەو پارچانە، بە سەرەتای گۆڕانی نەخشەی خۆرهەلاتی ناوین دادەنرێ بۆ ڕێکخستنی سیاسی و هەرێمایەتیی تازە لەسەر بناغەی بنیاتنانی دەوڵەتەکان بە پێی (نیشتمانی- دیموکراتی- هاوکاریی ناوچەیی). ڕێگاچارەی پرسی کورد لە ڕێگای بونیادنانی ناسنامەی نەتەوەیی و دیموکراتیی کوردستان بە سەرپەرشتی و ڕەسمی ناسین و کۆمەکی نێودەوڵەتی لەسەر خاکی باشووری کوردستان، مەیسەر دەبێت. پاشان بەدیهێنانی (ناوچەکانی کورد) لە تورکیا، سووریا و ئێران کە بە تێپەڕبوونی سەردەم لە دامەزراندنی دەوڵەتی فیدراڵی کورد، ئەنجامی دەبێت. ئەم کارەو ئەم ئامانجە بە بێ پشتیوانیی ئاشکراو بەهێزی ئەمریکاو ڕۆژئاوا نایەتە دی و وێنای سەربەخۆیی و دەوڵەتی کوردستان، لەوانەیە لە پێکهێنانی دەوڵەتی بۆسنێ هێرزەگۆفین و کرواتیا بە پشتیوانیی نێودەوڵەتی ئاسانترە. "بۆیە بە دەستهێنانی چارەسەری تەواوی پرسی کورد، نابێت ئەم نەتەوەیە بۆ ماوەی نیو سەدەی دیکە لە خوێن و فرمێسک و جەنگدا ژیان بەسەرببات"(٢٠).


سەرچاوەکان:

١- زبیگنیو بریجینسکی، خارج ازکنترل (Out of Control) ترجمە، د. عبدالرحیم نوە ابراهیم.

٢- م. کاردوخ، جنبشهای کرد (ازدیرباز تاکنون)، ستوکهولم، ١٩٩٣

٣- کریس کوچیرا، جنبش ملی کرد ترجمە. ابراهیم یونسی. تهران ١٣٧٣

٤و ٥- هەمان سەرچاوە.

٦- شیمون پیریس، عصر جدید: لایطیق المتخلفین ولایغفر للجهلة. بەشێک لە کتێبی رویة عالمیة لمستقبل شرق الاوسط، القاهرة ١٩٩٢

٧- جرجیس فتح الله، زیارة للماضي القریب، ستوکهولم ١٩٩٨

٨- حوسێنی مەدەنی، کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی دووەم، هەولێر ٢٠٠١

٩ و ١٠ و ١١: ئەم سێ خاڵە وەکو خۆی لە کتێبەکەی جرجیس فتح الله و دافید ئادامسۆن، الحرب الكردیة وانشقاق ١٩٦٤، لاپەڕەکانی ١٥، ١٦، ١٧، ١٨ وەرگیراوە.

١٢- جرجيس فتح الله، آراء مخطورة في شؤون عراقية معاصرة، ستوكهولم ,١٩٩٤
١٣- جوون كولى، الحصاد (حرب اميركا الطويلة في الشرق الاوسط)، ل ,٢٢
١٤- ريچارد نيكسون، فرصت را در يابيم (وظيفه امريكا درجهانى بايک ابرقدرت)
ترجمه حسينى و فسى نژاد ,١٩٩١ ل ,١٤
١٥- هەمان سەرچاوە، ل ١٦
١٦- هەمان سەرچاوە، ل ٣٧١

17- Jim Hoagland "The world would be better with a downized Iraq" Washington Post- 12 September 1996.

Stephan Rosenfeld "The idea of helping Iraq to break up its merits" International Herald Tribune. Sptember 1996.

18- After such a Knowledge what forgiveness.

ناوی کتێبەکەی (جۆناسان ڕاندڵ) دەربارەی کورد کە بە عەرەبی بە ناوی (أمة في شقاق) و بە فارسی بە ناوی (بعد اين ريسوايى چه بخشايش؟) بڵاوبۆتەوە.

19- International Herald، Why dismembering Iraq would be a bad idea" de Shibley Telhami" September 1996. ٢١ .Tribune

٢٠- کريس کوچيرا، جنبش ملت کرد وخواست استقلال، مترجم فارسى، عزيز ماملى- ئەپريلى ٢٠٠٠، چاپى ئەوروپا. وەرگێڕانى بۆ کوردى بە ناوى "بزووتنەوەى نەتەوەيى کوردو هيواى سەربەخۆيى" ئەکرەمى ميهرداد- سلێمانى ,٢٠٠٢

# ڕەوشی سیاسیی کوردستان بەرەو کوێ؟

هەر کەسێک گرنگیی دابێت بە پرسی کورد، بەردەوام دوو کێشەی گرنگ، سەرنجی ڕاکێشاوەو هەریەکەیان، یان هەردووکیان پێکەوە کاریگەریی گەورەیان کردووەتە سەر چارەنووسی ئەو نەتەوەیە و تا ئەو ڕادەیەی کە هەمیشە دوو ڕووی ئەو پرسە ئەو دوو کێشەیە بووە.

کێشەی یەکەم، کێشەی ناکۆکی و یەکێتیی نێوان کوردانە، بەجۆرێک کە بەشی زۆری شۆڕشی کوردستان، کێشەی ناکۆکی و دووبەرەکیی نێوان باڵەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی بوو. کێشەی دووەمیش، شۆڕشی چەکداری یان لە ڕاستیدا بزووتنەوەی چەکداریی نێو چیاکانی کوردستان بووە، دژی داگیرکەران، یان دەتوانین بڵێین کێشەی شەڕو ئاشتیی نێوان کورد و دەوڵەتەکانی دەسەڵاتدار، بەسەر کوردستاندا بووە.

## ناکۆکی و یەکێتیی نێو کوردان

یەکێک لە کێشە گرنگەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، کە بەردەوام فەلسەفەکان و ڕێبازە فکرییەکانی، کۆششیان لەبارەیەوە کردووە، مەسەلەی یەکێتی و ناکۆکیی نێوان بەشەکانی ئەم جیهانەیە کە مرۆڤ ئاوای کردووە، یەکێتی و ناکۆکیی نێوان (گشت و بەش)، نێوان (بابەت و خود)، نێوان (دەسەڵات و ئازادی)، نێوان ئافرەت و پیاو، نێوان ڕۆژ و شەو، نێوان ماددە و فیکر، نێوان پۆزەتیف و نیگەتیف و نێوان شەڕ و ئاشتی.

ئەم کێشەیە بە جۆرێک ئەزەلی و ڕەسەنە، تەنانەت لەناو خودی تاکە دیاردەیەکیشدا لەنێوان بەشەکان و ساتەکان و پێکهێنەرەکانی ئەو دیاردەیەشدا. بێگومان بوونی هەیە و کاریگەریشە لەسەر چارەنووسی ئەو دیاردەیە، بەڵام نابێت لەبیرمان بچێت کە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم سیفەتە، سیفەتێکی ڕەسەن و ئەزەلی

دنیــایە، بەڵام مــێــژوو، گــۆڕانکارییــەکــانی مــێــژوو، کــاری لێ دەکــەن، ڕێبــازە فــەلسـەفییەکانی دنیـا، هەر لە فـەلسـەفەی یۆنانی تا فـەلسـەفـەی کلاسیکی ئاڵمـانی سـەدەی هەژدەو نۆزدەوە تا مـارکسـیزم و ڕێبازە فـیکری و فـەلسـەفـیـیە نوێیەکانیش، بەردەوام گرنگییان داوە بەم کێشەیە.

ئەفلاتون پێی وایە کە مـاهیـەتی دنیا بریتییە لە گەڕان بەدوای یەکێتی و گشتی بووندا، لە بەرامـبـەر فـرەیی و گـۆڕانکارییـەکـانی بووندا[1]. واتە ئەو بڕوای وایە بۆئەوەی بتوانین لە دنیـاو مـاهیـەتەکەی بگەین، دەبێت دان بەگشتی بوون و یەکێتی دنیـادا بنێین و تەنانەت بەناو جیـاوازی و گـۆڕانەکانیـشـدا بیـان دۆزینەوەو بیـانکەینە ئامـانج. فەیلەسـووفی سیاسی و زانای گەورەی ئەڵمانی هیگڵ دەڵێت، کە خۆی دنیا لە یەکـێـتـیـەکەیدایە و کـارڵ مـارکـسـیش بڕوای وایە کـە یەکـێـتـیی دنیا لە مـاددی بوونیدایە[2] . لایەنگرانـی بیروباوەڕی ڕێبـازی فـرانکفۆرت، لەسـەر زمـانی هربرت مـارکۆزە، دەڵێن: شتێک نییە لە دنیادا ناوی یەکێتی و گشتی بوون بێت و تەنانەت ڕێبازە فیکرییەکەی خۆیـان ناودەنێن فەلسـەفـە یان تیۆری ڕەخنەیی و مارکۆزەیش، ناوی دەنێت (فـەلسـەفـەی نەفی)و دەگـەنـە ئەو ئامـانجەی کە راستی تەواو تەنهـا لای ئازادییـە نەک دەسـەڵات، لای ڕەخنەیە نـەک بابەت، لای خـودە نەک گشت و ڕەخنەی سەرەکیشیـان لە بیروباوەڕی هیگڵ و مارکس ئەوەیە کە ئەوان پۆزەتیڤیزمن و ئەوان (فرانکفۆرتییەکان) لایەنگیری نێگەتیڤیزمن[3].

بیروباوەڕە تازەکانی (کۆتایی مێژوو)و (جیهـانگیر)یش، هەر بەو شێوەیە گرنگییان داوە بەم کێشەیە.

فـۆکـۆیـامـای نووسـەری کـۆتاییی مـێژوو، پێی وایـە کـە باشـترین ڕژێم و مۆدێل بۆ ئێـسـتـاو ئـایندەی مـرۆڤـایـەتی تەنهـا لیـبـرالیـزمـەکەی خـۆی و دەوڵەتەکـەیەتی، واتە بەشەکـەی خۆی دەکاتە گشت بۆ هەمـوو دنیاو بەو جۆرەش بیروباوەڕی جیهانگیری پێی وایە کە تـایبـەتمەندی و ناسنامـەی نەتەوەکانی باشـوور، واتە بـێ دەسـەڵاتەکان لەبەرامبەر هێزەکانی باکووردا، دەسـەڵاتدارەکان، لەناو ئەوانیشدا تەنها تایبەتمەندی و ناسنامەو دەسـەڵاتی ئەمریکا دەبێتە گشتی ئایندەو دەورو کـاریگەریی بەشەکـانی دنیـا بەهەند ناگرن. ئەمـان هەردووکیـان لە ڕاسـتـیدا، سـەرچاوەکەیان تەنهـا یەک

دەسەڵاتە، لە بەشەکەی خودی خۆیانەوە دەست پێ دەکەن و دەیانەوێت تەنها خۆیان ببنە گشت و لە راستیدا دەیانەوێت خۆیان بکەنە (گشتێکی سەپێنراو)، هەروەکو چۆن سۆسیالیزمەکەی سۆڤیەتی پێش ئەوەدەکان دەیویست خۆی بسەپێنێت.

لاوازیی گەورەی ئەم بیرکردنەوانەی کە تائێستا باسمان کرد ئەوەیە کە پێیان وایە کە دنیا یان هەر یەکێتییە، یان بەتەنها هەر ناکۆکییە، بێگومان جووڵانەوەشیان لەوەوە دەست پێ دەکات کە فکری خۆیان و فەلسەفەی خۆیان و ئامانجی خۆیان کە بەرهەمی خودە بکەنە گشت و رێگای بەشەکانی دیکە نەدەن.

ئەفلاتون لەبەر خاتری یەکێتی و گشتبوونی دنیا (بێگومان بەبیروباوەڕی ئەو) فرمیی و گۆڕان و بەرەوپێشچوونی بوونەکان فەرامۆش دەکات، هیگڵ سەرەتای کارەکانی خۆی بەبیرکردنەوەو ئازادی دەست پێ دەکات و کاتێک دەگاتە دەوڵەت، کە بێگومان دەوڵەتیش هەرچەندە دەسەڵاتدارە، بەڵام هەر بەشێکە لە بەشەکان و دەوڵەت دەکاتە رۆحی رەهاو ماهیەتی پیرۆزی نەتەوە، واتە لە خودەوە دەست پێ دەکات و دواییش بەرهەمی خود دەکاتە گشت و هەرچەندە هیگڵ هەروەها مارکسیش سەر بەدیالەکتیکین، بەڵام هەردووکیان دیالەکتیک زیندانی دەکەن، ئەم لە دەوڵەتداو ئەویش لە کۆمۆنیزمەکەی بەرهەمی بیری خۆیدا.

هربرت مارکۆزەو لایەنگرنی تیۆری رەخنەییش تەنها رەخنەو هەوڵەکانی خود بەرەسەن دادەنێن و کاریگەرییە باشەکانی دیکەی دەسەڵات و کۆمەڵ بەناهەق حساب دەکەن و تەنانەت وادەزانن کە تەنها ئازادیی ناوەکی و خودی مرۆڤ ئازادییەکی رەسەن و گەوهەرییە، بەڵام ئازادییەکانی دیکە کە لەلایەن دەوڵەت و کۆمەڵەوە بەرهەم هاتووە، بە هەند ناگیرێت[٤].

پاش ئەم هەموو بگرەو بەردەیە، چارەسەر بەکوێ دەگات و دەبێت چ بیروباوەڕو فەلسەفەیەکمان هەبێت بۆ ئەوەی دنیا وەکو خۆی تێ بگەین و هەموو بەش و پێکهێنەرو لایەن و رووەکانی دنیا بەباشی بناسین، بەبڕوای من چارە لەوەدایە کە بیرکردنەوەمان بێتە سەر ئەوەی کە تەنها لێکدانەوەیەک بۆ دنیا ئەوەیە کە یەکێتی هەیەو ناکۆکیش هەیە، واتە ژیان و جیهان دوو پێکهێنەریان هەیە کە یەکێکیان یەکێتییەو ئەوی تریشیان ناکۆکییە و باشترین پەیوەندی و باشترین چارەنووس و

ئایندەش ئەوەیە کەهەردوو ڕووەکەی دنیاو هەردوو سیفەتەکەی و هەردوو گەشەکردنەکەی و هەردوو پێکهێنەرەکەی دنیا کە تەنهاو تەنها یەکێتی و ناکۆکیی نێوان ژیان و دنیایە بە هەند بگیرێت. ئەگەر کارەبا بەنموونە وەربگرین، دەبینین لە دوو بەش پێک هاتووە کە پۆزەتیف و نیگەتیفە، یەکێتی و ناکۆکیی نێوانیان بەرهەمێکی دەبێت لە وزەی کارەباو ڕووناکی و گەرمییە، واتە بەدڵنیاییەوە کارەبا بەیەکێک لەو دوو جەمسەرە پێک نایەت و نابێت وا بیر بکەینەوە کە دەبێت یەکێکیان ئەوی دیکە لەناوبەرێت یان لەبەر خاتری ئەوی تریان واز لە تایبەتمەندی و هێزەکانی خۆی بێنێت.

زانای گەورەو تێکۆشەری مەزنی ئیتاڵی «ئەنتۆنیو گرامشی» دەڵێت: تەنها بەلەبەرچاوگرتنی یەکێتی و ناکۆکی دەتوانین لەو ڕاستییەی دنیا تێ بگەین و پەی بەهەموو لایەنەکان و پێشڕەوییەکانی جیهان بەرین[٥].

ئەگەر بێت و تەنها لە یەکێتییەوە دەست پێ بکەین دەبێت قوربانی بدەین بەئازادی لەپێناوی دەسەڵاتدا، بە بەش لە پێناوی گشتدا، بە فکر لە پێناوی ماددەدا و بەنێگەتیف لەپێناو پۆزەتیفدا، ئەگەر لە ناکۆکیشەوە دەست پێ بکەین دەبێت گشت فەرامۆش بکەین لەپێناوی بەشدا، دەسەڵات لەپێناوی ئازادیدا، بابەت لە پێناوی ڕەخنەو ماددە لەپێناوی فیکردا.

لە ڕاستیدا لەدوای ئەوەی کە مرۆڤ هاتە ژیانەوەو دەستکاریی دنیای کردو بیرو هۆشیاریی پەیداکرد و خود و ڕەوایی خۆی سەلماند، تاکە ساتێک نادۆزینەوە کە یەکێتی و ناکۆکیی نێوان دنیاو بەشەکانی لەیەک جیابکرێتەوەو ئەگەر دیاردەیەکیش یەکێک لەو دوو سیفەتەی لێ بکەوێتەوە، وەکو ئەوە وایە کە دەستێک یان قاچێکی مرۆڤ لێ بکرێتەوەو ژیانیش هەرگیز بەرەو گۆڕان و فرەیی و پێشکەوتن ناچێت بەو دوو لایەنە گرنگەوە نەبێت، سەرەنجام دەبێت بچینە سەر ئەو باوەڕەی کە تەنهاو تەنها تێگەیشتنی زانستی و فەلسەفیی ڕاستی ژیان و جیهان، لە یەکێتی و ناکۆکیدایە.

ئەم کێشەیە ئەوەندەی پەیوەندیی بەکوردەوە هەیە، کێشەیەکی گەلێک گرنگەو کاریگەرەو تەنانەت مۆرکی خۆی داوە لە سەرتاپای مێژووی کوردو جووڵانەوەکانی.

کورد پاش ئەوەی کە دەوڵەتی میدیای لەدەست چوو، لەو مێژووەوە هەتا ئێستا، بەردەوام لەدوالیزمێکدا دەژی و ساتێک نادۆزێتەوە کە کورد لەو دیاردەیە ڕزگاری بوو بێت و ڕەوشەکەش بەم شێوەیە، کورد وێڕای ئەوەی کەسەدەلاتی نەتەوەیی خۆی نەبووەو بەردەوام داگیرو دابەش کراوە، بەڵام توانیویەتی لەسەر بەشی زۆری خاکەکەی خۆی بمێنێتەوە، واتە کورد لەسەر خاکەکەی خۆی بێ دەسەڵات بووە، کە ئەم هەلومەرجە تووشی دوالیزمێکی کردووەو کاری کردووەتە سەر ناخی ئەو نەتەوەیەو لەناخدا تووشی ناکۆکییەکی بەردەوام بووە.

سەبارەت بەدەسەڵات، کورد ناچارکراوە کە لەژێر دەستی ئەوانی دیکەدا بژی و سەبارەت بەخاکیش لەسەر خاکەکەی خۆی ماوەتەوە، توانیویەتی زمانی خۆی بپارێزێت و زمانەکەی نەبووەتەوە زمانی دەسەڵاتەکانی دیکە، بەڵام نەیتوانیوە ببێتە خاوەن زمانێکی یەکگرتوو نەتەوەیی، چونکە دیسان دەسەڵاتی نەتەوەیی نەبووە.

کورد، سەبارەت بەدینیش ڕەوشێکی هەر بەو شێوەیەی هەبووە، پاش ئەوەی لەشکری عەرەبە ئیسلامەکانە هاتنە کوردستان، ئەو نەتەوەیەیان کردە ئیسلام، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم، کوردیش توانیی کاریگەریی خۆی (لە سنووری ولاتی خۆیدا) بخاتە ناو ئیسلامەوە، وێڕای ئەوەی پابەندبوونی خۆی بەئیسلامەوە ڕاگەیاند، بەڵام توانی چەندین ڕێبازی دینی کوردی لە کاکەیی (ئەهلی هەق، یارسان)، ئێزدی، عەلەوی، شابەک، وسۆفیزمی نەقشبەندی بخاتە ناو ئیسلامەوەو ناوەرۆکی دینی کورد لەو بەرگانەدا بژێنێتەوە.

سەبارەت بە فەرهەنگیش، کورد ناچارکراوە کە پەیڕەوی لە فەرهەنگی دەوڵەتە داگیرکەرەکان بکات، بەڵام بەردەوام و هەمیشە توانیویەتی فەرهەنگی خۆی بپارێزێت و لە فەوتان ڕزگاری کردووە.

هەموو ئەم ڕەوشانەی کە تا ئێستا باسمان کرد، چەند دەلالەتێک نیشان دەدەن، ئەوانیش بەردەوام کورد ناچارکراوە کە مەجبوور بێت بە یەکێتی لەگەڵ دەسەڵاتەکانی دەوروبەرداو لەهەمان کاتیشدا کورد هەرچەندی بۆی کرابێت ناکۆکیی خۆی لە بەرامبەر دەسەڵاتە سەپێنراوەکاندا پیشان دەداو لەو بوارەدا هەرچی لەدەستی هاتبێت درێغی نەکردووە، ئەمە لەلایەک و لەلایەکی دیکەوە، سەبارەت

بەداگیرکردن و پارچە پارچەکردن کورد، لەناو خۆشیدا ناچارکراوە کە جیاوازی و ناکۆکیی لەنێوان پارچەکان و بەشەکان و ئامادەییەکانیدا هەبێت، بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە لەباری بابەتییەوە، هەمیشە یەکێتی لەنێو کورداندا هەبووە.

کاتێک کە جەنگی نێوان دەسەڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان بەرپابووە، کوردی ئەو وڵاتانە ناچارکراون کە دژی یەکدی بچنە شەڕەوە، لەنێوان زاراوەکانی کوردیدا جیاوازییەکی زۆر هەیەو تەنانەت زۆر جار کوردی سەربە دوو زاراوەی جیاواز زاراوەکان لە یەکتری تێ ناگەن و لەهەمان کاتیشدا هەموویان خۆیان بەکورد دادەنێن و خۆیان بەزمانێکی دیکە حیساب ناکەن.

شێوەزاری لورسی هەرچەندە نزیکایەتییەکی زۆری لەگەڵ زمانی فارسیدا هەیە، بەڵام دیسان لوڕەکانیش خۆیان بە کورد دادەنێن. واتە بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئاخیوەرانە بە زاراوە جیا جیاکانی کوردی  خۆیان بەکورد دادەنێن (کە ئەمەیان یەکێتییە)، بەڵام جیاوازییەکی زۆریش تاڕادەی تێ نەگەیشتن لە یەکدی (کە ئەمەیان ناکۆکییە) لەنێو زمانی کورداندا هەیە.

پاش ئەوەی کە سوپاکانی عەرەبی ئیسلامی وڵات و نەتەوەکانی دەوروبەری خۆیان داگیر کرد و بەزۆر خەڵکیان کردە ئیسلام، ڕێنووسی (ئیملا) عەرەبیشیان بەسەر ئەو نەتەوانەدا سەپاند و ناچاریان کردن کە بەپیت و ڕێنووسی عەرەبی بنووسن، تاکە نەتەوەیەک کە توانیی لەناو ئەو ڕێنووسەدا کاریگەریی خۆی بپارێزێت، تەنها کورد بوو.

لە سییەکانی سەدەی بیستدا، بەهەوڵی زانای تێکۆشەری کورد تۆفیق وەهبی، توانرا دەستکارییەکی باشی ڕێنووسی عەرەبی بکرێت، بەقازانجی کورد، ناوبراو وای لەو ڕێنووسە کرد کە بتوانێت بەکەڵکی نووسینی کورد بێت و کورد ببێتە خاوەنی ڕێنووسی گونجاو بۆ زمانەکەی.

کردنی (ر) بە(ڕێی قەڵەو بەزیادکردنی(٧)، کردنی (ب) بە(پ)، کردنی (ج) بە(چ)، (ز) بە(ژ)، (ل) بە(ڵ) لامی قەڵەو. لەجیاتی کەسرەی عەرەبی بەکارهێنانی ی (یی)، لەجیاتی زەمەی عەرەبی بەکارهێنانی (و)ی درێژ.

بەم شێوەیە تاکە نەتەوەیەک لەناو جیهانی ئیسلامدا کە بتوانێت زمانی نووسینی

جیاوازی هەبێت، تەنها کوردە، بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە بناغەو بنچینەی ئەم ڕێنووسە، ڕێنووسی عەرەبییە، واتە دیسان لەم مەسەلەیەشدا کورد ناچارکراوە بەیەکێتی و ناکۆکی، دەبێت یەکێتی پەیڕەو بکات لەگەڵ ئەو ڕێنووسەدا؛ چونکە نەیتوانیوە ڕێنووسەکانی ئاڤێستایی، ئێزدی، کاکەیی و ماهی سۆراتی بپارێزێت، وێڕای ئەمەش لەناو ئەو ڕێنووسە عەرەبییەدا توانیویەتی کاریگەریی خۆی دروست بکات، واتە دەبێت ناکۆکی پیشان بدات بەرامبەر بەزمانی عەرەبی.

ڕێبازە ئایینیەکانی کوردستانیش هەر بەو شێوەیە، هەموویان خۆیان بەڕێبازی ئاینی کوردی دەزانن، لایان وایە کە هەوڵی ئەوان بۆ زیندووکردنەوەی دینی کوردانە، بەڵام دیسان ناچارکراون کە یەکێتی لەگەڵ دینی ئیسلامدا پیشان بدەن و لەم مەیدانەشدا کورد دەبێتە بەشێک لە یەکێتی و ناکۆکی لەگەڵ دینی ئیسلامدا، هەروەکو لەنێوان ڕێبازە ئاینییەکانیشدا هەر بەو شێوەیە، واتە هەموویان کوردن (یەکێتی)و لە ڕاستیدا جیاوازی لە نێوانیشیاندا هەیە (ناکۆکی).

پاش ئەوەی کە کورد ناچارکراوە بەدابەشکردن لە نێوان عوسمانی و سەفەوی و کەخۆشی (مەبەستم سەرانی کوردە و لەو سەردەمەدا) دەستی هەبوو لەو دابەشکردنەدا، ئیدی کورد کەوتە یەکترکوشتن و لەناوبردنی یەکدی بۆ بەرژەوەندی ئەو دوو دەوڵەتە.

ئەو دوو دەوڵەتە هێندە بەهێز بوون، کە کوردیان ناچار بە یەکێتی کرد لەگەڵ خۆیانداو هێندەش زاڵم و چەوسێنەربوون، کە دەبێت کورد شۆڕش و ڕاپەڕین دژیان بەرپا بکات و هەر فرسەتێکی بۆ هەڵکەوتبێت ناکۆکیی خۆی نیشان داوە، دامەزراندنی میرنشین و دەسەڵاتە کوردییەکانیش ئەم یەکێتی و ناکۆکییە گواسترایەوە ناو هەناوی ئەو دەسەڵاتانەو هەمیشە لەناو خودی میرنشینەکاندا لایەنی یەکێتی و ناکۆکی لەگەڵ دەوڵەتانی (ئیمپراتۆریاکانی) عوسمانی و ئێرانی بەدی کراوەو تەنانەت لەناو خێزانی دەسەڵاتداری ئەم میرنشینانەدا، ڕەوشەکە هەر بەو شێوەیە بووە.

هەرچەندە لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێراندا، تەنها کوردستان و میسر توانیویانە، میرنشین و دەسەڵاتی تاڕادەیەک سەربەخۆیان هەبێت، بەڵام هەر

ناچارکراون بەوەی کە سەر بە بابی عالی یان سەر بەدەسەلاتی ئێرانی بن (ئەوەی کە پەیوەندیی بەکوردەوە هەیە)، لەهەمان کاتیشدا توانیویەتی بەهەر شێوەیەک بێت کوردبوونی خۆی بپارێزێ.

بەبڕوای من کێشەی سەرەکی لەوەدا نییە کە کورد لەگەڵ دەوڵەتە دەسەلاتدارەکاندا یەکێتی و ناکۆکیی هەیە، یان لەنێو خۆیاندا هەر بەو شێوەیە، کێشەی سەرەکی لەوەدایە کە کورد نەیتوانیوە هەردوو ئەم (یەکێتی و ناکۆکی)یە لەبەرژەوەندی خۆیدا بەکاربهێنێت، لەکاتێکدا گەلێک فرسەتی لەبار هەڵکەوتووە بۆ سوودوەرگرتن لەو مەسەلەیە بەقازانجی کورد.

بوونی میرنشینە نیمچە سەربەخۆکان، ڕەوشێکی زۆر لەباری بۆ کورد خوڵقاندبوو، ئەگەر کورد بیتوانیایە یەکێتیی نێو خۆ و نێوان میرنشینەکان بپارێزێت، ئەوا بەسانایی دەیتوانی ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ ئەو دوو ئیمپراتۆرە ناکۆکەدا، بێ تەقینەوەو خوێنڕشتن بەقازانجی پرسی کورد بەرەوپێش بەرێت، بەلام چونکە نەیتوانی یەکێتیی نێوان خۆی بپارێزێت (چ لەسەر ئاستی تاکە میرنشینێک یان لەسەر ئاستی چەند میرنشینێک)و ناکۆکی لەنێو خۆیدا کردە ڕەوشی سەرەکی، بۆیە ناچاربوو لەگەڵ ئیمپراتۆریاکاندا یەکێتی پیادەبکات و هەردو ئیمپراتۆریەکەش دژی کورد (کە خۆیان لەراستیدا ناکۆک بوون) یەکێتییان پیادە دەکرد.

کارەساتی گەورەی کورد ئەوەبوو لەگەڵ دەوڵەتە دەسەلاتدارەکان نەیدەتوانی (لە ڕاستیدا ئەقڵی پێنەدەشکا) هەم یەکێتی و هەم ناکۆکی لەبەرژەوەندی خۆی پیادە بکات، ئەو کاتەی کە لایەنێک یان هێزێک لە کوردان لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا یەکێتی پیادە دەکرد لەگەڵ لایەن و هێزەکانی دیکەی کوردستاندا ناکۆکی پیادە دەکردو دەبووە دار دەستی داگیرکەران دژی کوردانی دیکە، ئەگەر ئەو کوردانە لەهەمان دەسەلاتدا و تەنانەت لەهەمان خێزانی خۆشی بووبێت. واتە کاتێک کە یەکێتیی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا هەبوو، ناکۆکیی خۆی لەگەڵ خودی ئەو دەوڵەتەدا نەدەبینی و بەکوردی بەتەواوی دەبووە پیاوی ئەو دەسەلاتە، کاتێکیش ناکۆکیی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا پیادە کرد، یەکسەر دروشمی ڕووخانی ئەو دەوڵەتانەی هەڵدەگرت (کە بێگومان نەیدەتوانی بیان ڕووخێنێت)، ئەم ڕەوشە هەتا ئێستا لەنێو کورداندا

بەردەوامــە، بۆیە باسـی هیچ کـام لەهێـزەکـانیش نـاکـەم، بۆئەوەی زیاتر برینـەکـان نەکـوڵێنمــەوەو هیچ لایەک زویر نەکـەم، چونکە بەڕاسـتـی کـوردان یان (دەسـەڵاتی کوردی جا لەهەر دۆخ و بارێکدا بێت) لەوە تێ ناگات کە کاتێک کەسێک ڕەخنەگرە بۆئەوەی بتـوانێت لەئایندەدا لایەنگرێکی باشـترو جیـددیتر بێت. ئەم کێـشـەیە هـەر تایبـەت نییـە بەدەسـەڵاتەوە، بەڵکو نووسـەران و ڕووناکـبیـرانیش هـەر بەو شـێـوەیە بیردەکەنەوە، واتە یان لایەنگرن یان بەتەنیا ڕەخنەگرن.

ئەم شێوەیە هەڵوێست و بیرکردنەوەیە لەنێوان حزبەکانی کوردستانیشدا، هەر بەو شـێـوەیەیە. کـاتێک کە نێـوانی ی.ن.ک و پ.ک.ک خـۆش بوو (خـۆزگـە هـەمـوو دەمێک نێـوانی پارتەکـانی کـوردسـتـان ئاشـتـی و لەباربێت) یەکـێـتی بەتەواوی بێـدەنگ بوو لەبەرامبەر خروقاتەکانی PKK لەنێوخۆی باشووری کوردستانداو لەکاتێکدا گەلێک خـەڵکی دڵسـۆز هانایان برد بۆ یـەکێتی لەبەرامـبـەر منداڵ ڕفاندن و بەزۆرکـردنیـان بەگـەریلا. ئێـسـتـا دۆخی نـاو هاوپەیمانیی دیموکـراتیی کـوردسـتـانیش هـەر بەو شێوەیەیە، من مـەبەسـتـم ئەوەیە زۆر باشـە کە لەیەکگەیشتن و تەبایـی هەبێت، بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیربێت کەناکۆکیی نێوانمان بۆ خزمەتی وڵات و نیشتمان و ئازادی بەکاربهێنین.

لە دوای ڕاپـەڕینـی ١٩٩١و پـاش ئـەوەی کـــە دەســـەڵاتـی کـــوردی دامـــەزرا، هەڵسـوکـەوتەکـانی هێـزەکـان لەگـەڵ یەکـدیدا هـەر بـەو جـۆرە بوو، تەنانـەت لەگـەڵ دەسەڵاتەکـانی دەوروبەریشدا هـەر وابوو، کاتێک کە یەکێتی هـەبوو بەتەواوی ناکۆکی لەبیـر دەبرایەوەو نەدەبوو لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا ڕەخنەش لەو دەسەڵاتانە بگیـرێت و کـاتێکیش کە نـاکۆکی دەهاتە پێشـەوە، هیچ پێشـبـینییـەک و هـاو بەرژەوەندی و «یەکێتی»یەک بە هـەند نەدەگیرا.

بوونی بەرژەوەندی هاوبەشی نێوان ئێمـەو حکومـەتی بەغدا ڕێگە لەوە ناگرێت هـەر یەکێک لەئێمـە (حکوومـەتی بەغدا و کورد) ناکۆکییـەکـانی خۆی لە بەرامبـەر ئەوی دیدا، پیادە بکات.

پارتی کـرێکارانی کوردسـتـان، لەپێش کۆنگرەی حـەوتدا، هـەمـوو ئەگەرێکی ئاشـتـی لە بەرامبـەر تورکیادا نەدەبینی و تەنانـەت ڕەنگە سـپییـەکـەی ئاڵای کـوردسـتـانیشـی

لابردو، بەهەموو شێوەیەک دژی ئاشتی بوو، بەڵام پاش ئەو کۆنگرەیە، تەنهاو تەنها ئاشتی لە(چوارچێوەی کۆماری دیموکراتی)دا دەبینێت و بەدڵنیاییەوە ئاشتییەکی بەو شێوەیە تەنهاو تەنها تەسلیم بوونەو لەم لاشەوە لەگەڵ هەموو هێزە کوردییەکاندا لەشەڕدایە.

بەکورتی ئەگەر تەماشای سەرتاپای شۆڕشی کوردستان بکەین، ئەم دیاردەیە هەر بەو شێوەیە دەبینین، یان تەنها یەکێتی یان تەنها ناکۆکی.

ئەگەر کورد لە نێوان خۆی و لەگەڵ دەرەوەی خۆیشی (بەتایبەتی دەسەڵاتە حاکمەکان بەسەر کوردستاندا) نەتوانێت گونجانێک لەو نێوەندەدا بکات، بێگومان ناتوانێت هیچ بەرهەمێکی دیکە و پێشڕەوییەکی هەبێت و ئەم ڕەوشەی ئێستاش دەرباز ناکات.

## بزووتنەوەی چەکدارانەی کوردستان، کێشەی شەڕ و ئاشتی پرسی کورد

هەروەکو لە سەرەتادا باسمان کرد، یەکێکی دیکە لە کێشە گەورەکانی جووڵانەوەی کورد یان ڕوویەکی تری پرسی کورد، کێشەی شۆڕشی چەکدارانەی کوردستانە بۆ بەدیهێنانی مافەکانی کورد یان بۆ داکۆکی لەخۆکردن لەبەرامبەر هێرشی دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان بەسەر کوردستاندا، ئەگەر بێتو هەمان ڕوانگە (میتۆد) کە بەهەندگرتنی یەکێتی و ناکۆکییە بەسەر ئەم هەلومەرجەدا پیادەبکەین، دەبێت بگەینە چەند دەرەنجامێک کە ئەمانەیە:

زۆربەی کاتەکان کورد ناچارکراوە کە دەست بۆ چەک بەرێت، هەرچەندە چەند جارێک کورد دەیتوانی کە پەنا بۆ چەک نەبات و خەباتی مەدەنی و بەپێی پێوەرەکانی ئەو کاتەی دنیا بتوانێت خەباتێکی گشتی «شامل» بکات و لە هەموو مەیدانەکانی ئابووری، فەرهەنگی، جەماوەری و سیاسیدا خۆی دەوڵەمەند بکات.

ئەوەی جێگای یەکێتییە لەگەڵ شۆڕشی چەکدارانەی کوردستاندا ئەوەیە، کە نەتەوەیەک زۆرجار دژی داگیر و دابەشکردن ناچارکراوە دەست بۆ چەک بەرێت و بەپێی ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤیش، نەتەوەیەکی داگیرکراو دەتوانێت و ڕەوایە کە

بەهەموو شێوەیەک داکۆکی لەخۆی بکات.

ئەوەی کە دەبێتە هۆی ناکۆکی لەگەڵ ئەم بزووتنەوە چەکدارانەیەدا ئەوەیە کە بۆچی خەباتی کورد تەسک کراوەتەوە تەنها لە بوونی چەند هەزار چەکدارێکداو گۆڕەپان و مەیدانی چالاکییەکانی ئەو شۆڕشە چەکدارانەیەش، تەنهاوتەنها خاکی کوردستان بووە، واتە ئێمە لەناو ماڵی خۆماندا شەڕمان کردووەو بەشی زۆری زیانەکانی ئەو شەڕەش وەبەر وڵات و نیشتمانی کوردستان کەوتووەو زۆرجاریش بەهانەی گەورەمان داوەتەوە دەسەڵاتە داگیرکەرەکان بۆ سووتاندن و وێرانکردن و ڕاگواستنی کوردستان.

ئەگەر بێتو تەماشای ئەزموونی سوپای ڕزگاریی ئێرلەندا (IRA) و باڵە سیاسییەکەی (شین ـفین واتە ئێمە خۆمان) بکەین، لە بەرامبەر کێشەیەکی گەلێک گرنگدا خۆمان دەبینینەوە، ئێرلەندییەکان کاری سەربازی و توندوتیژییان خزاندووەتە ناو ماڵی بەریتانیاوەو زۆربەی کارە سەربازییەکان لە لەندەن و شارەکانی دیکەی بەریتانیادا دەکەن و لە وڵاتی خۆشیاندا بەهۆی (شین فین) خەریکی کاری سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی و جەماوەرین، واتە شەڕ لەناو ماڵی دوژمنداو ئاشتی لەناو ماڵی خۆیاندا (یان هیچ نەبێت خەباتێکی ئارامی سیاسی لەناو ماڵی خۆیاندا پیادە دەکەن) بەڵام ئێمەی کورد، ڕێک بەپێچەوانەوە ڕەفتارمان کردووەو هەمیشە لە کوردستان شەڕ (جا یان لەگەڵ دەسەڵاتە دەرەکییەکان یان لەنێو خۆماندا) بۆ مفاوەزات و گفتوگۆش ڕێگای پایتەختی دەوڵەتە داگیرکەرەکانمان گرتووەتەبەر، واتە بۆ ئاشتی بەرەو ئەوێ بەڕێ کەوتووین.

مەسەلەیەکی دیکەی گرنگیش ئەوەیە، هەروەکو پێشتریش بەکورتی باسم کرد، هەرئەوەندەی کە هێزێکی چەکدار یان ڕێکخراوێکی سیاسیمان پێکەوەنا، یەکەمین دروشمی سیاسیمان ڕووخاندنی دەسەڵاتە حاکمەکان بووە بەسەر کوردستاندا.

باشە با پرسیارێکی بەگومان لە خۆمان بکەین، ئایا دەبێت داواکاریمان لە دەسەڵاتێک هەبێت کە پێشتر بانگەوازی ڕووخانیمان کردبێت. چۆن ڕێی تێ دەچێت ئەو دەسەڵاتە هیچ مافێکی ئێمە بسەلمێنێت لەکاتێکدا ئێمە بەئاشکرا دروشمی ڕووخاندنی ئەومان بەرز کردووەتەوە؟ کارەساتەکە لەوەدایە کە ئێمە نەئەوەندە

هێزمـان هەیەو نەئەشـمـان بێت کـە هیچ کـام لەو دەسـەلاتانـە بڕووخـێنین و نە لە ڕووخـاندنی ئەو دەسەلاتانـەش هیچـمـان وەگـیـردەکـەوێت، ئەم ڕەوشـە تەنهـا لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ئێمـە پێمـان وایە، لەگەڵ ئەو دەسـەلاتانەدا دوژمنایەتیمان هەیەو ئەوانیش هەروەکو ئێمە بەهەمان ڕادە تەنهاو تەنها دوژمنایەتییان نیشانداوە.

تەسـککـردنەوەی جـوولانـەوەی کـوردایەتـی تەنـهـا لە شـۆڕشی چەکـدارانەدا و بەرزکردنەوەی دروشـمی ڕووخانی دەسەلاتە داگیرکـەرەکان، زۆر فرسـەتی زێڕینی لە دەست کـورد داوە، لەوانە فـرسـەتی پێکەوەژیانـی (بەیەکـێتی و تەبایی)ی زەمـانی مەلەکی لە عیراقدا ، فرسەتی دوای.

پاشـان شۆڕشی چەکدارانەش کە جوولانەوەی کوردی لە بوارەکانی ڕووناکبیری، ئابووری، جـەمـاوەری، فـەرهـەنگی و سـیاسـیشـدا بەرەو پێشەوە بـچێت و سـەرەنجـام کورد نەیتوانیوە خەباتێکی گشتی «شامل» بکات بۆ بەدیهێنانـی مافـەکـان و بوونی کوردی لە تەنها چەند حزبێکی چەکداردا تەسک کراوەتەوەو بێگومـان هەمووشمـان باش دەزانین ئابلـوقـەدانی شـۆڕشی چەکـداری و لەڕەوشـێکی وەکـو کـوردسـتـاندا لەلایەن داگیرکەران و هاوپەیمانەکانیانەوە چەند کارێکی ئاسانە.

پیلانی تورکیاو ئێران و ڕووسیا دژی شـۆڕشی بـەدرخـان و عـوبەیدوڵلای نەهری، پیلانی تورکیا ، عیراق، ئێران بەریتانیاو فـەرەنسـا دژی شۆڕشی پیران، دێرسیم، سمکۆی شکاک و شـێخ مـەحـمـود، پیـلانـی جـەزائـیر دژی شـۆڕشی ئەیلول، پیلانی عیراق و هاوپەیمانەکانی بەدژی شۆڕشی نوێی باشووری کوردستان.. هتد.

مـودمین بوونی کـورد بە شـۆڕشی چەکـدارانەوە مـەرگـەسـاتێکی وەکـو ئەزموونی PKKش دەخولقێنێت، ئەم هێزە وێڕای بوونی سێ مەیدانی خەباتی گرنگ و کاریگەر لەدەسـتـیـدا کـە ئەوانیش (بوونی HADEP وەکـو پارتێکی سـیـاسـی و جـەمـاوەریی ڕێگەپێـدراو، توانـای ئابـووریی PKK کـە دەتوانێت وەکـو هێـزێکی کـاریگەر لە بەرژەوەندی شۆڕشی کوردسـتـاندا بـەکاری بهێنێت، نەک تەنهـا لە باکووردا بەڵکو لەباشووریشـدا دەبووایە گـەلێک یارمـەتی و خزمـەتگوزاریی پێشکەش بە دەسـەلاتی کـوردی و جـەمـاوەرەکـەی بکردایە و پاشـان بوونی هێـزێکی جـەمـاوەریی گـەورە لە ئەورووپا کـە دەتوانێت بیکاتە هێـزێکی فشـارهێنەر بۆ سـەر تورکـیـا). بەلام سـوورە

لەسەرئەوەی کە جڵەوی کارەکان تەنها لەدەست سەرکردەیەکی دیل و هێزێکی سەربازیی ئابڵوقەدراودا بێت و هەموو ئەو هێزە گرنگانەی کە هەیەتی کردووینە پاشکۆی هێزە چەکدارەکەی چیاکانی باشووری کوردستان و مەرگەساتیش لەوەدایە، کە دەڵێت ئەو هێزە هیچ دژایەتییەکی دەسەڵاتی تورک ناکات و لێرەشەوە زۆر بەجیددی دژی دەسەڵاتی کوردی لەکاردایە، بەهۆی ئەو هێزە چەکداریشەوە تووشی چەندین تەنازولات بووە بەدەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان بەسەر کوردستاندا، بەڵام ئامادە نییە بچووکترین ڕێکەوتن لەگەڵ دەسەڵاتی کوردیدا بکات.

تەسککردنەوەی شۆڕشی نەتەوەیەک بۆ تەنها مەیدانی چەکداری چەندین کاریگەری و ئەنجامی دیکەی لێ پەیدا دەبێت کە هیچیان لە بەرژەوەندی ئەو نەتەوەیەدا نین، ئەوانیش گرنگیدان بە لادێ لەسەر حسابی شار، گرنگیدان بەکەسی شەڕکەر لەسەر حسابی کەسی سیاسی و خوێندەوار، گرنگی نەدان بە خەباتی سیاسیی مومکین POSSIBILITY سەبارەت هەر بەو دۆخە چونکە ناکرێت وا بیربکەینەوە لەلایەک شۆڕشی چەکدارانەی ڕووخێنەری ئەو ڕژێمەت هەبێت و لەلایەکی دیکە لە خەباتی سیاسی و جەماوەری و ئابووری و فەرهەنگیی ڕەسمیدا ڕێگەت پێ بدرێت.

شۆڕشی چەکداری چونکە هەمیشە پێویستی بەهێزی چەکدار و شەڕکەر هەیە، بۆیە دەبێت لەلای بنەماڵەو خێڵەکان خۆی بەرێتە پێشەوە، چونکە ئەوان باشترین سەرچاوەن بۆ هێزی شەڕکەر و زۆرجاریش بەناچاری زۆر چاوپۆشی لە کەموکورتی و خرووقاتەکانی ئەو خێڵانە کراوە، سەرەنجام ژیانەوەی خێڵایەتی و ناوچەگەری لەسەر حسابی نەتەوایەتی و شارستانی.

پاش ئەوەی هەردوو ڕووەکەی کێشەی کوردمان باس کرد. دەبێت چی بکەین و چۆن بیربکەینەوە بۆئەوەی بتوانین ڕەوشێکی نوێ لە شۆڕشی کوردستاندا بەدی بهێنین و بەهەمان ڕادەش بتوانین، ئەم هەلومەرجە دژوارەی ئێستای کوردستان دەرباز بدەین.

**دەبێ چی بکەین، چارەسەر بەکوێ دەگات؟!**

هەر بەپێی ئەو ڕێبازی بیرکردنەوەیەی کە لە سەرەتادا باسمان کرد، دەبێت ئەوە

بسەلمێنین کە ئێمەی کورد هەم لەنێو خۆمانداو هەم لەگەڵ دەرەوەی خۆشماندا، کێشەی یەکێتی و ناکۆکیمان هەیەو پێشرەوی و گۆڕانەکانی کوردیش تەنها بەو دووانە دەچێتە پێشەوە.

بۆ ئەوەی مەبەستەکەم باشتر روون بکەمەوە، پێم باشە چەند خاڵێک بۆ خوێنەرانی بەڕێز بەیان بکەم:

١- کورد دەبێت لە پێش هەموو کارێکدا بتوانێت ناوماڵی خۆی ڕێک بخات و بەپێی دیدێکی واقیعی و پەیوەندیی نێوان خۆی دابڕێژێتەوەو لە کۆنگرەیەکی نیشتمانی یان نەتەوەیی بەبێ ئەوەی هیچ کام لە پارتەکان، دەسەڵاتداری تاک بن بەسەر ئەو کۆنگرەیەدا، کۆ ببینەوەو بتوانین پیرۆستڕۆیکاو ئاشکراکردنی کوردی زۆر بەڕاستگۆیی بۆ یەکدی بەیان بکەین و دڵنیاشتان دەکەمەوە هەموو لایەکیشمان هەقی خۆیەتی بەرژەوەندی و بیروباوەڕەکانی خۆی ئاشکرابکات و تەنانەت هیچ پێویست ناکات، ناکۆکییەکانی نێوخۆشمان بشارینەوە، بەڵام دەبێت بەشێوەیەکی ئازاد و دیموکراسی، ئەو تایبەتمەندییانە بخەینە روو، دیموکراسیش باشترین چوارچێوەیە بۆ پێکەوەبەستنی یەکێتی و ناکۆکیی نێوان هێزەکان و بەشەکان و گشتی هاوچەرخیش تەنهاو تەنها لەم ڕێگەیەوە دەتوانرێت بنیات بنرێت.

کۆبوونەوەو کۆنگرەی کوردان، دەتوانێت کە کۆنگرەی پارچەکانی کوردستان، شێوە زارەکان، پارتەکان و ئامادەیی بێت، یەکێتیی نێوان ئەم بەشانەی کوردستان گەلێک پێویستە بۆ بەدیهێنانی یەکبوون و گشتیبوونی دەسەڵات و مەرجەعیەتی بڕیاری کوردی و ناکۆکی و جیاوازییش (بەمەرجێک کە بەشێوەی گفتوگۆ و مۆدێرن پیادە بکرێت)، دەتوانێت باشترین زامنی بەدیهێنانی ئازادی بێت بۆ هەموو بەشەکان و لایەنەکانی نێو کوردستان.

٢- مەرج نییە، کۆنگرەی کوردان دژی دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان بێت کە کوردستانیان دابەش کردووە، کۆبوونەوەی کوردان لە هەر کوێ بێت، دەتوانێت پەیامی دۆستایەتی بۆئەو دەوڵەتانە بنێرێت، ئەگەر کۆنگرەی کوردان هەبێت، دەتوانێت داوا لە دەوڵەتی ئێرانی بکات بۆ زیاتر کرانەوە و ئازادی و ئارامی

بەرامبەر بەکوردان و لەکاتێکدا ئێستا لە تورکیا لەنێو ناوەندە سیاسییەکاندا قسە لە گۆڕانی دەستوورو ئارامکردنەوەی ڕەوشی کوردستان دەکرێت، دەسەڵاتی کوردان هەقی خۆیەتی کە پەیامی پیرۆزبایی و داوای چاکردن و ڕیفۆرمی زیاتر بکات لەو دەوڵەتە.

واتە کۆنگرەی کوردان، دەتوانێت پەیامی سیاسی و داوای مافە ڕەواکانی نەتەوەی کورد لەو دەوڵەتانە، بەشێوەیەکی هاوچەرخ و شارستانییانە بکات.

٣- کۆنگرەی نەتەوەیی و نیشتمانیی کوردستان، دەبێت لەسەر ڕێگای بەدیهێنانی مافەکانی گەلی کورد، خەباتی گشتی «شامل» و خەباتی مەدەنی بکرێت، نەک تەنها خەباتی چەکدارانەی، مەبەستم ئەوە نییە کە خەباتی گشتی و مەدەنی تەنهاو تەنها خەباتێکی ئارامە، کورد لەگەڵێک ڕێگەوە دەتوانێت خەباتی سەربازی لە بەرامبەر داگیرکەراندا بەرەو پێشەوە بەرێت، بەڵام نەک لە وڵاتی کورداندا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە و کوردیش دەتوانێت بگاتە ئەو ئاستە، کە ئەو خەباتە بخەینە نێوماڵی ئەوانەوەو بتوانین لەکوردستان وێڕای بوونی کەشوهەوایەکی خەباتاوی هەلومەرجی ئاشتی و ئارامی لە بەرژەوەندی کوردستان بەڕێوەبەرین.

هەر ئێستا کورد دەتوانێت هەنگاوی بەرایی بەرەو ئەو خەباتە مەدەنی و گشتییە بهاوێت و نەک لە کوردستان، بەڵکو لەناو خودی ئەو دەوڵەتە دەسەڵاتدارانە و لە جیهانیشدا دەتوانین خەباتمان بەو شێوەیە بسازێنین.

هیوادارم کورد و دەسەڵاتەکانی نێو کوردستان، بتوانن ئەم ڕەوشەی ئێستای وڵات بەرەو ئەو پێشڕەوییانەی کە باسمان کردن بەرەو پێشەوە بەرن و بەهەموومان بتوانین، هەلومەرجێکی نوێ و ئارام و ئاشتییانە لەسەر هەموو ئاستەکان لە وڵاتدا بەدی بهێنین.

سەرچاوەکان:
١- هربرت ماركيوز، فلسفة النفسي (دراسات في النظرية النقدية)، دار آلاداب، ١٩٧١ ص٥٨
٢- گۆڤاری سەردەم، ژمارە (٨). فایلی ژمارە (قوتابخانەی فرانکفۆرت)
٣- هربرت مارکیوز، هەمان سەرچاوە، ل٦- ١٤

٤- هربرت ماركيوز، هەمان سەرچاوە، ل٦
٥- جاك تاكسيە، غرامشي (دراسة ومختارات)، دمشق، ١٩٧٣

# کوردستان لە سەرەتای کاروانی دیموکراسیدا

تا ئێستا گەلێک مانا و پێناسە بۆ دیموکراسی دیاری کراوە و لەلایەن زۆرێک لەبیرەکان، هێزەکان و بەرژەوەندییەکان مانا و چەمکی بۆ دانراوە. هەر یەکێک لەوانە بەپێی ئاستی مێژوویی و تێگەیشتنی خۆی توانیویەتی کۆمەک بە دیموکراسی بکات و لەهەر قۆناغێکی مێژوویی و دیاریکراودا پێکهاتە و فرەیی نوێ بۆ ئەو زاراوە بەدی هێنراوە. لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانی و کرانەوەی زیاتردا، پێکهاتە و مەیدانەکانی دیموکراسیش بەرەو زیاتر و ئاوالابوون دەچن و چەمکەکانی فرەیی بەهەردوو مانای «التعدد و التنوع»، دەسەڵاتی لاییک «عیلمانی»، بەشداریکردنی بەکۆمەڵ، گفتوگۆو دانوستاندن، دیموکراسیی بازاڕو بازاڕی ئازاد و کرانەوەو کۆمەڵایەتیکردنی ئابووری، ئازادیی بیرو ڕا و کۆبوونەوەو ڕێکخستن کە لە خەبات و هێزی سەندیکاو پارت و کۆمەڵەکاندا دەردەکەوێت، دیموکراسیی ئازادیبەخشیی نەژادو نەتەوەکان، دیموکراسیی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت و بەدیهێنانی هەرچی زیاتری داواکارییەکانی زۆربە و سەرەنجام دیموکراسیی وەکو پەروەردە و فەرهەنگی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە بتوانێت هەموو ئەمانە لە بوون و کردەوەیەکی پەیوەندیداردا بەیەکەوە ببەستێتەوە و سیستەم و ژیانێکی باشتر و ئارامتر و بەهرەمەندتر بۆ خەڵک بەدەست بهێنێت. بێگومان هەر یەکێک لەم چەمک و مەیدانانە بە خەبات و ئامادەبوونی بەردەوامی ئەو هێزانە بەدی هاتووە و لە قۆناغە بەردەوامەکانی دیموکراسیدا توانیویانە پەروەردەو فەرهەنگی دیموکراسی دەوڵەمەندتر بکەن و تا ئێستاش ڕێگاو کاروانی بەردەوامەو لەوانەیە قۆناغەکانی دیکە، وێڕای ئەمانەی کە باسمان کردن، چەندین هێز، پێکهێنەرو زاراوەی نوێ بۆ ئەم سیستەمە ژیاری و پێشکەوتنخوازە بەدی بێت، کە بەپێی وتەی زاناو فەیلەسووفی نەمسایی، کارل پۆپەر، دیموکراسی تا ئێستا باشترین سیستەمی سیاسی و مرۆڤایەتییە کە توانیویەتی ژیانێکی باشترو بەهرەمەندتر بۆ جیهان

بەدەست بێنێت و لە ڕێگەی ئەو سیستەمەوە مرۆڤ توانیویەتی زیاتر لە ڕاستی نزیک ببێتەوە[1]. سەرەڕای ئەم باشی و پێشکەوتن و نزیکبوونەوەیە لە ڕاستی، بەڵام دیموکراسی وەکو هەر بەشێکی دیکە لە کارو بیری مرۆڤ، هێشتا کەلێنێک بۆ نەزانین و نەتوانینی تێدایەو کەئەو کەلێنە نابێتە مایەی گرفت، بەڵکو دەبێتە هۆیەک بۆ کرانەوە بەڕووی ئایندەدا[2] و ئەمەش وادەکات کە لەوە تێ بگەین دیموکراسی هەر تەنها سیستەمێک نییە بۆ ڕابردوو و ئێستا، بەڵکو توانای هەیە کە بەرەو ئایندەش هەنگاو بنێت.

تائێستا باشترین کتێب کە من خوێندبێتمەوە سەبارەت بەدیموکراسی، کتێبە بەناوبانگەکەی کۆمەڵناسی ناوداری فەرەنسی، ئالان تۆرینە، کە بەناوی (دیموکراسی چییە؟)[3] ئالان تۆرین ئەم پرسیارانە دەخاتە ڕوو، سەبارەت بەدیموکراسی و پاشان بەهۆی لێکدانەوەیەکی مێژوویی و گەشەکردووی پڕ لە فرەیی، دەگاتە شێوەیەک لە تێگەیشتن سەبارەت بەو ئەزموونەی شارستانی و دوورنمای ئەو سیستەمەش (کە بەهۆی ئەو پێکهێنەرانەوە دەیناسێنێت)، دەبێتە ڕێگایەکی لە سەرەتاوە گەش و کراوە. کارل پۆپەر سەبارەت بەپێشبینیکردنی بۆ ئایندەی دیموکراسی دەڵێت: کاری ڕووناکبیران و سیاسەتمەداران ئەوە نییە کە کۆمەڵێکی ئایدیالی «مثالی» دروست بکەن، بەڵکو ئەوەیە کە لە ڕێڕەوی گۆڕانەکان و وەرچەرخانەکاندا باشترین چارەسەری مومکین و گونجاو بەدەست بهێنن[4] و ئالان تۆرینیش بەهۆی وەڵامی پرسیارەکانەوە ئەو چارەسەرە گونجاوانەمان پێ دەڵێت کە بەهۆی دیموکراسییەوە دەتوانین بەدەستیان بهێنین.

ئایا دەتوانین تێڕوانینی گەش و پۆزەتیڤمان بۆ دیموکراسی هەبێت؟ بۆچی دەبێت وا لەدیموکراسی بڕوانین کە تەنها دەسەڵاتی زۆربە نییە؟ دیموکراسی تەنها ناتوانێت بەهۆی یاساکانەوە بێتە دی، بەڵکو دەبێت لەڕێگەی گەشەی پەروەردەی سیاسی و فرەیی و دوور خستنەوەی توندوتیژی و بەدیهێنانی جۆرێک لە یەکسانی دوور لە بۆچوونی تۆتالیتاری و بەم شێوەیە دیموکراسی لەلای تۆرین سیستەمێکی بەردەوام پەیوەندیداری نێوان دەوڵەت و بکەرە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵە[5]. ئەو ئاسۆ و ناوەڕۆکە دیموکراسییە چییە، کە وامان لێ دەکات بزووتنەوەیەکی

دیموکراسی و ئازادی بەهێز بەدی بێنین، کە نەک هەر تەنها لە بەرامبەر هەڕەشە و مەترسییەکاندا بوەستێت، بەڵکو بتوانێت ژیانێکی باشترو گونجاوترو ئازادتر بەدی بێنێت؟ چۆن دەتوانین، وێڕای فرەیی و جیاوازیمان لەگەڵ یەکدا بژین؟ نابێت یەکێتی بەسەر هەموو لایەنەکانی دیکەی ژیانی خەڵکیدا زاڵ بکەین (کە بێگومان یەکێتی و هاوڕایی و کۆدەنگی پێویستە). چۆن دەتوانین بەهۆی فرەییەوە، مەبەستم فرەیی بێ ڕێکەوتە و کۆدەنگییە، دژی حاڵەتێکی توندڕەوی ئانارشییانە ببین، هەرچەندە ژیان بەبێ فرەیی و جیاوازی نییە و ژیانی بێ فرەیی مەرگە؟ ئایا ئەو ڕەهەندە فەرهەنگییە چییە کە لە سیستەمی دیموکراتیدا دەتوانێت فرەیی و کۆدەنگیی ناو کۆمەڵ فەراهەم بکات؟

ئەو مەترسییانە چین کە هەڕەشە لە دیموکراسی دەکەن؟ ئایا دەسەڵاتی زیاد لە پێویست و بەیاسا دیاری نەکراوی دەوڵەت و دەسەڵات دژی دیموکراسی نییە؟ ئایا دەسەڵاتی بازاڕ، ئابووری و کۆمەڵە و حزبەکان، کە هیچ گەرەنتییەکی یاسایی و کۆمەڵایەتی نەبێت بۆ سنووردارکردنیان هەڕەشەیەک نییە لە دیموکراسی؟ ئایا دەسەڵاتی فەرهەنگ، دین و ئایدیۆلۆژیاکان کە لەلایەن دەسەڵاتی گشتی و فەرهەنگی دیموکراسییەوە هەمیشە هۆشیار نەکرێتەوە، یەکێک نییە لە هەڕەشەو مەترسییەکان لەڕێگای پێگەیاندن و بالاکردنی دیموکراسیدا؟

ئایا مەیدانەکانی دەرکەوتنی دیموکراسی، واتە فرەیی «التعدد والتنوع»، دەسەڵاتی عیلمانی (نیشتمانی و هاولاتی) بەشداریکردن بەکۆمەڵ و گفتوگۆی کراوەو ئازاد، دیموکراسیی بازاڕو ئابووری ئازاد، ئازادیی بیروباوەڕو کۆمەڵەکان و تەنانەت دیموکراسیی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت و دامەزراو و دین و فەرهەنگەکان و هەموو ئەمانە چۆن دەبن و پەیوەندی نێوان ئەمانەو مافەکانی خەڵک و هاوولاتییان چۆن دەستەبەر دەکرێت و چۆن دەتوانین لەنێوان هێزو مەیدانەکانی دیموکراسیدا (ئەوانەی ناومان هێنان) مافەکانی گشتی هاوولاتی و خەڵک جێبەجێ بکەین؟ ئایا فرەیی بەبێ بوونی مافی یاسایی و دانپێدانراوی خەڵکدا، نابێتە زۆربوونی دەسەلاتداران و بگرە خاوەنی ئیمتیازەکان و تەنانەت چەوسێنەرانیش؟

وەلامی هەمـــوو ئەمـــانە، لەلای تۆرین، لەوەدا دەبێت کـــە بتـــوانێت ئاســـۆ و

دوورنمایەکی باشتر و گونجاوتر بۆ ئێستا و ئایندەی دیموکراسی بەدی بهێنین.

بیرو هۆشی دیموکراسی بەهۆی ئەوانەی کە سوور بوون لەسەر بەدیهێنانی مافەکانی ژیان و دروستکردنی ئازادییەکی زیاتر لە بەرامبەر دەسەڵاتە توندڕەوو سەپێندراوەکان، کە ئەم ئامادەیی و بەردەوامبوونەی بیر و خەبات مەرجی سەرەکی و کاریگەری زیندوو ڕاگری دیموکراسییە، وای کردووە کە هزر، ئاسۆ، داواکاری پێشکەوتن و گۆڕانکاریی بەردەوام بەقازانجی ئازادیی خەڵک و لە فەرهەنگی دیموکراسیدا بەدی بێت. دیموکراسی بەتەنها هەندێک خاڵ و گەرەنتی «ضمانات» دەستوری نییە (کە دیارە بوونیان زۆر پێویستە و بەتایبەتیش لەو وڵاتانەدا کە دێتە ئاستانەی دیموکراسییەوە، وەکو کوردستان)، بەڵکو ئەو خەبات و تێکۆشانە بەردەوامەیە کە بکەرە کۆمەڵایەتییەکان[٦] بەرپای دەکەن لە فەرهەنگ، سیستەم، ئابووری و دەسەڵاتدا، بۆ بەدیهێنانی هەرچی زیاتری مافەکان و کەمکردنەوەی ڕێگرییەکانە لەبەردەم ئازادیی خەڵکدا. من بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانم پەنا دەبەمە بەر بیری سێ نووسەری گەورەی کەنەدی، فەرەنسی و ئەڵمانی کەئەوانیش شارل تایلۆر، ئالان تۆرین و یورگن هابرماس- ە بۆ نەخشاندنی باشتری ئاسۆ و ئامانجەکانی دیموکراسی. شارل تایلۆر دەڵێت: (دیموکراسی سیاسەتی دانپێدانان و خوێندنەوەی بەرامبەرە)[٧]. لە سەردەمی ئێستادا دەبێتە سیاسەتی دانپێدانان و خوێندنەوەی نێوان بکەرە کۆمەڵایەتییەکانی بواری فەرهەنگ، سیاسەت و ئابووری و سیستەمەکان و دەوڵەتەکان.

ئالان تۆرین دەڵێت: سیستەمی دیموکراتی ئەو شێوەیەیە لە ژیانی سیاسی کە زۆرترین ئازادی بۆ زۆرترین کەس بەدی بهێنێت، یان ئەو شێوەیەیە کە فراوانترین فرەیی و جیاوازی دەپارێزێت[٨] و منیش دەڵێم دیموکراسی وێڕای ئەمانە ئەو سیستەمەیە کە زۆرترین ڕێکەوتن و هاودەنگی دەپارێزێت هاوشان لەگەڵ پاراستنی زۆرترین جیاوازی و فرەیی و بەم شێوەیە دیموکراسی دەبێتە زۆرترین بەشداریی نێوان بەش و بکەرە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵ. لەلای یورگن هابرماسیش، حەقیقەت (هەروەکو وتمان لەلای پۆپەر دیموکراسی دەتوانێت هەنگاوێک و ڕێگایەک بێت بۆ نزیکبوونەوە لە ڕاستی) بەرهەمی تاک بیرو هۆشەکان نییە، بەڵکو توخمێکە

له پەیوەندی نێوان بیرو بۆچوونەکاندا پەیدا دەبێت و ڕاستی بەداوەریی نێوان بیرەکانەوە پەیوەستە. هەر بۆ ئەم مەبەستە هابرماس (تیۆری گوفتاری حەقیقەت) لە بەرامبەری تیۆرەکانی «اثباتی» و تاکبیری پێشنیار دەکات. ڕاستی تا ئێستا بەتەواوی بەدەست نەهاتووە، بۆیە مێژووی ڕابردوو کە لەسەر بنەمای تاکبیری، تاک گوفتاری و تاک فەرهەنگی بنیات نراوە ناتوانێت لە ڕاستی نزیک بێتەوە(٩).

ئالان تۆرین، لە کتێبی (دیموکراسی چییە؟)، (دەسەڵاتی زۆرینە یان گەرەنتی بۆ کەمایەتییەکان) بۆ زیاتر ئاشناکردن و شیکردنەوەی دیموکراسی، سێ ڕەهەندی گرنگ و چارەنووسساز بۆ دیموکراسی ئاشکرا دەکات و کە ئەو سیستەمەش بەبێ بوونی یەک یان زیاتر لەم ڕەهەندانە بوونی نابێت. بەهەمان شێوەش یەکێک یان زیاتر لەم ڕەهەندانە بۆیان نییە کە دیموکراسی بەتەنها ڕەنگی خۆیان ڕەنگ بکەن و یان ڕێگا نەدەن کە ڕەهەندەکانی، دیکە دەورو کاریگەرییان هەبێت و سەرەنجام دەبێت لەوە تێ بگەین کە دیموکراسی دەبێتە پەیمانێکی کۆمەڵایەتیی نێوان ئەو سێ ڕەهەندە. ڕەهەندو ئاستی یەکەمی دیموکراسی دەسەڵاتی عەقڵە: کە توانیویەتی سیستەمی نوێنەرایەتی بەرهەم بهێنێت و دەنگدان و تازەکردنەوەی دەنگدان و ئاڵوگۆڕکردنی دەسەڵات، دەتوانرێت وەکو بەرجەستەبوونی دەسەڵاتی عەقڵ حیسابی بۆ بکرێت. فەرەنسا یەکەمین وڵاتە لە جیهاندا کە توانیویەتی لە ئەنجامی شۆڕشی فەرەنسی دەسەڵاتی مەدەنی و زۆرینە بەدەست بهێنێت. ڕەهەندو دەسەڵاتی دووەم، دەسەڵاتی فەرهەنگ و هاوڵاتییە: ئەم ڕەهەندە دەتوانێت کە بناغەی ڕەوایی بۆ دەوڵەت و دەسەڵاتەکان بەدەست بهێنێت. دەسەڵاتەکانی پێش سەردەمی دیموکراسی توانیویانە لەڕێگای: ١- ڕەوایی خێڵ، دەسەڵاتی خێڵەکی کە لە مێژوودا بە شاهۆز ناسراوە، ٢- دەسەڵاتی بنەماڵە بەهێزەکان و ڕەوایی دینی یان مەزهەبی پشتیوانییەکی ڕەوایی بەهێزە بۆ دەسەڵاتی سەردەمی ئیمپراتۆریا و میرنشینەکان. ٣- فەرهەنگ و ڕەوایی نەتەوەیی توانیویەتی بناغەیەک بۆ دەسەڵاتە نەتەوەییەکان پەیدابکات و سەرەنجام. ٤- ڕەهەندی هاونیشتمانی و هاوڵاتی دەبێتە بناغەیەکی ڕەوایی بەهێز و گشتی بۆ دەسەڵات و سیستەمی دیموکراتی. لە سەردەمی دیموکراتیدا هیچکام لە بناغەکانی ڕەوایی خێڵ، میللەت، نەتەوە، دین، چینەکان و

ئایدۆلۆژیاکان نابنە هێزێک بۆ سیستەم و دەسەڵاتی دیموکراتی، هەر چەندە کە فەرهەنگی هاووڵاتی و فەرهەنگی گشتی دژی، هیچ یەکێک لەو ڕەهەندە فەرهەنگییانە نییە کە ناوم هێنان و بەڵکو ڕێگەی ئازادی و تەعبیر لەخۆکردنیشیان دەداتێ، بەڵام بەبێ ئەوەی کە لە سەرەوە، واتە لەلایەن دەسەڵاتەوە، پشتگیری لە هیچیان لە بەرامبەر ئەوی تریان بکرێت[١٠]. ڕەهەندی فەرهەنگیی سەردەمی دیموکراسی تەنها فەرهەنگی گشتی هاووڵاتیبوونە. لە دیموکراسیدا بۆمان نییە بەناوی دین، نەتەوە، چین و ئایدۆلۆژیاوە حوکم بکەین و تەنانەت بۆمان نییە کە ئەو ڕەهەندانە بدەین بە ئۆرگانەکانی دەسەڵات (بەتایبەتی حزب)، هەر چەندە بەتەواوی ئازادین کە داکۆکی لەو فەرهەنگانەی خۆمان بکەین و تەنهاش داکۆکیکردن، نەک هەوڵدان بۆ گشتیکردنی ڕەهەندی فەرهەنگی خۆمان و چ جای هەوڵدان بۆ سەپاندنی ئەو فەرهەنگانە. بەم شێوەیە، وێڕای ئەوەی کە دیموکراسی داکۆکی و بەرگری لە هەموو فەرهەنگەکان دەکات، بەڵام لەهەمان کاتدا ڕێگا نادات کە هیچ کام لەو فەرهەنگانە ببنە ڕەهەند بۆ دەسەڵاتی فەرهەنگی و بەم جۆرە فەرهەنگی سەردەمی دیموکراسی، فەرهەنگێکی داکۆکیکەرە نەک هێرشبەر. یەکێک لە ئەرکە سەرەتایی و گرنگەکانی دەرکەوتنی دیموکراسی ڕێگانەدانە بەدەسەڵاتی هیچ دینێکی سیاسی و بەم جۆرە، دیموکراسی دژی مەسیحیەت و کەنیسە نییە، بەڵکو دژی دەسەڵاتی سیاسیی ئیسلام و مزگەوتەکانە. هەر بەپێی ئەوەی کە تاکە ڕەهەندێکی گشتی دیموکراسی کە هاونیشتمانی و هاووڵاتیبوونە، ڕێگە دەگرێت لە سەپاندنی فەرهەنگی نەتەوەیی، دین، چینایەتی و تەنانەت خێڵەکیش، بەڵام بەهیچ جۆرێک ڕێگا نادات کە هیچکام لەو کەلتوورانە بکرێتە گشتی و بەسەر دەسەڵاتدا بسەپێنرێت. بەو پێیەش کە حزب هۆکارێکە بۆ دەسەڵات، دیموکراسی دەبێت ڕێگر بێت لەبەردەم دروستبوونی حزبی دینی، حزبی چینایەتی، حزبی نەتەوەیی و ئایدۆلۆژی، بەڵام ڕێگر نییە لەبەردەم دروستبوونی سەندیکاو کۆمەڵە فەرهەنگییەکانی کە دەیانەوێت داکۆکی لەو فەرهەنگە دینی، چنیایەتی و نەتەوەییانە بکەن. بەکورتی دیموکراسی ڕێگا نادات جگە لە ڕەهەندی هاونیشتمانی و هاووڵاتی هیچ کام لە ڕەهەندە فەرهەنگی و کەلتوورییەکانی دیکە بکرێنە ڕەهەندی دەسەڵات و

سیستەمی نوێنەرایەتی. ئەمریکا باشترین نوێنەری سیستەمی هاوولاتیبوونە.

ڕەهەندی سێیەم و ئاستی سێیەمی پەیدابوون و گەشەکردنی دیموکراسی ڕەهەندی ئازادی و ڕەسەنایەتیی ئازادیی مرۆڤە، کە توانیویەتی بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوولاتی بەدەست بهێنێت. ئەگەر لێرەدا سەرنج بدەین، دەبینین کە ناوی مافەکانی مرۆڤ و زاراوەی هاوولاتیبوون پێکەوە هاتووە. بەپێی وتەکەی تزفتیان تۆدورف: هاوولاتیبوون هەنگاوێکە بۆ نزیکبوونەوە لە بەدەستهێنانی مافەکانی مرۆڤ[11]. مافەکانی مرۆڤ وەکو بەیاننامەی ڕەسەنایەتیی مرۆڤ و بەدەستهێنانی مافی تاکەکان لە بەرامبەر ڕەسەنایەتی عەقڵ و فەرهەنگدا، ڕەهەند و ئاستێکی دیکەی گرنگ بۆ ژیان و دیموکراسی پەیدابکات.

دیموکراسی لەم سێ ئاست و بەم سێ ڕەهەندەوە (عەقڵ، فەرهەنگ و ئازادی) دەتوانێت بوونی هەبێت و ئەم سیفەتەش تەنها لە پەیمان و یەکترخوێندنەوەی ئەم سێ دەسەڵاتە دەتوانێت بەردەوام و پایەداربێت. ئالان تۆرین دەڵێت: باشترین پێناسە تائێستا بۆ دیموکراسی، ئیرادەو تێگەیشتنی مرۆڤە بۆ تێکەڵکردنی فکری عەقڵانی و ناسنامەی فەرهەنگی و ئازادی کەسییە[12] و مرۆڤ و تاکیش کاتێک دەبێتە خودو بکەری کۆمەلایەتی، ئەگەر بێت و بتوانێت کۆبوونەوەیەک لەنێوان ئارەزووی ئازادی، پێداویستیی ناسنامەو بانگەوازی عەقڵدا بەدی بهێنێت[13]. واتە دیموکراسی دەتوانێت هەر سێ بنەما گرنگەکەی تاکێتی «الفردیة» کە ئازادییە، تایبەتمەندی «الخصوصیە» کە فەرهەنگە و گشتیبوون «الجامعیة» کە عەقڵ و دەسەلاتی عەقڵە پێکەوە ببەستێت و کۆمەڵیش کاتێک دەبێتە دیموکراسی کە بتوانێت یەکانگیربوونی، ئازادیی تاکەکان و خودەکان، ڕێزی جیاوازی و فرەیی و ڕێکخستنی عەقڵانیی ژیان بەرهەم بهێنێت. سەرەنجام دەتوانین بڵێین کە دیموکراسی نەتاک ڕەهەندە، نە تاک ناوەندە و نە فرەییە بەتەنها، بەڵکو فرە ڕەهەندو فرە ناوەند و فرە بیرکردنەوەیە لێکدانەوەی زانستی و عەقلانی، گرتنەبەری بەڵگەی ڕەخنەگرانە، قبووڵکردنی ئەو بنەما جیهانی و گشتییانەیە کە مافەکانی مرۆڤ و هاوولاتی و تاک بانگەواز دەکەن.

پاش ئەوەی کە توانیمان هەرسێ ڕەهەند و ئاستەکەی دیموکراسی بناسین، ئایا

دەتوانین بزانین کە هەڕەشەو مەترسییەکان چین کە دەتوانن ڕێگە لە گەشەکرن و بالاکردنی دیموکراسی بگرن؟ دیموکراسی کە ڕێکەوتن و کۆدەنگی و هاوپەیمانیی نێوان ئەو سێ پێکهێنەرمیە، بەلام بەداخەوە (بەپێی سروشتی مرۆڤ و نیازەکانی) هەریەکێک لەو سێ ڕەهەندە دەیەوێت کە زۆرترین دەسەلات بۆ خۆی بێت و ئەوانی دیکە ببنە پاشکۆی خۆی. دەسەلاتی نوێنەرایەتی و سیستەمی عەقلانی دەیەوێت کە بەناوی دەسەلاتی زۆربەوە، زۆرترین دەسەلات بۆ خۆی بێت و ڕێگا بگرێت لەدەسەلاتی دوو ڕەهەندەکەی دیکە. بۆ ئەوەی بتوانین کە سیستەمی دیموکراسی لە تاک پێناسە و تاک دەسەلاتیی زۆرینە (کە سیستەمی نوێنەرایەتییە) ڕزگاربکەین دەبێت کە ئەو سیستەمە لە دوو ئاستی دیکەدا واتە سیستەمی نوێنەرایەتی دەبێت بەهۆی دوو گەرەنتیی دیکەوە سنووردار بکەین، کە ئەوانیش هەڵبژاردنی ناو بەناو دەستاودەستکردنی دەسەلات و گەرەنتییەکانە بۆ کەمایەتییەکان، واتە سیستەمی نوێنەرایەتی بەتەنها ناتوانێت بەیانی سیستەمی دیموکراسی بکات و دەبێت ئەو دوو ئاستەی دیکەی بۆ زیاد بکرێت. دەسەلاتی فەرهەنگ نابێت ڕێگربێت لەبەردەم کارو چالاکی و ئازادیی فەرهەنگەکانی دیکە، چونکە بیری نەتەوەیی، بیری دەسەلات و بیری دینی و ئایدیۆلۆژی هەوڵ دەدەن بۆ بەدیهێنانی زۆرترین یەکێتی و یەکبوون «التوحید»، لەکاتێکدا بیری دیموکراسی هەوڵ دەدات بۆ پاراستنی فرەیی و جیاوازی و ئازادی و سەرەنجامیش هەر لەم ڕێگایەوە بەدیهێنانی زۆرترین ڕێکەوتن و کۆدەنگی. هێرشی عەقڵ و عەقڵگەرایی کە لەلایەن دەسەلاتی گەل و نەتەوەوە (یان ئەو نوێنەرانەی کە بوونەتە قسەکەری گەل و نەتەوە) بۆ سەر ناسنامە و ئازادییەکانی دیکە، دەبێت ڕێگای بگیرێت. هێرشی ئازادی و فرەیی و جیاوازبوون کە لەلایەن کەمایەتی و خێڵەکان و حزبەکان و سەرمایەدارانەوە کە دەکرێتە سەر ڕەهەندی گشتی و هاولاتیبوون و تاڕادەیەک دەیەوێت دەسەلاتی زۆرینە قبووڵ نەکات و سەرەنجام دەیەوێت هەموو جۆرە ڕێکەوتن و کۆبوونەوەیەک ڕەت بکاتەوە، دەبێت لەلایەن یاساو دەسەلاتی زۆرینەوە ڕێگای لێ بگیرێت و تەنانەت دەبێت دەسەلات و فەرهەنگی گشتی ڕێگر بێت لەبەردەم زۆربوونی هەلاواردن و ئیمتیازەکاندا. بەکورتی هەڕەشەکانی بەردەم بالاکردن و گەشەکردنی دیموکراسی کە خۆی لە هێرشی

فەرهەنگە جیاوازەکان بۆ سەر دیموکراسی، یان هێرشی فەرهەنگی تاکگەرایی دەسەڵات بۆ سەر فرەفەرهەنگی، دەنوێنێت دەبێت بەم جۆرەی خوارەوە ڕێگای لێ بگیرێت:

هێرشی عەقڵ و عەقڵگەرایی ـــ دەبێت بەئازادی ڕێگای لێ بگیرێت.

هێرشی ئازادی و فرەیی ـــ دەبێت بەدەسەڵاتی عەقڵ و هاووڵاتیبوون و پێویستبوونی پێکەوەژیان ڕێگای لێ بگیرێت.

هێرشی فەرهەنگی /گشتی یان تاک/ ـــ دەبێت بەئازادی و فرەیی و هاووڵاتیبوون ڕێگای لێ بگیرێت.

بەم شێوەیە، جارێکی دیکە تێ دەگەین، کە سیستەم و فەرهەنگی دیموکراسی لە هەر سێ ئاستەکەیدا بوون، سیستەم و فەرهەنگێکی داکۆکیکەرە، نەک هێرشبەر.

## چۆنییەتی گواستنەوە و پیادەکردنی دیموکراسی لە کوردستان

ناونیشانی باسەکەی من (کوردستان لە سەرەتای کاروانی دیموکراسیدا)، بەیانی ئەوە دەکات کە کوردستان هێشتا لەسەرەتای ئەو کاروانەدایە و تا ئێستاش ئێمە لە بواری پراتیکیدا تەنها کەمێک لە دیاردەکانی دیموکراسیمان بەدەست هێناوە. زەمینەی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە کوردستاندا بۆ دیموکراسی بوونی هەیەو تەنانەت کۆمەڵی کوردەواریش، من بەکۆمەڵێکی کراوەو شەفافی دەبینم و هیچ جۆرە دەمارگیری و توندڕەوییەک (بێجگە لە دیاردەی ئیسلامی سیاسی) بۆ هیچ کام لە بیرەکان، فەرهەنگەکان، لە کوردستاندا بوونی نییە و خودی ڕاپەڕینیش کە توانیی لەو بەرینایییە کۆمەڵایەتی و فرەیییەدا بەدی بێت و بەشی هەرە زۆری کۆمەڵانی خەڵک بەمەبەستی بەدیهاتنی ئازادی و ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی دیکتاتۆری و تاک ڕەهەندی لەو ڕاپەڕینە مەزنەدا، بەشداری بکەن و یەکەمین بناغەی گشتی و هاووڵاتیمان لە ڕاپەڕیندا بۆ وەدەرنانی داگیرکەران بنیات نا.

دیموکراسی پێش ئەوەی ببێتە سیستەمێکی دیارو ئاشکرا، پێویستی بەوە هەیە کە زەمینەی ئەو بوونەی هەبێت. کارل پۆپەر پێی وایە کە دەبێت ئەم زەمینانە بۆ

پەیدابوونی دیموکراسی هەبن کە ئەوانیش، ئاشتی، کەمکردنەوەی توندوتیژی، دەوڵەتی یاسا، هاوپشتیی کۆمەلایەتی و گەشەی ئابووری و پەرەوەردەو فەرهەنگێکی گونجاو، باشترین زەمینەن بۆ سەوزبوون و گەشەکردنی دیموکراسی. هەر چەندە ئەم زەمینانە لەناو خودی خەڵکدان و دانیشتووان چاوگەی پەیدابوونی ئەو ئامادەسازییەن، بەلام لە ولاتێکی وەکو کوردستاندا، کە مێژوویەکی دیموکراسیی کۆنمان نییە کەرێگابدات ئەو تواناو زەمینانەی ناو خەڵک بێتە پەیدابوون و کاریگەری، بۆیە دەبینین کەبەشی هەرە زۆری ئەم کارانە، بەناچاری و لەرێگای پێداویستییەوە، لەلایەن دەسەلاتەوە پەیدادەبێت. کۆمەڵناسیی گەشەکردن، کە لەلایەن ئالان تۆرینەوە، بۆ لێکۆڵینەوە لە رەوشی کۆمەڵەکانی دنیای سێیەم، داهێنراوەو بەمانای کۆمەڵناسیی پەرینەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە دەناسرێت، پێی وایە کە دەوڵەت هۆکاری سەرەکییە بۆ گواستنەوە لە شێوازێکەوە بۆ شێوازێکی دیکەی ژیان و دەسەلات و پەرەسەندن(١٤). بەم شێوەیە تێ دەگەین کە بەشی هەرەزۆری ئەو کارە (پەرینەوە بۆ سەردەمی دیموکراسی) دەکەوێتە ئەستۆی دەسەلات و دەوڵەت و دەتوانێت کە رۆڵی کاریگەر ببینێت بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەو کارە.

بەبڕوای من گەورەترین کارەسات و رێگری لەبەردەم دیموکراسیدا لە کوردستان، پەیدابوونی شەڕی نێوان هەردوو بەشەکەی دەسەلاتی کوردییەو ئەو شەڕە یەکەمین بناغەو زەمینەی سەرهەڵدانی دیموکراسیی نەک تەنها کزو لاواز کرد، بەڵکو هیچی وای نەمابوو لەناوی ببات و ئەو یەکەمین بناغە و زەمینەیەش، بێگومان ئاشتییە. شەڕی نێوان دەسەلاتی کوردی (کە خۆشبەختانە خەریکە بەرەو نەمان چووە)، لەبەر ئەوەی کە لەسەرەوەی کۆمەڵدا بەرپابوو و بەشی هەرە زۆری خەڵکیش سەربەو دوو دەسەلاتە بوون، بووە شەڕی نێوان سەرتاپا کۆمەڵی کوردستانی و هیچ نەبێت بۆ ماوەی چەند ساڵێک توانیی گورزی کاریگەر لەو زەمینەیە بوەشێنێت و تەنانەت کرانەوەو شەفافیەتی کۆمەڵی کوردەواریشی تووشی داخران و لێڵبوون و تەماویبوون کردو سەرەنجام کورد و دیموکراسی، زیانمەند بوون. بوونی ئاشتی هەر تەنها ئەوە نییە کە حزبەکان شەڕ نەکەن، بەڵکو دەبێت هۆیەکانی توندوتیژی و دوژمنایەتی لەناو

کۆمەڵدا نەمێنێت و بێگومان بوونی ئەو هەموو هەڵاواردن و ئیمتیازە زۆرو زەوەندانە باشترین خاک و زەمینەن بۆ بوونی توندوتیژی و دوژمنایەتی.

ئەمڕۆ لە وڵاتی ئێمەدا گەلێک هەڵاواردن و ئیمتیازاتی جۆربەجۆر بۆ حزبەکان، خێڵەکان، خاوەن سەرمایە و بازاڕەکان و تەنانەت بنەماڵە و تاکەکان هەیە و دەسەڵات و یاسای ناو کوردستانیش هیچ کارێک ناکات بۆ نەمان و نەهێشتنی ئەو ئیمتیازاتانە، کاتێک کە باسی دەسەڵات و سیستەمی نوێنەرایەتی دەکەین و بەپێی ئەو میتۆدەی کە لە بەشی یەکەمدا باسم کرد، دەبێت دەسەڵاتی ناو بەناو و تازەکردنەوەی هەڵبژاردن و دەستاودەستکردنی دەسەڵات گەرەنتی بێت لە بەرامبەر ئەو دەسەڵاتە زۆرینەو هەڵبژێردراوەدا. لە کوردستاندا ئیمتیازی دینێک بەسەر دینێکی دیکەدا بەئاشکرا دەبینرێت، لە کوردستاندا دینی ئیسلام، هەموو ئیمتیازێکی بەناوی دینی زۆربەوە هەیەو لەکاتێکدا دینەکانی دیکەی کاکەیی، ئێزیدی و مەسیحی کەمتر لە مافەکانی خۆشیان هەیە. بوونی حزبە ئیسلامییەکان (کە هەروەکو باسمان کرد فەرهەنگی دیموکراسی ڕێگرە لەبەردەم دروستبوونی حزبەکان، چونکە ئۆرگانن بۆ دەسەڵات، لەسەربناغەی دینی، نەتەوەیی، چینایەتی و ئایدۆلۆژی. لە دیموکراسیدا تەنها دەتوانیت بەناوی نیشتمانی و دیموکراتی، ئازادی و هاووڵاتی و هەر ناوێکی دیکە کە تەعبیر لە فەرهەنگی گشتی و هاووڵاتی بکات، حزبەکان دروست بکرێن) بەوهەموو ئیمتیازە زۆرانەوە، لەکاتێکدا کە یاسای حزبەکانی کوردستان ڕێگرە لە دروستبوونی حزبەکان لەسەر بناغەی نەتەوەیی، دینی، ئایدۆلۆژی و چینایەتی و تەنانەت ڕێگریشە لەبەردەم ئەو بەرنامانەی کە دەیانەوێت حزبەکان لەسەر ئەو بیرو باوەڕانە دروست ببن، یەکێک لەو هێرشانەی کە دەکرێتە سەر ڕەهەند و ئاستەکانی دیکەی دیموکراسی (هاووڵاتیبوون، دەسەڵاتی نوێنەرایەتی و ئازادیی گشتی) کە لەلایەن ڕەهەندێکی تایبەتی دینییەوە بەرهەم دەهێنرێت.

لەکاتێکدا هەندێک خەڵک بەهۆی هێزو دەسەڵاتی ماڵییانەوە تارادەیەک توانیویانە لەبازاڕدا ئازادبن و ببنە بەشێک لە خاوەنەکانی بازاڕی ئازاد، نابێت ڕێگای ئەوەیان پێ بدرێت کە بەئارەزووی خۆیان نرخ لەسەر کالاکانیان دابنێن و دەبێت بازاڕی

ئازاد، کە بێگومان یەکێکە لە مەیدان و ئاستەکانی دەرکەوتنی دیموکراسی، بەگەرەنتییەک کە کەمترین نرخە، سنووردار بکرێت و ڕێگا نەدرێت بازاڕی ئازاد بەتەواوی ئازادبێت لە دانانی زۆرترین نرخدا و چەوسانەوەی زیاتری دانیشتووان، بەڵکو دەبێت بازاڕی ئازاد سەرپشک بکرێت لە دانانی کەمترین نرخ و باشترین جۆری کاڵاکان و کەمکردنەوەی هەرچی زیاتری چەوسانەوەی هاووڵاتییان. بوونی بازاڕێکی ئازادی لەبابەتی ئەوەی کە لە ساڵانی ڕابردوودا لە کوردستاندا هەبوو، ئایا جۆرێک هەڵاواردن و ئیمتیازات نەبوو، بۆ سەرمایەداران و دەوڵەمەندان ؟

بوونی هەڵاواردن و ئیمتیازات هۆکارێکی گرنگە بۆ کەمکردنەوەی هاوپشتیی کۆمەڵایەتی و ڕێکەوتن و کۆدەنگیی نێوان دانیشتووان، کە بەهاوشانی فرەیی و جیاوازی دەتوانێت بناغەو زەمینەیەکی گرنگ بۆ ئاشتی و هاوپەیمانیی کۆمەڵایەتی فەراهەم بکات.

یەکێکی دیکە لە سیماو چالاکییە گرنگەکانی سەردەمی دیموکراسی و بەتایبەتی لە وڵاتانی پەرە ئەستێنی جیهانی سێیەمدا، وەکو کوردستان، دەسەڵاتی یاسا و سەروەریی یاسایە کە هەمووان هەست بکەین کە ئەو یاسایە سەروەرە و دەمانپارێزێت و بەجۆرێک کە کارل پۆپەر پێی وایە دەسەڵاتی یاسا دەبێت دەسەڵاتێکی ڕەهابێت[١٥] و هیچ کەس و دەسەڵات و فەرهەنگێک بۆی نەبێت کە لەسەرووی یاساوە بێت.

لەوانەیە جوانترین مانای چەمک و دەسەڵاتی یاسا لەلای مۆنتسکیۆ پەیدای بکەین کە دەڵێت: (یاسا، بەشێوەیەکی گشتی، عەقڵی مرۆڤایەتییە کە دەتوانێت بەسەر تەواوی خەڵکی زەویدا دەسەڵاتی هەبێت). بەشێوەیەکی دیکە ئەگەر بمانەوێت باشتر وتەکەی مۆنتسکیۆ بناسین دەبێ بڵێین؛ کە یاسا ئەنجامی کارکردی عەقڵی مرۆڤە لە چوارچێوەی سیستەمی کۆمەڵایەتیدا. کارکردی عەقڵی مرۆڤ بەمانای دۆزینەوەی ئەو عەقڵە پراتیکییە کە دیاریکەری سنوورەکانی یاسادانەری تاکی ناو کۆمەڵە وەکو تاکێک کە جێگاو ڕێگای ئازادی و هەڵسووڕانی هەبێت. بەو شێوەیە، سنووری ئازادی و کاری تاکی کۆمەڵایەتی کە لەلایەن یاساوە دەستنیشان دەکرێت لە ئەنجامی هەڵبژاردنی ئازادی ئەوانەوە پەیدادەبێت. سەرەنجام یاسا گشتێکی جیا و

سەربەخۆ لە ئیرادەی تاکی ئازاد و کۆمەڵایەتی نییە و بەڵکو گشتێکە کە لەناویدا پەیوەندیی هەرکەسێک بەیاساوە بەشێوەی بکەری یاسایی دەناسێنێت. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین کە گشتیبوونی یاسا زامنکەری ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆیی و ئازادیی تاکەکانە لەناو ئەو گشت و کۆمەڵەدا. لەڕاستیدا، ڕەسەنیی یاسا لە پەیوەندیی نێوان گشتیبوون و تاکەکاندا دەبینرێت، بۆیە دەبێت کە یاسا بەتەنها بەسنووری ئیرادەی یەک کەس، یەک سازمان یان دەزگا، یەک حزب یا گرووپی کۆمەڵایەتییەوە نەبەستینەوە و هەر یاسایەک بەو جۆرە بێت، یان بەو جۆرە کاربکات، هەموو جۆرە ڕەسەنایەتی، گشتیبوونی و ئازادیی خۆی لەدەست دەدات و بەو وتەی ئەفلاتوون: هەر یاسایەک کە تەنها بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی بەشێک دادەنرێت، لەخۆیدا ناوی یاسا نییەو بەڵکو دەبێت وەکو پەیڕەوی حزبەکان، یان کۆمەڵەکان، یان دینەکان، چاوی لێ بکرێت و لە سنوورەکانی یاسادا جێی نابێتەوە[١٦].

ئەوەی ئێستا بۆ ئێمەی خەڵکی کوردستان گرنگە، ئەوەیە کە بزانین سەرەتاو ئەولەویەتەکانی دیموکراسی بۆ سازکردنی زەمینەی دەستپێکی ئەو سیستەمە چییە و چۆن ئەو سەرەتایانە بەدی دێت (هەر چەندە زەمینەیان لەناو کۆمەڵ و خەڵکدا هەیە)، بەڵام دەبێت لەلایەن هێزو توانای خودی کۆمەڵ و دەسەڵاتی کوردییەوە (کە بەپێی دیدی ئالان تۆرین ئەو دەسەڵاتە هۆکاری سەرەکییە بۆ پەرەپێدانەوە بۆ دیموکراسی) ئەو ئامادەییانە بکرێتە هێزێکی زیندوو، بەردەوام و هەمیشە ئامادە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵێکی دیموکراسی پڕ لە ئاشتی، دەسەڵاتی یاساو کەمکردنەوەی هەڵاواردن و ئیمتیازات (گرتنەبەری سیاسەتی هاوڵاتی) ئەو سەرەتایانەن کە هەموو کۆمەڵێک دەبێت هەیبێت بۆ پەرەپێدانەوە بۆ دیموکراسی و بنیاتنانی ئەو سیستەمە. ئەو سێ زەمینەو ڕەهەندە (ئاشتی، دەسەڵاتی یاسا و هاووڵاتیبوون) دەبنە هەنگاوی یەکەم و پاشان هەنگاوەکانی دیکەی دیموکراسی دێتە دی و دەتوانین بناغەیەکی پتەوو یاسایی و یەکسانی بۆ ئازادییەکی داکۆکیکەر نەک هێرشبەر، هاوپشتی و ئاشتیی کۆمەڵایەتی، گەشەی ئابووریی و سەرەنجام لە کۆی ئەمانە دەتوانین پەروەردە و فەرهەنگێکی دیموکراسی و شارستانی بەدەست بێت و کوردستانیش بەهۆی ئەمانەوە دەبێتە کۆمەڵ و سیستەمێکی ئازادی، فرەیی، کۆدەنگی، یاسایی و

شارستانی و له قۆناغی داگیرکراو و کۆیلەتییەوە دەچینە قۆناغێکی باشترو گونجاوتر و زیاتر لە سنوور و ڕەهەندەکانی مرۆڤی ئێستا و حەقیقەت نزیک دەبینەوە. بەبڕوای من باشترین کار ئەوەیە کە ئێستا باسی سەرەتاو دەستپێکەکانی دیموکراسی بکەین و بەرئەنجام گەشەکردنەکان بخەینە قۆناغی ئایندەمان.

سەرچاوەو پەراوێز:


١- کارل پۆپەر، وانەی ئەم سەدەیە. وەرگێرانی شۆڕش جوانڕۆیی، چاپی سەردەم (سلێمانی)، ٢٠٠١.

٢- ئەم وتەیە هی جاک دریدایە، کتێبی (اطیاف مارکس)، گۆڤاری سەردەم ژمارە ١٤.

٣- الان تورین، (ماهي الديمقرطية؟) دار الساقي ١٩٩٥بيروت.

٤- کارل پاپر، درس این قرن، مترجم علی پایا، تهران طرح نو ١٣٧٦.

٥- الان تورين، نقد الحداثة، ترجمة، انور مغيث المجلس الاعلي الثقافة ١٩٩٧.

تێزی سەرەکیی ئالان تۆرین لەکۆمەڵناسدا سۆسیۆلۆجیای بکەرە کۆمەلایەتییەکانە کە وەکو کاردانەوەیەک بۆ تێزی تالکۆت پارسۆنز، کۆمەڵناسی ئەمریکی، کە سۆسیۆلۆجیای سیستەمە کۆمەلایەتییەکانە.. بڕوانە جان لچت، پنجاه متفکر بزرگ معاصر، ترجمه محسن حکیمی تهران ١٣٧٧ بەشی پۆست مارکسیزم

٦- یلان تورین، ماهی الديمقراطيه؟ دارالساقی بیروت ١٩٩٥.

٧- هەمان سەرچاوە.

٨- هەمان سەرچاوە.

٩- روبرت هولاب، یورگن هابرماس (نقد در حوزه عمومی) ترجمه، د. حسین بشیریه، نشرنی تهران ١٣٧٨ چاپ دوم.

١٠- کارل پۆپەر، وانەی ئەم سەدەیە. چاپی سەردەم (سلێمانی)، ٢٠٠١.

١١- تزفتيان تودوروف، نحن وآلاخرون. ترجمة، د. ربى محمود، دار المدى ١٩٩٨.

١٢- ئالان تۆرین. هەمان سەرچاوەی پێشوو

١٣- ئالان تۆرین. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٤- ئالان تورين، نقد الحداثة، ترجمة، انور مغيث المجلس الاعلى للثقافة ١٩٩٧.

١٥- کارل پۆپەر، وانەی ئەم سەدەیە.

١٦- رامین جهانبگلو، مدرن ها، نشر مرکز، تهران ١٣٧٦.

## ناکۆکی و یەکێتیی نێوان کورد

زانای گەورە و فەیلەسووفی سیاسی ئەڵمانی، هیگڵ لە کتێبی «جیهانی ڕۆژهەڵات»دا، مێژووی پەیدابوونی بیر، خود و کەسایەتیی «هوشیاری» دەکات بە سێ بەشەوە و لە هەریەکێک لەو قۆناغانەدا سیفات و کاریگەریی ئەو هێز و ڕەواییە لەسەر کۆمەڵ و مێژوو شارستانی باس دەکات. قۆناغی یەکەمی ئەو مێژووە لە وڵاتی چینە، لەم وڵاتە سێ گشتی بە هێز و سەپێنراو دەبنە سەرچاوەی هەموو هێزەکان. هێزەکانی دیکە، جگە لەم سێ گشتە، هیچ نرخ و بەهایەکیان نییە و ئەوەندە نەبێت کە لەژێر سێبەر و لە خزمەتی ئەو گشتانەدا بن. گشت لە چین پێک هاتووە لە سروشت، دەسەڵات «ئیمپراتۆر» و باوک. وەکو ئاشکراشە مرۆڤی چینی و خودی چینی هیچ هێز و ئیرادەیەکی نییە لە دانان و لابردنی ئەم گشتانەدا. بۆیە لێرە «خود»، «ئیرادە» و «هوشیاری» ناتوانێت بوون و ڕەواییەکی سەربەخۆی هەبێت و هەموو مێژووی ئەو وڵاتە مێژووی ئەو گشتانەیە و تا ئێستا گشتی سەپێنراوی دەسەڵات لە بەرگی کۆمۆنیزم و دەسەڵاتی تۆتالیتار درێژە بەژیانی خۆی دەدات. یەکێتی و یەکبوونی چینیش هەر یەکێتییەکی سەپێنراوی سەروو دەسەڵاتی خەڵکە (خودەکان)، یان ئەو یەکێتییە بۆیە هەیە چونکە هەر گشتی سەپێنراو دەسەڵات و هێزی هەیە.

قۆناغی دووەمی دەرکەوتنی نێوان «خود» و «گشت» لە هندستانە، لێرەدا گشت تێک دەشکێت و دابەش دەبێت بۆ (بەشە) جیاوازەکان، بەڵام هیچ کام لەو بەشانە ناتوانن جێگای گشت بگرنەوە و لە کۆی و تێکەیشتنی هەموو بەشەکانیش، ئێستاشی لەگەڵدا بێت، گشت پێکناهێنرێت، بۆیە هیگڵ بەم وڵاتە دەڵێت «وڵاتی بێ شیرازە» و وڵاتی «العدم» نەبوون. لێرەدا نەهوشیاری، نەخود، نە ئیرادە ناتوانن ببنە خاوەنی کەسایەتیی کاریگەر لەسەر خودی خۆیان و لەسەر بەدیهێنانی گشت و لەسەر تەواوی مێژووی ئەو وڵاتە، ئاوێکیش لەمانە هەبێت، تەنها مانای ئەو

دیاردانەیە، نەک خودی ئەو دیاردە ئاشکراو دیار و خاوەنی کاریگەرییە.

هندستان ئەو وڵاتە گەورەیە و بەو هەموو توانا و دەسەڵاتەوە، بەڵام لە ناو خۆیدا بێ توانا و شیرازەیی، ناکۆکی برسێتی، نەخوێندەواری و سەرەنجام (نەبوون!) بەرهەم دێنێت، چونکە بە ڕاستی نەیتوانیوە «گشت» لە کۆی بەشەکان (ئاینەکان، نەژادەکان، نەتەوەکان و ناوچەکان) پێک بهێنێت.

قۆناغی سێیەمی دەرکەوتنی «ڕۆح» خود و هوشیاری و کەسایەتی لە وڵاتی ئێرانە، بە قسەی هیگڵ لە ڕۆژئاوای ئێران، لە میدیا و لە کوردستانە، لەگەڵ دەرکەوتنی «ڕووناکی» و «زانینی» دینی زەردەشتی، وەرچەرخانێکی گەورە دێتە ناو مێژووی مرۆڤایەتی و بۆ یەکەم جار مرۆڤایەتی پێ دەنێتە ناو مێژوو، چونکە بۆ یەکەم جار زانین و ڕووناکی دەبێتە ناوەرۆکی گشت. لە دینی زەردەشتدا خودا (ئاهورامەزدا) واتە (سەروەری زانا) ئەو کەسەیە کە خاوەنی زانایی، ڕووناکی، ڕاستگۆیی و ئیرادەیە و دەبێت ئافەریدەکانیشی (مرۆڤ) وەهابن، ئاهورامەزدا (فرووهەر) واتە مرۆڤ لە خۆی بە کەمتر نازانێت و بە هاوشانی خۆی دەناسێت و داوای یارمەتیی لێ دەکات بۆ شەڕی ئەهریمەن کە ڕەمزی نەزانی، تاریکی درۆ و بێ دەسەڵاتییە، ئاهورامەزدا (خودا)ی زوڵم و زۆر و سزادان نییە و هەروەکو خودای بەخشین و بەڵێندانیش نییە، داوا دەکات کە مرۆڤ لەسەر زەوی، بەهەشتێک بەو چەکانەی کە ناومان هێنان (ڕووناکی، زانایی، ڕاستگۆیی و ئیرادە) دروست بکات، بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا زانایی و ئیرادە دەبێتە سەرچاوەی هێزەکان و پاشان ئاواکردنی «گشت»ێکی دڵخواز لە کۆبوونەوەی هەموو ئەو سیفەتە جوانانەی کە سیفەتی هاوبەشی خودا و مرۆڤن، لێرەدا گشت سەپێنراو نییە، گشت لە ئەنجامی ڕێکەوتنی نێوان بەشەکان پەیدادەبێت، چونکە ئاهورامەزدا، مرۆڤ لە خۆی بە کەمتر نازانێت و داوای یارمەتی لێ دەکات بۆ جەنگی دژی زۆرداری و تاریکی.

هیگڵ لە کۆتایی کتێبەکەیدا دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە دینی مەسیحیش بە تایبەتی مەسیحی لە ڕۆژئاوای ئەوروپا، ئاینی (مەزهەب) پرۆتستانت ڕێبازێکە کە کاریگەریی دینی زەردەشتی لەسەرە و شارستانی ئەوروپا و بە تایبەتی گەلانی جەرمانی لە

ئەنجامی ئەو (ڕێکەوتنەی) نێوان بەشەکاندا دروست بووە، لە ڕاستیدا تا ئێستا نهێنیی ئاسوودەیی و بە هێزی و شارستانی ئەورووپای ڕۆژئاوا دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکەوتنی نێوان بەشەکان، هێزەکان، خودەکان و ڕەواییەکان و توانیویانە لە کۆی ئەمانە گشتێکی دڵخواز پێک بهێنن و پێشکەوتنێکی بەرچاو و کاریگەریش ئاوا بکەن کە لە بەرژەوەندی هەموو بەشەکاندا بێت.

داوای لێبووردن لە خوێنەرانی بەڕێز دەکەم بۆ ئەو پێشەکییە درێژە، بەڵام ئەگەر وا نەبووایە نەدەکرا، یان لە ڕاستیدا من نەمدەتوانی مەبەستی خۆم بەیان بکەم، لە کوردستانی پاش نەمانی گشتەکان، لە دوای سەردەمی ڕابەرە بەهێزەکانەوە، پاش پەیدابوونی چەند «بەش»ی کوردی و چەند «خود» و چەندین «هۆشیاری» و چەندین «ئیرادە»، ناتوانرێت کە یەکێک لەو بەشانە ببێتە گشتێکی سەپێنراو. ئەو سەردەمانە کە یەکێک لە ڕابەرەکان، خێڵەکان، ڕاپەڕینەکان، شێوە زمانەکان، ناوچەکان و ئامادەییەکان، بووبوونە «گشتی سەپێنراو!» لە بەر دوو هۆی گرنگ، یەکەم بە هۆی بەهێزی و بە توانایی ئەو ڕابەرانەوە (بەشانەوە) بوو، دووەمیش لەبەر بێ هێزی بەشی هەرە زۆری نەتەوەی کورد بوو، بەڵام ئێستا ئەو گشتانە بەرەو بێ هێزیی هەنگاودەنێن و لە ڕاستیدا لە گشتبوون کەوتوون و بەشەکانی دیکە بەرەو بەهێزی هەنگاو دەنێن و قبووڵ ناکەن کە ببنە یان (بە زۆر بکرێنە) بەشێکی حساب بۆ نەکراو و لە پەراوێزدا دانراو. ئێستا لە کوردستاندا چەندان حزبی بەهێز و خاوەن مێژووی سەروەری و قوربانیدان هەیە، ئێستا لە کوردستاندا گەلێک ڕێبازی ئاینی جیاواز لە ئیسلام هەن (ئەهلی حەق، ئێزدی، عەلەوی، شەبەک) و وێڕای جیاوازیش لەناو (ئاینە) ئیسلامییەکان (واتە بوونی تەسەوف، قادری، نەقشبەندی، مەولەوی و نوورسی) لە کوردستاندا چەندین ئامادەیی (ئابووری، مەعریفی، سەربازی و کۆمەڵایەتی) جیاواز هەیە، بە ڕاستی ناکرێت لە سەردەمێکدا کە ئەو هەموو جیاوازی و فرەییە هێز و دەسەڵاتی یەکێک «بەشەکان» بسەپێنێت و ببێتە «گشت!» و دەوری بەشەکانی دیکە بسڕێتەوە. سەرچاوەی یەکەمی ناکۆکیی نێوان کورد، بە داخەوە لەوە پەیدا دەبێت بەشێکی زۆری خودەکان و هێزەکان، هێز و ڕەوایی بۆ ئەوانی دیکە بە سروشتی نابینن و هەموو ڕاستی و ڕەوایی تەنها هەر لەلای خۆیان

دەبینن، ئەو ڕەوشە کاریگەرییەکەی هەر بەوە نەوەستاوە کە ئەو هێزانە لەناو خۆیاندا ناکۆکن، بەڵکو لەسەر ئاستی وڵات و کۆمەڵیش کاردانەوەی خراپی هەبووە. تەماشا دەکەیت پێشکەوتن و کاری بە کۆمەڵ و بەرپرسیاریی نیشتمانی زۆر بەرەو لاوازی دەچێت، لە سەردەمێکدا کە کەمترین (ڕێکەوتن) لە نێوان هێزە کوردەکاندا هەیە، لە سەردەمێکدا کە کەمترین کاری نیشتمانی و بە کۆمەڵ لە گۆڕێ نییە، لە سەردەمێکدا کە هیچ پرۆژەیەکی یەکێتی نەتەوەیی و لە ئەنجامی کۆبوونەوەی ئەو بەشانەدا نییە، لە سەردەمێکدا کە پارچەکانی کوردستان زیاتر بە یەکتری دوور دەکەونەوە ئایا دەتوانین خەیاڵی ئەوە بکەینەوە کە خزمەتی وڵات و نیشتمان بکەین، کە پرۆژەیەک بۆ خزمەتی گشتی پێشنیاز بکەین، یان هەوڵ بدەین کە ئەو ناوچانەی کە ئێستا ڕزگار نەکراون، ڕزگار بکەین، بە داخەوە تەنها ناکۆکی و نەبوونمان بەرهەم هێناوە.

یەکەمین کارێ کە ئێستا لە بەردەم چارەنووسی کوردستاندا کاریگەریی گرنگی دەبێت، دیسان قبووڵکردنەوەی ئەو پرەنسیپەیە کە ئێمە هەموومان هەموو بەشەکان تەنها بە (ڕێکەوتن) دەتوانین گشتێکی کوردستانیی دڵخواز دروست بکەین و بیکەینە سەرچاوەیەک بۆ هەموو کارەکانی ئایندە و سەرچاوەیەک بۆ پێکەوە بەستنی حزبەکان، پارچەکان، ئاینەکان و ئامادەییەکان. لە ڕاستیدا کورد هەموو زەمینە و سەرچاوەکانی کاری گشتی و بە کۆمەڵی هەیە، کورد لەو مەیدانانەدا توانیویەتی نەتەوەیی بوونی خۆی بپارێزێت، کورد توانیویەتی زمانی کوردی بپارێزێت و بتوانێت زمانی جیاواز و سەربەخۆی خۆی بهێڵێتەوە و هەموو ئەمانە دەبنە گشتیبوون و ئەو کۆبوونەوەیەش بە دەوری خۆی دەتوانێت ببێتە سەرەتایەک بۆ بەدیهێنانی پرۆژەیەکی نەتەوەیی و یەکێتیی بەشەکان و ڕێکەوتنی نێوان خودەکانی ناو کورد سەرەتای هەنگاوەکانی دەست پێ دەکات.

لەو وڵاتانەی کە خاوەنی دەوڵەتن دەستوور دەبێتە سەرچاوەیەک و پەناگەیەک بۆ هەموو بەشەکان و دەکرێتە گشتێکی دڵخوازی نێوان هەمووان، بەڵام ئەگەر ئێمەی کورد نەتوانین دەستوورمان هەبێت، خۆ دەتوانین کۆنگرەیەکی بەهێزی یەکبوون و دامەزراندنمان هەبێت و بیکەینە سەرچاوەیەک بۆ وەلانانی ناکۆکی و گەورەکردنی

خاڵە هاوبەشەکان و ناواکردنی یەکێتیی بەهێز و قبووڵکراو لە لایەن هەمووانەوە. ئەو کۆنگرەیە دەتوانێت کۆنگرەی حزبەکان، پارچەکانی کوردستان، ئاینەکان و ئامادەییەکان و زاراوەکان بێت و بۆ پێکەوەنانی سەرچاوە و بناغەیەکی دیموکراسی و گشتی بۆ کوردەواری، بەڵام سەرەتای ئەو کارەش بەوە دەست پێ دەکات، کە هەریەکە لەلای خۆیەوە خودەکانی دیکە، هێزەکانی دیکە، ڕەواییەکانی دیکە بخوێنێتەوە و چۆن خۆی بە خاوەنی ڕاستی دەزانێت، ئاوا ئەوانیش بناسێت.

مەسەلەی ڕێکەوتن و سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی گشت بۆ ئەو وڵاتانەی کە خاوەنی سەروەری و دەوڵەتن، ئەگەر مەسەلەی بەردەوامبوون و پێشکەوتن بێت، ئەوا بۆ کورد ئەو پرسە دەبێت جێگەی بوون یان نەبوونی کورد، واتە (کوردبوون) تەنها و تەنها بە یەکێتی و ڕێکەوتنی نێوان بەشەکان دەتوانێت بوون و هێز و بەردەوامبوونی هەبێت.

تا ئێستا زۆر جار باسی وشەی هەق و ڕەواییمان کرد و ئاماژەمان بەوە دا، کە بە داخەوە «بەشەکانی» کورد هەقیقەت و ڕەوایی نێوان خۆیان نابینن و هەریەکە ئەوی دیکە بە ناهەق و ناڕەوا دەزانێت.

بۆئەوەی بتوانین لە چەمکی «هەق» و «ڕەوایی» تێ بگەین پێویستمان بە لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی، سیاسی و کۆمەڵایەتی دەبێت، بۆ زانینی کاریگەریی گرنگی ئەو دیاردەیە لەسەر مێژووی مرۆڤایەتی پەیدابوون و هاتنەدیی هەق و ڕەوایی لە سەردەمە مێژوویی و ساتە فەلسەفییەکاندا بەم جۆرە بووە.

### سەردەمی یەکەم (ساتی یەکەم):

بەدەستهێنانی بیر، هێز و ڕەواییە، کە بابەتی ئەم زانستە فەلسەفییە سیاسییە بریتییە لە بیری هەق، واتە بیرکردنەوەی گشتی سەبارەت بە مافەکان و هاتنەدی و جێبەجێبوونیان. بیرکردنەوەی گشتی بۆ هەق بریتییە لە خودی عەقڵ و سروشتی عەقڵانی ئەو بابەتە و دەتوانین بە شێوەیەکی ڕوونتر بڵێین کە بابەتی هەق و ڕەوایی، بیرێکی ژیرانەیە سەبارەت بە هەق و بەدیهاتنی ئەو عەقڵە.

ئەو کاتەی مرۆڤ بیری کردەوە، بڕیاری دا کە مافەکانی خۆی لە سروشت و کۆمەڵ بستێنی، ئەو کاتەی مرۆڤ بەری درەختەکانی خوارد، ئاژەڵی ڕاوکرد،

خانووی دروست کرد بۆ ژیان، خێزانی پێکەوەنا، لە کۆی چەند خێزانێک خێڵی دروست کرد، لە کۆی چەند خێڵێک میللەت «القوم»ی دروست کرد و لە ئەنجامی یەکگرتنی دوو میللەت یان زیاتر نەتەوەی پێک هێنا، توانیی کاریگەری بکاتە سەر سروشت و کۆمەڵ، توانیی بیر و بیرکردنەوەی سەبارەت بە ژیان و (مافەکانی کە بە دەستی خۆی بەدی هێنابوو، جێبەجێی دەکرد بەرهەم بهێنی) ئەوکاتە هێز و ویستی پەیداکرد و لە ئاکامی بەردەوامبوونی ئەم هێزانەدا خۆی سەلماند و توانیی لە سروشت خۆی جیابکاتەوە و کاریگەریشی لەسەر خودی سروشت دابنێ.

بەم شێوەیە لە سەردەمی یەکەمدا (لە ساتی یەکەمدا) کاریگەریی لە سروشت کرد و بە دەستی خۆی مافەکانی خۆی سەند، بیرکردنەوەی خۆی سەبارەت بە مافەکان و هێزی خۆی نەخشاند و توانیی سروشتی عەقڵانی بە هەق ببەخشێت و وا بکات کە بیرکردنەوەی مافی هەبێت و بە پێی وتەی هیگڵ «ڕۆحی خودی» خۆی بەدەست بهێنێت و ڕاستەوخۆ توانیی خۆی لە سروشت جیابکاتەوە و بتوانێت بە شێوەی «خود»ێکی سەربەخۆ دەربکەوێت و ببێتە خاوەن سنوورەکانی خۆی.

واتە سەردەمی یەکەم لە ڕەوایی بەدەستهێنانی خود و بیرکردنەوەی عەقڵانی و خاوەن مافە، دەربارەی «خود».

**سەردەمی دووەم (ساتی دووەم):**

وێڕای ئەوەی کە خود توانیی خۆی و مافەکانی و بیرکردنەوەی ژیرانە، پاش ئەوەی لە سروشت و کۆمەڵ «بابەت» جیابووەوە، بەڵام سروشت و کۆمەڵ کە سەرچاوەی بەدیهێنانی ئەو دیاردانەیە وەکو «بابەت»ێکی سەربەخۆ لە خود هەر دەمێنێتەوە و هەروەکو چۆن خود ڕەوایی خۆی بەدەست هێنا، بە هەمان شێوەش بابەت دەتوانێ کاریگەریی گەورە لەسەر مرۆڤ و هێزەکانی و بیرەکانی بکات. ئەو بەرهەمانەی کە مرۆڤ بەدەستی هێنا لە خود، بیر و ڕەواییی ئەوانیش سەرەڕای ئەوەی کە کاریگەرییان لەسەر خودی مرۆڤی خاوەندار هەیە و کاریگەریی بابەتیشیان لەسەر مرۆڤەکانی دی و لەسەر کۆمەڵیش (کە لە چەندین مرۆڤ) پێک هاتووە، هەیە واتە بەدەستهێنانی بیر، هێز ئیرادە و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی (خێزان، خێڵ، دابەشکردنی کار، دەسەڵات) هەرچەندە بەرهەمی خودی مرۆڤە و لە ئەنجامی

پێداویستییەکانی مرۆڤەوە بەرهەم دێت، بەڵام ئەم بەرهەمانەش کاریگەریی بابەتییان لە خودی مرۆڤەکە و ئەوانی دیش دەبێت. کاتێک کەسێک خێزان پێک دەهێنێت ئەوکاتەی خودی ئەو خێزانە (پێکهێنراوە) کاریگەریی بابەتیی دەبێت لەسەر هەردوو کەسی خێزانەکە (ئافرەت و پیاو) واتە کاریگەرییەکە لەهەردوو سەرەوە دەبێت لەسەر یەکتری و سەرەڕای پێداویستییە ماددی، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی خێزان.

واتە خێزان کە بەرهەمی پێداویستییەکانی «خود»ە، بەڵام لە ساتی پێکهێنانییەوە دەکەوێتە ئەوەی کە کاریگەریی بابەتی بکاتە سەر ئەوانەی کە پێکیان هێناوە، کاریگەریی بابەتی واتە کارلێکردنێک کە لە سەروو ویست و هێزی مرۆڤەوە دەبێت. بیریش هەر بەو شێوەیە، بیر بەرهەمی پێویستی و ژیانی مرۆڤە، بەڵام هەر لە ساتی پێکهاتنییەوە کاریگەریی بابەتیی لەسەر مرۆڤی خاوەن بیرو ئەوانی دیکە دەبێت، هەموو دامودەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکان و هەموو مێژووی مرۆڤایەتیش کە ئەمانەن هەموویان بەرهەمی بیر و هێز و ئیرادەی«خود»ن بەڵام وێڕای کاریگەریی خودی، کاریگەری بابەتی و سەروو دەسەڵاتی خۆیان دەبێت.

بەم شێوەیە ئەم بەرهەمانە، ئەم بیرانە، ئەم هێزانە و ئەم خودانە دابەش دەبێت بۆ خود و بۆ بابەت و دەبێتە پێداویستییەکی هۆشیارانە، کە ئەمەش (زانست و فەلسەفە) لێی دەکۆڵێتەوە و مێژووش پەیدادەکات و پاشان هۆشیارییش دەگاتە پلە باڵاکانی دیکەی عەقڵ وەکو (زانین، بیرکردنەوە و ئیرادە).

مارکسیزم بەم سەردەمە و بەم ساتە فەلسەفییە دەڵێت: (بوونی ماددی)، بەڵام هیگڵ ناوی دەنێت (ڕۆحی بابەتی) و مرۆڤایەتیش سەرەنجام دەگاتە زانست، فەلسەفە و مێژوو، چونکە کاریگەریی هێزەکانی مرۆڤ و ڕەوایییەکانی تەنها ناوەستێتە سەر کارکردن لە مرۆڤ بەڵکو لە ئاستێکی بابەتی و لە سنووری سروشت و کۆمەڵدا کاریگەریی گەورەی دەبێت یان باشتر بیناسێنین کارلێکردنی گەورەیان لەسەر یەکدی دەبێت واتە خود و بابەت. بۆیە تەماشا دەکەین کە ڕۆحی بابەتی (کە سەرچاوەکەی هەمان هێزی خودی و هێزەکانی سروشت و کۆمەڵە) دەبێتە ئەو ڕۆحە کە گرنگی دەدات بە لێکۆڵینەوەی عەقڵانیی پێداویستییەکانی ڕۆح و خود، پاش ئەوەی کە خودەکە بەجێ دەهێڵێت و کاریگەریی لە جیهانی دەرەوەی خۆی دەکات

(ئەم دنیـایەی دەرەوە مـەبەست لـە سـروشت نیـیـە، چونکە سـروشت بە بـوون و بە نەبوونی مـرۆڤـیش هەر هەیە)، بەڵکو مـەبەست بیروباوەڕی مـرۆڤـە لـەسـەر کۆمـەڵ و دەوروبەر و پێداویسـتییـەکانی، ئەم جیـهانەش بە گشـتی دنیای دەزگا و دامـەزراو و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییە وەکو زمان، یاسـا، خێزان، کۆمەڵ، دەسـەڵات، دابونەریت، ئەرک و مـافـەکـان، ئاکـارەکـان «الاخـلاق» و گشت پەیوەنـدییـە کۆمـەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و فەرهەنگییەکان.

**سەردەمی سێیەم (ساتی سێیەم):**

کۆبوونەوە و کـارلێکردنی هـەردوو خود و بابەت، یان ڕۆحی خودی و ڕۆحی بابەتی، هەر لـەسـەر ئاسـتی مـرۆڤـە خـاوەندارەکان و لایەنە خـودییـەکـان نابێت، بێگومـان وەکو باسـمـان کرد لەسـەر ئاسـتـی کۆمـەڵ و تەنانەت سـروشـتـیش دەبێت، چـونکە مرۆڤ توانیـویەتـی و ئەوەندەی بۆی کـرابێت دەسـتکاریـی سروشـتـیش بە قـازانجی خـۆی بکات. بەلام دیسـان و سـەرەڕای بـوونی هێـزی کـاریگەری خـود، هەر ناچار دەبێت پێـویسـتی بابـەت بێت، جـا یان ئەو بـابەتە خـودی کـۆمـەڵ و سـروشـتـە یان هـەروەکو ئاماژەمان پێ دا کاریگەریی بابەتییانـەی هێزەکانی مرۆڤ و خودە، بۆیە پەنا دەبرێتە بەر یەککگرتنی ڕەوایـی و هێـزی خـودی لـەگـەڵ ڕۆح و هێـزی بابەتی و لێـرە بەدواوە گەلێک بەرهەمی گرنگی مێژوو، زانین و ئیرادە لە کاروانی مرۆڤایەتیدا پەیدادەبێت کـە ئەوانیـش ئەفـسـانە، دین، فـەرهـەنگ، وەهـم و فـەنتـازیاکـان. لە سـەردەمـە سـەرەتاییـەکاندا ڕەوشی مـرۆڤ زیاتر ڕەوشـێکی ئەفسـانەیی و دینییـە، بەلام پاش ئەوەی کە زیاتر هێز و زانین پەیدا دەکات ڕەوشـەکە دەبێتە ڕەوشـێکی کۆمەڵایەتی و زانستی زیاتر. لە سەردەمە کۆنەکاندا و لە پەرستنی ئەفسـانەیی و دینیدا مرۆڤ ئەو وێنانـەی دەپەرست کـە تێکەڵاو بـوون لە وێنە و سـیـفـەتەکـانی خـۆی لەگـەڵ وێنە و سیفـەتەکانی سـروشت و ئەو هێزانەی کە ئەم پێیان نەدەوێرا. بۆیە تەمـاشـا دەکـەیت کـە خـوداوەندی پێک هێنا و لە تێکەڵاوێک لە وێنە و سـیـفـاتەکـانی خـۆی و وێنە و سیفاتەکانی کە ئەم دەرۆسـتیـان نەدەهات، یان دەسـتـی پێیا نەدەگەیشت و لێـیـان دەترسـا، بەلام لە سـەردەمـی پێـشکـەوتندا مـرۆڤ دروست وێنە و سـیـفـاتە ڕاسـتەوخـۆکانی خۆی دەپەرسـتی و توانیی ئەو سنوور و وێنانەی کـە جاران خۆی

لەوان بە کەمتر دەزانی لە خۆیدا بەرجەستە بکات و هەندێک جار تێشی دەپەڕاند، درۆکهایم زۆر ڕێک بۆی چووە کە دەڵێت:

مرۆڤ ئێستا ڕاستەوخۆ خۆی دەپەرستێ، سەرەڕای بەدیهاتنی ئەم هێزانە و ئەم کاریگەریی یەکگرتنانە تەماشا دەکەین کە مرۆڤ بە تەنها خۆی ناتوانێت هێزەکانی خۆی، سنوورەکانی خۆی، ڕاستییەکانی خۆی، مافەکانی و ڕەواییەکانی بەدەست بهێنێت و لە بەرامبەریشدا هێزەکانی دی هەر بەو جۆرە پێویستییان بە یەکگرتن بوو، جا ئەو هێزانە ئایا مرۆڤەکانی دیکەن؟ یان چینەکانی دیکەن، یان نەتەوەکانی دیکەن و بە تەنهایی ناتوانن ژیان بەسەربەرن و لە سەردەمی بەهێزبوونی هێزە کۆمەڵایەتی، ئابووری، فەرهەنگی و سیاسییەکاندا ڕەواییەکانی نابەسترێتەوە تەنها لە لایەنێک لەم لایەنانە، بەڵکو پێویستە بۆئەوەی بیرکردنەوە و هێز و ڕەوایی بگاتە ئەنجامی پێشکەوتوو مرۆڤانەی خۆی، ساتی چوارەم و سەردەمی چوارەم بێتە دی.

**سەردەمی چوارەم (ساتی چوارەم):**

ڕێکەوتنی نێوان «خود» و «بابەت» بە تەنها ناتوانێت لێکۆڵینەوەیەکی کاریگەر بێت لەم سەردەمەدا کە بە سەردەمی بەهێزی و ڕەوایی گەورەی نێوان خودەکانە، واتە گەلێک خودی بەهێز و خاوەن دەسەڵات پەیدابوون کە ئەوانی کاریگەریی خودی و بابەتییان لەسەر خۆیان و ئەوانی دیکە هەیە. جا یان ئەوەتا ئەو کاریگەرییە دەبێتە سڕینەوە و لەناوبردنی خودەکانی دیکە لە لایەن یەکێک لە هێزەکانەوە، هەروەکو چۆن بەردەوام هێزەکان و خودەکانی داگیرکەری کوردستان دانیان بە بوون و بە ڕەوایی کورد نەناوە و هەوڵی لەناوبردنیان داوە لە بەرامبەریشدا خودی کوردی و خەباتی چەکداری ئەو خودە دروشمی ڕووخانی دەسەڵاتە داگیرکەرەکانی بنیات ناوە واتە کاردانەوەی کوردیش لە ئاراستەی لەناوبردنی خودەکانی بەرامبەر بووە (ئەگەر بۆی کرابێت) یان چۆن (بە داخەوە) لایەن، هێز و خودەکانی نێو کوردستان هەوڵی لەناوبردنی یەکیان داوە، واتە سڕینەوەی بیر، هێز و ڕەوایی بەرامبەر، یان چۆن سوپای داگیرکەری عەرەبە ئیسلامییەکان دەیانویست بیر، دین و ڕەوایی میللەتانی دەروبەر لەناوبەرن و بیانکەن بە ئیسلام، واتە شتێکی جیاواز، سەربەخۆ و ڕەوا لە ئیسلام نەهێڵن یان چۆن کۆمۆنیزم دەیویست بە (دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا) چینەکەی

بەرامبەر و هێزەکەی و بیرەکەی و فەرهەنگەکەی نەهێڵێت و سەرەنجام ئەوەی فاشیزم دەیویست، سڕینەوەی نەژادی غەیری ئاری و، ئەمانە هەموویان دەتوانن نموونەی باش بن بۆئەوەی مرۆڤایەتی نەگاتە خاڵی چوارەم و سەردەمی (ڕێکەوتن) لە نێوان هێز و بیرو ڕەواییەکاندا ئەویش بە داخەوە بە لەناوبردنی بەرامبەر. لەو کاتەی مرۆڤایەتی پێی ناوەتە سەردەمی چوارەم و سەردەمی بوونی چەندەها هێز و بیروڕەوایی و خود، جارێکی دیکە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان ناتوانن کورد لەناوبەرن و کوردیش هیچی سەوز نەکرد لە دروشمی ڕووخانی دەسەڵاتەکان دەبوایە داوای ڕێکەوتنی لەگەڵ بەرامبەر بکردایە. جا یان ئەو ڕێکەوتنە بە پێی سەنگ و سووکی هێزەکانی لامەرکەزی دەبێت، ئۆتۆنۆمی دەبێت مافی فەرهەنگی فیدرالی یان جیابوونەوە دەبێت لە ڕاستیدا جیابوونەوە شێوەیەکە لە شێوەکانی ڕێکەوتن.. چونکە لێرەدا لەناوبردنی بەرامبەر باس ناکرێت.

سوپای داگیرکەری ئیسلامی، نەیتوانی هەموو ئاواتەکانی خۆی بێنێتە دی و بە تەواوی ئەو میللەت و نەتەوە غەیرە عەرەبانە لە چوارچێوەی (ئومەتی ئیسلامیدا) بتوێنێتەوە و سەرەڕای ئەوەی کە بە داگیرکردن، باج و خەراج و سەرانە بە زۆر نەتەوەکانی دیکەیان کرد بە ئیسلام، بەڵام جارێکی دیکە ئەو نەتەوانە ڕۆحی خودی و بابەتییان خستەوە ناو ئیسلام و بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەستکاریی ئیسلامیان کرد، هەروەکو کوردناس و ڕۆژهەڵاتناس فریدریک بارت دەڵێت:

گیانی نەتەوەکان توانی شیعەی دوانزە ئیمامیی ئێرانی لەناو ئیسلامدا بۆ فارسەکان بەرهەم بهێنێت، تەسەوف و عیرفان بۆ تەواوی ئارییەکان و ئەهلی هەق کاکەیی، ئێزدی، عەلەوی، شابەک بۆ کوردەکان بێنێتەدی و جارێکی دیکە ئەو نەتەوانە وێنە ڕاستییەکانی خۆیان بپەرستن و وێنە و سیفاتە سەپێنراوەکان ڕەت بکەنەوە، کۆمۆنیزم نەیتوانی «دیکتاتۆریی پۆرلیتاریا» بەردەوام بکات و سەرەنجام خۆیشی زەربەی کاریگەری بەرکەوت و بەرەو لاوازبوون و هەڵوەشانەوە کۆبوون هەنگاو دەنێت و خۆشبەختانە فاشیزم و نازیزم بەرەو لەناوچوون و دیسان جارێکی دیکە بیرەکان، هێزەکان، ڕەواییەکان، بوونەکان بە جیاوازی لە یەک مانەوە و بەردەوام بوون، ئێستا پاش ئەم هەموو لێکدانەوەیە، ئایا هێزە گەورەکانی کوردستان

دەتوانن یەکتری لەناوبەرن؟ دەتوانن هەریەکە بەزۆر خۆی بکاتە گشتی سەپێنراو؟ دەتوانن بیرەکانی دیکە، هێزەکانی دیکە، ڕاستییەکانی دیکە و ڕەواییەکانی ئەوانی تر نەهێڵن؟ بێگومان وەڵام نەخێرە و تەنها ڕێگای چارەنووسساز، سەلماندنی ئەوانی دیکە و کۆکردنەوەی «بەشەکان» بۆ پێکهێنانی ڕێکەوتن و پەیمانی کۆمەڵایەتی و ئاواکردنی گشتی کورد بوون.

سەرچاوە:

١- هیگل: العالم الشرقي. امام عبدالفتاح امام بیروت ١٩٨٤
٢- هیگل: اصول فلسفة الحق: ترجمة: د. امام عبدالفتاح امام بیروت ١٩٨٤
٣- القومیة مرج العصر ام خلاصة؟ مجموعة من الباحثن المختصین، ترجمة فالح عبدالجبار، بیروت ١٩٩٥

## پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی

پێکهێنانی دەوڵەت، پێش هەموو شتێک پێویستی بە پەیداکردنی پەیوەندی و دامەزراندنی بەهێز و هاوبەش هەیە، کە بتوانێت گشت بەشەکان و چین و توێژەکانی ئەو نەتەوەیە یان ئەو وڵاتە لە پەیوەندییەکی بەهێزو بەردەوامدا بەرجەستەبکات. هەر لەسەرەتای پەیدابوونی هۆشیاری و شارستانی لای مرۆڤ پێداویستیی پەیوەندی و هاوکاری بەئاشکرا دەرکەوتووە، بەجۆرێک کە زۆربەی سۆسیۆلۆجیاو بیروباوەڕە ئاینی و سیاسییەکان یەکێک لە پایە بەهێزەکانیان پیشاندان و سەلماندنی پەیوەندی و هاوکارییە بۆ بەدیهێنان و ئاواکردنی نیشتمان، وڵات و نەتەوە.

لە کۆمەڵی کوردەواریدا بەهۆی بڵاوبوونەوەی باوەڕی دینی لە سەردەمی زۆر کۆنەوە هەر لە میهرایی، زەردەشتی، جوولەکە، مەسیحی و مانی، هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی یەکبوون یان پەیوەندیی هەمیشە وەکو پێداویستییەکی زۆر گرنگ خۆی نواندووە. نەتەوەی کورد سەرەڕای داگیرکردن و چەوساندنەوەو دابەشکردنی وڵاتەکەی لەلایەن داگیرکەرانەوە، میللەتێکی خاوەن تواناو ئامادەیی بەرچاوە لە بوارەکانی دین، زانست و زانین، ئابووری و خۆبەختکردن و قوربانیدان و ئامادەیی سەربازی. دەوری ئیدارەو دەسەڵاتی کوردی، پارتەکان و ڕووناکبیران و پێشڕەوان ئەوەیە کە ئەم ئامادەیییانە بەرەوپێش بەرێت و بیان گۆڕێت بەپایەکانی دەسەڵات و دواییش بەرەو خودی دەسەڵات و قەوارەی دامەزراو و هاوبەشی کوردستان.

سەرەتای پەیدابوونی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستیی کوردی، بەهۆی بەهێزیی ڕابەرە دامەزرێنەرەکانی وەکو (بەدرخان، نەهری، پیران، ڕابەرانی ئاگری داخ، دێرسیم، سمکۆ، شێخ مەحموودی حەفید، قازی، بارزانی)و بێهێزی و نائامادەیی بەشەکانی دیکەی کۆمەڵی کوردەواری، ئەو ڕابەرانە، خودی خۆیان هێزو هێمای پەیوەندی و یەکێتی ناو کۆمەڵی کوردستان بوون و بوونی ئەوان و هێزو بەردەوامییان، گەرەنتییەکی بەهێزی پەیوەندی و هاوبەشی بوو لە کۆمەڵی کوردستاندا. قۆناغی

دووەمی بزووتنەوەی سیاسی و چەکدارانەی نیشتمانی کوردستان، کە قۆناغی نەمانی ئەو ڕابەرە بەهێزانە و دابەشبوونی شۆڕش و پارتەکانی کوردە بۆ ڕابەرایەتیی جیاوازو دەرکەوتنی چەند بەرنامەو پارتی جۆراوجۆر. لەم قۆناغەدا گشتی کوردی دابەش دەبێت، واتە پەیوەندی و هێزی دامەزرێنەرو بەردەوامی کوردی دابەش دەبێت، کە بێگومان ئەم ڕەوشە هەلومەرجێکی زۆر سروشتییە و هەموو نەتەوەکان و کۆمەڵەکانی جیهان هەر بەو شێوەیە بەرەو پێشکەوتن و ئازادی هەنگاویان ناوە، هەروەکو زانا و فەیلەسووفی سەدەی نۆزدەی فەرەنسا «ئێرنست ڕینان» دەڵێت: دابەشبوون مەرجی ئازادییە[1].

بەلام ئەوەی کە زۆر ناسروشتی و جێگای داخە ئەوەیە کە لەم قۆناغەدا کورد نەیتوانی، وەکو قۆناغی یەکەم، گشتێک ئاوابکات و پەیوەندی و دامەزراندنێکی دیکە بەرهەم بهێنێت، ئەویش بەهۆی ئەوە بوو کە هەر کام لە بەشەکان، پارتەکان، هێزەکان دەیانویست خۆیان ببن بەگشت، واتە لەڕێگای سەپاندنی خۆیان و بێدەنگ کردن و سەرکوتکردنی ئەوانی دیکەوە، ئەم قۆناغە کە تەواوی هەشتاکان و نەوەدەکان و تائێستای گرتۆتەوە بووە مایەی پەیدابوون و بەهێزبوونی شەڕەکانی ناوخۆ لە هەر سێ بەشی باکوورو ڕۆژهەلات و باشووری کوردستان لەنێوان پارت و بەشەکانی بزووتنەوەی کوردی، کە گەلێک هەل و زەمینەی گەورەی سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی و کۆمەلایەتییان لەکیسی کورد دا.

کۆمەڵی کوردستان بەچاولێکەری، فارس، تورک و عەرەب و وەکو ئەوان، دەیویست بەشێک یان هێزێک یان پارتێک بەزۆر بکاتە گشت و بەشەکانی دیکە بکاتە پاشکۆ، ڕابەران و سەرکردەکان ئەوەیان لەبیر نەبوو کە ئەم سەردەمە (سی ساڵی دوایی) سەردەمی سەپاندن نییە، ئەگەر سەریش بگرێت بەبەهای نەبوونی ئازادی و پێشکەوتن و ژیانێکی بەهرەمەند دەبێت و ئەگەریش قەوارەو دەوڵەتیش بەو جۆرە بێتەدی، هەروەکو دەوڵەتە سەپێنراوەکانی عیراق، ئێران، تورکیاو سووریا دەبێت، واتە دەوڵەتی سەپێنراو و دیکتاتۆری. کوردستان بەهۆی داگیرکردن و زیاتر لەبوونی داگیرکەرێک و دینێک و فەرهەنگێک بووەتە کۆمەڵێکی فرەو جۆراوجۆرو هیچ کامیش لەو بەشانە نەیانتوانیوەو ناتوانن ببنە گشت و لەجێگای بەشەکانی دیکە کاربکەن و

ولات و کۆمەڵ بەرەنگ و دەنگی خۆیان تاپۆ بکەن. باشترین ڕێگا کە ئێستا لەبەر دەستدایە ئەوەیە کە گشتی کوردی یان پەیوەندیی و دامەزراندنی کوردی لەڕێگای ڕێکەوتن و هاوبەشی و خوێندنەوەی بەشەکان، هێزەکان، ئامادەییەکان و پارتەکانەوە بێتە دی، واتە پەیداکردن و دروستکردنی گشتێکی دڵخواز و پەیوەندییەکی ئازادی نێوان بەشەکان لەسەر بناغەی ئەرک و مافەکانی هەموولایەک. ئێستا کاتی ئەوە بەسەرچووە کە بەشێک یان پارتێک بەزۆر خۆی بکات بەگشت و ئەوانی دیکە پەسەند نەکات یان بەجۆرێک پەسەندی بکات کە ببنە بەشی خزمەتکاری ئەو گشتە سەپێنراوە، چونکە لەڕاستیدا خۆیشی هەر بەشە. ئەم سەردەمە هیچ بەشێک ناتوانێت هەرگیز ببێتە گشت و تەنها ڕێگایەک بۆ پەیداکردنی گشت، کە هیچ کۆمەڵ و نەتەوەیەک ناتوانێت بەبێ ئەو گشتەو بەردەوامی خۆی زەمانەت بکات، تەنهالەڕێگەی ڕێککەوتن و پەیوەندیی نێوان بەشەکانەوە دێتەدی.

ئەم لێکۆڵینەوەیە پرۆژەیەکی سەرەتاییە بۆ دەرخستنی ئاسۆی پەیوەندی و دامەزراندنی پایە بەردەوامەکانی دەسەڵات و گشتی کوردی. ئەم دەسەڵاتە یان ئەم دەسەڵاتە هاوبەشانەی دامەزراندنی کوردی بەدیل نین بۆ پەرلەمان و حکومەتی کوردستان، بەڵکو تەواوکەری کارەکانیانن و بەبڕوای من هەوڵێکی بەدەربەستە بۆ دیسان پێکەوەبەستن و دامەزراندنی پەیوەندی و بناغەیەکی هاوبەشی کوردەواری هاوچەرخ و ئازاد و دیموکراتی.

هەرچەندە ئێستا لەناو کۆمەڵی کوردیدا، پارتەکان هێماو بەرجەستەکەری هێزو ئامادەییەکانی ناو کوردستانن، بەڵام ئامادەییەکانی کوردستان زۆر فراوانتر لە پارتەکان و ئەو ئامادەییانە سەرچاوەی هەموو هێزو دەسەڵاتێکی ناو کۆمەڵن. ئەگەر بەوردی تەماشای کۆمەڵی کوردستان بکەین، دەبینین کە ئامادەیی (ئابووری، دینی، زانستی و سەربازی) بەشی هەرە زۆری کۆمەڵی بەخۆوە خەریک کردووە و زۆربەی کۆمەڵی کوردستان لەو ڕێگایانەوە بوونی خۆیان و خزمەتی خۆیان بۆ کوردستان بەردەوام دەکەن و ئەو ئامادەییانەش لە پانتایی و زەمینەیەکی جەماوەریدا درێژە بەژیانی خۆیان دەدەن.

هێزەکانی خەباتی کورد گەلێک جار هەوڵی لەیەکتر نزیکبوونەوەیان داوە و

تائێستا چەند قەوارەو چوارچێوەیان بۆ ئەو ڕێکەوتن و پەیوەندییە سازداوە. بەدیهێنانی بەرەی کوردستانی، کۆنگرەی نەتەوەییی کوردستان و کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان دەتوانرێت وەکو هەوڵێک لەم ڕێگایەدا چاوی لێ بکرێت. وێڕای ئەوەی کە ئەم هەوڵانە دەبێت بە هەند بگیرێت و ڕێزی لێ بگیرێت، بەڵام دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ئەم هەوڵانە هەموویان هەوڵی سیاسی و حزبی بوون و لە سەرەوەی کۆمەڵ، دەیانەویست ئەو پەیوەندی و ڕێکەوتنە بەدی بهێنن، هەوڵدان بۆ دامەزراندنی بناغەیەکی بەهێزو بەردەوام کە گەورەترو فراوانترو جەماوەریتر بێت لەکاری حزبەکان، ئەو بناغەیە بتوانێت بۆ نەوەکانی دیکەو خەباتی ئایندە بمێنێتەوە. هەوڵەکانی ڕێکەوتن و پەیوەندی پێشوو تەنها وەکو هەوڵی (سیاسی؟) کە لەسەرەوە لەلایەن پارتەکانەوە بەدی هاتووە بۆ ڕێکەوتن و دروستکردنی ناوەندی بڕیاری سیاسی.

بەڵام هیچ هەوڵێک نەدراوە کە خەڵکی کوردستان بەتوانا و ئامادەییەکانیانەوە بەشداربن لە دامەزراندنی بناغەیەکی پتەو، هاوبەش و بەردەوام کە بتوانێت زەمینەیەک بۆ کارو خەباتی ئایندەو لە هەمان کاتیشدا بەشی زۆری خەڵکی کوردستان و ئامادەیی و بەرژەوەندییەکانیان بەشداربکات لە دامەزراندنی ئەو بناغەیەدا. کۆنگرەی پەیوەندی و دامەزراندنی کوردان سەرەڕای ئەو پارتانەی بەشدارن، دەتوانێت تواناو ئامادەییی کوردستان لە ڕێگەی نوێنەرو کەسانی شارەزاوە بەشداری بکات. تواناو ئامادەییی (دینی)، (ئابووری)، (فەرهەنگی)، (سەربازی) کە لە کوردستانداو لە زەمینەیەکی جەماوەریدا خەڵک بەسەر ئەو تواناو ئامادەییانەدا دابەش بوون، دەبێت لە ڕێگەی نوێنەرانی شارەزاو لەدروستکردنی بناغەی (پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی)و لە ڕێگای کۆمەڵەی دامەزرێنەرانەوە[٢] «الجمعية التأسيسية» بۆ ئایندەی کوردستان ئەو بناغەیە دابمەزرێن. نوێنەران و شارەزایانی دینی، ئابووری، فەرهەنگی و سەربازی و نوێنەرانی پارتە بەهێزو سەرەکییەکانی کورد و کەسایەتییە ناودارەکان، ڕووناکبیران دەتوانن کۆمەڵەی دامەزرێنەرانی کوردو یەکەمین بناغەی هاوبەشی و دامەزراوی کورد، بەدی بهێنن.

بەم شێوەیە دێینە سەر باسی تواناکان و ئامادەییەکانی ناو کوردستان و

چۆنییەتی هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئەو تواناو ئامادەییانە بەرەو پایەکانی پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی.

١- **توانا و ئامادەیی دینی:** یەکێک لە سەرچاوەکانی بوون و مانەوەی کورد وەکو نەتەوەیەکی سەربەخۆ، تواناو ئامادەیی دینییە، پەیامی دینیی کورد، هەر لە پەرستنی میهر (ڕووناکی و زانایی)، تا دینی زەردەشتی و تاپەیدابوونی ئیسلام و پاشان سەرهەڵدانی ئاینەکانی ئەهلی حەق، ئێزدی، عەلەوی و تەسەوفی کوردی و پەرەسەندنی ڕێبازەکانی تەسەوف لەلای کورد دەتوانێت دوو هۆی گرنگمان بۆ پەیدابکات، یەکەم، لە کوردستاندا میللەتێکی خاوەن پەیام و بیروباوەڕی دینی و شارستانی هەمیشە هەبووەو، دووەم: ئەو نەتەوەیە هەرچەندە بەزۆر کراوەتە ئیسلام و دینی نەژادی و نەتەوەییی خۆی لێ زەوت کراوە، بەڵام هەمیشەو بەردەوام لەڕێگای ئەو ئاینانەوە کە ناوم هێنان لەهەوڵی ئەوەدا بوون کە ناوەڕۆکی دینی (مرۆڤی خودایی)[٣] یان (ئاینی یەزدانی)[٤] کە هەمان پەیامی میهر و زەردەشتە، لە بەرگی ناچاری و زۆرجاریش لە بەرگی ئیسلامدا (نموونەی تەسەوف) بەردەوام بکات.

ئەگەر کۆنگرەی پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی بخوازێت، دەتوانێت ئەم ئاینانەو کەسانی شارەزایان لە کۆمەڵی دامەزرێنەراندا بەشداری پێ بکات و ئەم تواناو ئامادەییە بکرێتە سەرچاوەیەکی بەهێزو پیرۆزی کوردان. کۆبوونەوەی ڕابەران و شارەزایانی دینی دەبێتە هۆیەک بۆ لێک نزیک بوونەوەیان و پێکهێنانی هێزێکی پتەوی دینی و نەتەوەیی و باڵاکردنی ئەو ناوەڕۆکە دینییە و ڕێگەگرتن لەهەموو ئەو هەوڵانەی لەلایەن داگیرکەرانەوە بەناوی دینەوە دەکرێتە سەر ناوەڕۆکی دین و کێشەی ڕەوای نەتەوەی کورد.

یەکێک لەو نەتەوانەی کە توانیویەتی ڕەوشی دینی، نەژادی و تایبەتی خۆی بپارێزێت، بێگومان کوردە. کورد لەڕێگای ئاینەکانی ئەهلی حەق، (کاکەیی)، ئێزدی، عەلەوی، شابەک و درووز، توانیویەتی ناوەڕۆکی پەرستنی میهرو زەردەشت بپارێزێت، هەرچەندە ئەو کارە لە دەربڕین و بەرگی جیاواز لەو زەردەشتی بوونەش بێت. هەروەها کاتێک کە کورد ئیسلام بووەو هەر بەو شێوەیە هەوڵی داوە کە شێوەی

پەرستنی هەر هەمان ناوەرۆکی زەردەشتی بێت، ئەگەرچی ڕواڵەت و دۆگما ئیسلامییەکانیشی قبووڵ کردبێت، تەسەوفی کوردی یەکێکە لەو هەوڵانەی کە دەیەوێت ناوەرۆکی دینی کوردی (مرۆڤی- خودایی) لەبەرگی ئیسلامدا بەردەوام بکات. باشترین ڕێگا: یەکەم: کۆکردنەوەو ڕێکخستنی تواناو ئامادەیی و دینیی کوردی بۆ خزمەتی پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی، دووەم، زیندوو هێشتنەوەی ناوەڕۆک و ناسنامەی دینی کوردی، ئەوەیە کە شارەزایان، ڕابەران و ڕووناکبیرانی ئاینەکانی کوردستان بەشێک بن لە کۆمەڵەی دامەزرێنەرانی کوردستان و ئەوانیش بەپێی بناغەی ئەرک و ماف، دەوریان هەبێت لە دامەزراندنی کوردیدا.

**٢- تواناو ئامادەیی ئابووری:**

یەکێکی دیکە لە هێزە کاریگەرەکان لەسەر خەباتی ئایندەی کوردستان بوون و توانای ئامادەیی ئابووریی و خەباتی ئابوورییە. دەبێت سەبارەت بەڕەوشی ئابووریی کوردستان شارەزابین و بزانین لەم زەمینەدا چیمان پێ ئەکرێت؟ کوردستان وڵاتە هەرە ئاوەدانەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوینە، زۆربەی سەرچاوەکانی ئاو، نەوت، خاکی بەپیت و کەش و ئاو و هەوای جیاواز و گونجاو بۆ ژیانی کشتوکاڵی و کانزاکان لە ئامادەیی ئابووریی کوردستان بەجۆرێکە کە وڵاتێکی دەوڵەمەندە لەهۆیەکانی ژیان، چ بە پێودانگی ڕابردوو یان بەپێوەری ئایندە. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە بەردەوام دەوروبەری کوردستان چاو ببڕنە خێرو بێری وڵاتەکەمان و داگیری بکەن و تاڵانکردنی کوردستان بکەنە بەشێک لەئابووری و ژیان و داهاتی خۆیان، هەر ئەم هۆیەش بووەتە ئەوەی کە هەرگیز کورد بیر لە داگیرکردنی دەوروبەری نەکاتەوە، چونکە لەباری گوزەران و ژیانەوە پێویستی بەسەرچاوەکانی ئەوان نەبووە کە دیارە نەشیان بووە. بەکورتی کوردستان بەردەوام هەموو هۆیەکانی ژیانی ئابووریی تێدا دەست کەوتووە. دوژمنانی کورد دەرکیان بەوەوە کردووە کە بۆ هێشتنەوەی دەسەڵاتی داگیرکەری خۆیان ، دەبێت ئابووریی کوردستان تووشی نەزیف بکەن و کورد نەبێتە خاوەن کەسایەتیی ئابووری سەربەخۆی خۆی. بەڵام سەرەڕای بارودۆخی تاڵان و داگیرکردنی کوردستان، کورد بەردەوام هەوڵی ئابووری داوەو سەرباری ڕەوشی نائارامی و پشێویی، ژیان لە کوردستاندا بەنیسبەت

دراوسێکانەوە باری ئابووریی گونجاوی هەبووە.

کۆنگرەی دامەزرێنەری کوردستان دەبێت توانا و ئامادەیی ئابووری لەبەرچاو بگرێت و هەوڵ بدات کە چوارچێوەو رێکخراوی ئابووری لە خزمەتی کوردا بهێنێتە بوون. لە بەندەکانی پەیمانی نیشتمانیدا خەباتی ئابووری وەکو یەکێکی دیکە لە خەباتەکانی نەتەوەیی کورد بناسێنێت و بتوانێت ئەو هێزە بکاتە دەسەڵاتێکی نیشتمانی و ئاراستەکراوی خەباتی کوردان. تواناو دەسەڵاتی ئابووری وادەکات بەردەوام هەوڵ و دەسەڵاتەکانی سەر بەشۆڕشی کوردستان لەدوژمنان و هێزەکانی دیکەی ناوچەکە سەربەخۆ بێت و هەمیشە کاریگەریی خۆی لەسەر پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی بەجێ بهێڵێت.

بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد، ڕەوشێکی سەرەکی بەخۆوە بینیوە، ئەویش ئەوەیە کە تەنها بزووتنەوەیەکی سیاسی و چەکدارانەی بووەو هەمیشە لەو مەیدانەدا جەنگاوە ئەگەر ئەوەش بزانین کەداگیرکەران هەم لەو مەیدانەدا لە کورد بەهێزتر بوون و دیسانیش توانیویانە بەهەموو ڕێگایەک سەرکوتی ئەو چالاکییە سیاسی و چەکدارییە بکەن و جگەلەوەش کە ئەو بزووتنەوەیە تەنها لە لادێکان و چیاکاندا ماوەتەوە نەیتوانیوە بەرەو شارەکان بچێت و بەتایبەتی ئەو شارانەی کە گرنگیی ئابووریی بەرچاویان هەیە، وەکو کەرکووک، خانەقین، کرماشان و ناوچەکانی سەر دەریای ناوەڕاست. کورد دەتوانێت لە ڕێگای ئابووری و خەباتی ئابووری ئاراستەکراوەوە دیسان بچێتەوە ئەو ناوچە گرنگانەو لەو ڕێگایەوە بوون و هێزی خۆی لەو ناوچانەدا سازبداتەوە. دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە کورد دەتوانێت لەڕێگای یاسای خودی ئەو وڵاتانەوە خەباتی ئابووری و بوونی ئابووریی خۆی لەو ناوچە گرنگانەش بەرێتە پێشەوە، بەبێ ئەوەی تووشی هیچ جۆرە ڕەوشێکی نائارام و سەربازی ببێت. واتە دەبێت خەباتی ئابووری ئەو مەنتیقەمان فێربکات، کە ئەوەی بە چەکدارانی و سیاسی بۆمان نەسەندراوەتەوە، دەتوانین بەخەباتی ئابووری بەدەستی بهێنینەوەو بەشێوەی «التسلل التدريجي المستمر» دزەکردنی شێنەیی و بەردەوام خەباتی ئابووری بەرینە پێشەوە.

هاوکاری و هاوبەشیی نوێنەران و هێزەکانی ئامادەیی ئابووریی کوردی لەگەڵ

نوێنەران و شارەزایانی دەسەڵاتەکانی دینی، فەرهەنگی و سەربازی ڕێگایەکی دیکەیە بۆ پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی.

**٣- تواناو ئامادەیی فەرهەنگی:**

سەرچاوەکانی کوردبوون مێژووی کوردە، فەرهەنگی کورد و زانیاری کوردە، پەیامی مێژوویی و مرۆڤایەتی کوردە. یەکێک لەو نەتەوانەی کە هەمیشە خاوەنی پەیامی فەرهەنگی و زانستی بووە، نەژادی ئاری بوون و بێگومان کوردیش کۆنترین میللەتی ئارییاییـیە و لە کۆنەوە پەیامی بیری باش، وتەی باش و کردەوەی باشی هەبووە کە هەمان پەیامی میهرو زەردەشتە.

زمانی کوردییش وێڕای هەوڵی داگیرکەران بۆ تەسک کردنەوەی سنوورەکانی بەڵام هەمیشە ئەو سنوورانەی بڕیوەو هەوڵی داوە کە بەردەوام یەکێک بێت لە سەرچاوەکانی کوردبوون. ئەگەر تەماشای زمانی کوردی بکەین بۆمان دەرئەکەوێت نەک لەژێر باری چەوسانەوەی تورکی و عەرەبیدا تایبەتمەندییەکانی خۆی لەدەست نەداوەو تەسلیمی ئەو زمانانە نەبووە، لەوەش گرنگتر ئەوەیە سەربەخۆیی خۆی لە زمانی فارسییش پاراستووە، هەرچەندە فارسی لەگەڵ کوردیدا خاوەنی هەمان مێژوو، فەرهەنگ و ڕووناکبیری بووە. زمانی کوردی لە هەر سێ زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی زیاتر توانیویەتی پاراوی و سەربەخۆیی بپارێزێت.

هەوڵدان بۆ دانانی بناغەیەک بۆ کاری هاوبەش و گەشەپێدان و باڵاکردنی وتارو پەیامی نەتەوەیی و نیشتمانیی کوردی لە هەموو بوارەکانی فەرهەنگ، مێژوو، دین و ڕووناکبیرییەوە ئامادەبوونی نوێنەران و شارەزایانی ئەم زانستانەیە لە کۆنگرەی دامەزرێنەرانی کوردی، دەرگایەکی باش دەکاتەوە بۆ پەیوەستبوونی ڕووناکبیران و شارەزایان کە لە پانتاییەکی زیاتردا، خەبات و شۆڕشی کوردان دەوڵەمەند دەکەن.

هەوڵدان بۆ ناساندن و کۆکردنەوەی ڕەمزەکانی فەرهەنگی کوردی و تەکنۆکراتی کوردی لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات و پێشڕەوی کردنیان بەئاراستەی پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی و پێکهێنانی کۆنگرەی کوردی لەگەڵ ڕابەران و نوێنەرانی دەسەڵاتەکانی دینی و ئابووری و سەربازیدا.

**٤- سەرچاوەی چوارەمی بوونی کورد و مانەوەی گیانی بەرگری و خۆبەختکردن و ئامادەیی سەربازییە، بەدژی داگیرکەران:**

نەتەوەی کورد لە ئاستێکی بالا و زەمینەیەکی فراوانی جەماوەریدا، خەباتی قارەمانانەو فیداکاری بەدژی چەوسانەوە، دابەشکردن بەردەوام کردووە. کەم ماڵ و بنەماڵە هەیە کە لەم مەیدانەدا بەشدارییان لە خەباتی کوردا نەکردبێت و زۆربەی خێزانەکان شەهیدێک یان زیاتریان بۆ ڕزگاریی ولات پێشکەش کردووە.

پرسی سەربازیی کورد لەوەدایە کە هەرچەندە مەیدانێکە بۆ بەرەنگاری، بەلام بەڕاستی مەیدانی گرنگی بوون و پەیوەندی و دامەزراندنی کوردانە. دەسەلاتی سیاسی، کۆنگرەی نەتەوەیی و ڕابەرانی کورد دەتوانن لەم زەمینەیەدا کاری گرنگ بکەن و مێژووی خەباتی پێشمەرگایەتیی کوردستان وەکو سەرچاوەیەکی دەولەمەندی کەلتووری کوردان بناسرێت و بیکاتە بناغەیەک بۆ پەندو ئامۆژگاری و لێکۆلینەوەی زانستی بۆ کاری ئایندەی کوردستان. پرسی کورد پێویستی بەپەرەپێدانی گیانی سەربازی هەیەو دەبێت هیچ گومانێکمان نەبێت کە ئێستاو داهاتووش پێویستمان بەهێزی سەربازی و ڕێکخراوەیی و سوپاو ئەرتەش دەبێت. دەبێت لەم زەمینەیەداو بەیارمەتیی پسپۆرانی ئەو مەیدانە بۆ ڕێکخستنی کەناڵی سەربازی و فیداکاری کوردو کۆنگرەی سەربازی، نوێنەران و شارەزایان بەشداربن و ئەو توانا و ئامادەییە سەربازییە ڕێک بخەن.

نوێنەرانی ئەم مەیدانە لەگەل شارەزایان و نوێنەرانی تواناو ئامادەییەکانی کە باسم کردن دەبنە بەردی بناغەی کۆنگرەی دامەزرێنەری کوردستان.

کۆنگرەی پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی، وێڕای ئەوەی کە ئامادەییەکانی (دینی، ئابووری، فەرهەنگی، سەربازی) کوردستان لەگەل کەسایەتییە ناودارەکان، نوێنەران و شارەزایانی بواری یاسایی و ڕووناکبیرە ناسراوەکان کۆ دەکاتەوە. دەتوانێت پرۆژەی دەستوور یان یاسای بنەڕەتی ساغ بکاتەوە و بیخاتە بەردەم ڕیفراندۆمی جەماوەری. لەکاتی سەرکەوتنی ئەم پرۆژەی پەیوەندی و دامەزراندنە، دەوری پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان چی لێ دێت. یەکەم ئەگەر حزب و ڕێکخراوەکان لەم زەمینەیەدا، واتە زەمینەی یەکبوون و دامەزراندنی کوردی،

بەتێگەیشتنی باشـەوە کـاربکەن، دەتوانن گـەلێک سـوود بەو پـەیوەندییـە بگـەیەنن. دووەم، سـەبارەت بـەئیدارەو حکوومـەت هـەر کام لە پارتـەکـان لە هـەڵبـژاردندا دەنگی زۆرتریان بەدەست هێنا، بەڕێوەبردن و حکوومەت بەدەستەوە دەگرن.

بەڵام دامـەزراندن و پەیوەندی کوردی لەوە گـرنگترو چارەنووسسـازترە، ئەمـەیان پەیوەندیی بە پایە گرنگ و هاوبەشـەکانی قەوارەی کوردەوە هەیە و سەرەنجام دەبێتە سەرچاوەی بڕیاری «مرجعیة القرار» کوردی، لە کاتێکدا حزب و حکوومەت ئۆرگانی راپەڕێنەرن.

## پەیوەندیی نێوان (ناسنامە)و (دامەزراندن)

ناسنامـە بەمانای "چی بوون"و لە نیازی سروشتیی مـرۆڤ بەمـەبەستی ناسـاندن و جیـاکردنەوەی خـۆی لەوانی دی، سـەرچاوەی گـرتووە. هەسـتی نەتـەوەیی بوون، یان سـەر بە شـتـێک بوون لە بونـیـادی خـودی مـرۆڤـەوە پەیدا دەبێت و وەکـو یەکـێک لە پێداویستییە گرنگەکانی خۆی دەنوێنێت. یەکەمین هەنگاوی پەیداکردنی ناسنامە وا دەکـات کـە مرۆڤ بکەوێتـە هـەوڵدان بۆ پەیداکـردنـی زانیـاری و شـارەزایـی لەبارەی (چیبوون ؟)ی خۆی، خێزانەکەی، خێڵەکەی، شارەکەی و نەتەوەو وڵاتەکەی، بۆ ئەم مەبەستە ئاگایی و هۆشیاری، وەکو پێویستی و نیازێکی گرنگ دەرئەکەون. ئاگایی و هۆشیـار کۆمەڵایـەتی وەکو دیاردەیەکی گرنگی نـەتەوەکان دەبنە یەکێک لە پێکهێنەرە گرنگەکان. بۆ نموونە هۆشـیاری و ئاگـاییی میللەتی کورد سـەرەڕای ڕەوشـی داگیرو پارچە پـارچە کـردن، ئەوەیە کـە بەهـەر نرخـێک بێت کـورد بەکـوردی مـایەوەو وەکـو ئەوانی دیکەی لێ نەهات و نەبوو بە تورک، فارس و عەرەب.

بەشـێک لە بیـریاران و ڕووناکـبـیرانی زانسـتـەکـان چەند توخـمێکی تایبـەتی بە پێکهێنەرەکـانـی ناسنامە، دادەنێن، جوگرافیاناسـەکـان (خـاکی هاوبەش) و مێژووی هـاوبەش بەسەرچاوەی ناسنامـە دادەنێن. زانستی کۆمـەڵایەتی زمانی هـاوبەش، دینی هاوبەش دەکەنە سـەرچاوە بـۆ ناسنامـەو پاشـان زانسـتی سیـاسـی پشت بەبونیـادی سیـاسیی هـاوبەش، گەل، کۆمـەڵی مەدەنی و پەیوەندی و دامەزراندن و هـاوولاتیبوون دەبەستێت بۆ ناساندنی ناسنامەی نەتەوەیی یان نیشتمانی.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لەهەموو ئەمانەو کۆبوونەوەی دەسەڵاتەکانی ناو کۆمەڵ و هەوڵدان بۆ بەڕەسمی ناسینی ئەرک و مافەکان و سنووری دەسەڵاتی هەر یەکێک لە ئامادەیی و دەسەڵاتەکانی تری وەکو دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن، یاسادانان، (دادوەری)و دەسەڵاتی چوارەم، ڕای گشتی، لە دەستوورێکدا کە لەلایەن ڕیفراندۆمی گشتیی ئەو نەتەوەیە یان ئەو وڵاتە دەنگی بۆ درابێت، دەبێتە باشترین بەرجەستەکەری ناسنامەی نیشتمانی و باشترین پەیوەندی و دامەزراندنی لێ پەیدا دەبێت و کۆمەڵی مەدەنی و دیموکراسیش لە ئەنجامی کار و هەڵوێستی هاوپەیوەندی و کاریگەریی ئەو هێزانەوە خۆی دەنەخشێنێت.

دەبێت ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە ناسنامە دیاردەیەکی پێکهاتووە لە هەموو ئەم توخمانەو چەند توخمێکی دیکەی وەکو، فەرهەنگی هاوبەش، ئەدەب و هونەر و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی.

مۆدێرنیزم، یەکێکی دیکەیە لەو توخمانەی کە لەم زەمینەیەدا هاوبەشی دەکات و دەتوانێت هۆکارێکی زۆر باش بۆ گەشەپێدان و بەردەوامبوونی ئەو ناسنامەیە بکات. مۆدێرنیزم دەتوانێت بە هێنانی چەمکی نوێی و نوێتر کە هۆکاری بەردەوامی و گەشەی ئەو ناسنامەیە کۆمەکی باش بکات. زاناو کۆمەڵناسی فەرەنسی، ئالان تۆرین[٥] سێ توخم دادەنێت بۆ پەیدابوونی قەوارەیەکی دیاریکراو و، گەشەو بەردەوامی، ئەوانیش دەسەڵاتی عەقڵ، کە سیستەمی نوێنەرایەتییە بۆ هەموو دەسەڵاتەکانی یاسادانان، بەڕێوەبردن و دادوەری. دەسەڵاتی فەرهەنگ، کە باشترین چوارچێوە بۆی سیستەم و فەرهەنگی هاووڵاتیبوونە لەسەر بناغەی ئەرک و مافەکان و سێیەم دەسەڵاتی ئازادییە، کە توانیویەتی مافەکانی مرۆڤ و مافی تاکەکان بەدی بهێنێت. ناسنامەیەک کە بەم شێوەیە پێک بێت و گەشە و بەردەوام بێت و دەتوانێت، گشتی خوازراو یان پەیوەندیی نێوان بەشەکان یان هەمووان لە پەیوەندی و دامەزراندندا بەرجەستە بکات.

بێگومان باشترین بەرجەستەبوونی ناسنامەی هەر نەتەوەیەک کاتێک دەبێت کە لە مەودای دەسەڵاتی جوگرافیای سیاسیدا، ئاشکرابێت. ئەمیش بەدەوری خۆی کاریگەرییەکی زۆر گەورە و چارەنووسسازی دەبێت لەسەر چۆنییەتی پەیدابوون و

بەردەوامبوونی هەلومەرجی مانەوە و هەستی چیبوون و پەیوەندی بوون بۆ ئەو چوارچێوە جوگرافی و فەرهەنگی و مرۆڤایەتییە. بەم شێوەیە کاتێک وڵاتێک یان نەتەوەیەک، سەرەڕای ئەوەش کە وەکو ئەوانی دیکەی دەوروبەری نییە، دەکرێت بڵێین زیندووەو سەربەخۆیە کە کەسایەتیی نەتەوەییی سەربەخۆی هەیە لە هەموو ئەو زەمینانەی کە باسمان کردن. کەسایەتی و ناسنامەی هەر نەتەوەیەک کاتێک مانای کردەیی و ڕەسمی پەیدا دەکات یان دەڵێین دەکەوێتە بارێکی کارپێکراوەوە کە چۆنییەتی کارکردنی ئەو دیاردە پێکهێنەرانەی کە باسمان کردن، لە ئاستێکی ڕەسمی و میللیدا کاری خۆیان بکەن[٦]

## "یەکبوون و دامەزراندن"و "ناسنامەی" دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان[٧]

بەپێویستی دەزانم بۆ زیاتر تێگەیشتن لە دامەزراندنی بناغەی جێگیری دەوڵەت و خستنەڕووی ناسنامەی نەتەوەییی؟ ئەو دەوڵەتانە، سەرنجێک لەڕەوشی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان لەم زەمینەیەدا بدەین و لەوە تێ بگەین کە ئەو پایانە چین کە ئەو دەوڵەتانەی لەسەر دامەزراوە؟ تا چ ڕادەیەک ئەو پایانە توانیویانە یەکێتی و دامەزراندنی ئەو قەوارانە بپارێزێت؟ نەتەوەی کوردی دابەشکراو بەسەر ئەو دەوڵەتانەدا و لە سایەی ئەو ناسنامە ئێرانی، عیراقی، تورکی و سوورییەدا لە چ مەینەتی و نەهامەتیدا ژیانی بردووەتە سەر و نەیتوانیوە ئەو هەلومەرجە سەپێنراوە ڕەت بکاتەوە، کە ڕێگای دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی لێ گرتووە!

**یەکبوون و دامەزراندنی ئێرانی و (هویت مللی ایرانی):**

بۆ ئەم مەبەستە ناگەڕێینەوە بۆ مێژووی زۆر کۆنی ئێران، بەڵکو تەنها باسی سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی (١٥٠١- ١٧٢٢)و بەدواوە دەکەین، پایەکانی دامەزراندنی ئێران لەو کاتەوە تائێستا هەر وەکو خۆی ماوە، سەرەڕای گۆڕانی دەسەڵات و دەستووریش.

× یەکەمین پایەی یەکبوون و دامەزراندنی ئێرانی بریتییە لە بە زۆر سەپاندنی یەکێتیی خاکی ئێران «تمامیت ارضی ایرانی»و «یکپارچگی» یان ئەوەی کە بیریاران

و تیۆرمەندانی ڕەواییدان بەیەکبوونی ئێرانی پێی دەڵێن (ایران، سرزمین آریایان)[8] بۆ مسۆگەرکردن و زامنکردنی یەکپارچەیی جوگرافی و مرۆڤیی ئێران بەهەنگاوی یەکەمی ناسنامەی سیاسی و ئێرانی دەزانن. بۆ ئەم مەبەستە زۆرێک لە پسپۆرانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئێران و بەتایبەتی فارسەکان، سەر بەهەر پەیڕەوێکی ئایدۆلۆژی و فیکری بن، ناتوانن یان نایانەوێت کە بەهیچ جۆرێک ئەم پایە گرنگەی دەوڵەت و دامەزراندنی ئێرانی بخەنە ژێر گومان و پرسیارەوە. بێگومان زۆر ئاشکرایە کە ئەم جوگرافیا بە زۆر سەپێنراوە بووەتە مایەی چ زوڵم و چەوسانەوەیەکی لە ڕادەبەدەری نەتەوەکانی غەیرە فارسی ئێرانی.

× سەپاندن و سەرداركردنی زمانی فارسی بەسەر زمانی نەتەوەکانی دیکەی ئێران، دەبێت ئەوەش بزانین کە فارس لە نیوەی دانیشتووانی ئێران کەمترن.

× دینی ئێرانی، واتە مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمام، هەر لە سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی، کرایە مەزهەبی ڕەسمیی ئێرانی، ئەگەر ئێرانییەکان، واتە دەسەڵاتدارانی ئێران ڕوویان نەکردایەتە مەزهەبی شیعە، ئەگەر شا ئیسماعیلی سەفەوی ئەو مەزهەبەی بەدینی ڕەسمیی ئێران ڕانەگەیەندایە، ئەوا ئێستا ئەمڕۆ ئەگەری وڵاتێک یان چوارچێوەیەکی سیاسیی سەربەخۆ بەناوی ئێران و بەم تایبەتمەندییانەی ئێستاوە بوونی نەدەبوو[9]

مەلاکانی شیعە و دەزگای دینی، بەدرێژایی چەند سەدەیەکی مێژووی ئێران، ڕۆڵ و نەخشی تایبەتی سیاسی و ئابووریيان هەبوو. خودی ئیمپراتۆریای ئێرانی لە سەرەتای سەدەی شانزدەوە لەسەر بنەمای مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمام، یان وەک ئیمپراتۆریایەکی مەزهەبی دامەزرا. ئەو تەشەیوعەی کە لێرەدا باس دەکرێت دیاردەیەکی ئیکونۆگرافیک (ICONOGRAPHIC)و پاڵپشتیکراو بە ڕۆڵی جیۆپۆلەتیک کە مانەوەی ئێران و یەکپارچەیی ئەو وڵاتەی زامن کردووە. مەزهەبی شیعە کاریگەرترین ئامرازی پێکەوە گرێدران و دامەزراندنی نەتەوەکانی ئێران و ئایدۆلۆژیای ئێرانی بووە، چونکە شیعە، لە ئێراندا ٩٠٪ی خەڵکی ئێران پێک دەهێنێت.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە دەزگای دینی و مەلاکانی شیعە توانایەکی

گەورەی ئابوورییان لەڕێگای مولّکداری و پەیوەندییان بەبازاڕەوە هەبووەو هەیە بەجۆرێک کە ئەم هێزە ئابوورییە دەسەلات و جێگایەکی گرنگی بەوان داوە کە بەدرێژاییی مێژووی کۆتاییی سەدەکانی و هاوچەرخی ئێرانی، بەردەوام هێزێکی سەربەخۆ و بەدەسەلات بوون لە دەرەوەی دەسەلاتی شا و حکوومەتی ئێرانی، ئەوەی کە دەسەلاتی دامەزراوەی دینیی ئێرانی وا لێ کردووە کە بە بەردەوامی دەسەلاتیان هەبێت، تا ئەو کاتەی کە بەتەواوی دەسەلاتیان گرتە دەست و کۆماری ئیسلامییان- لە راستیدا کۆماری شیعەیان- ڕاگەیاند، ئەوەیە کە بەشێکی زۆری دەسەلاتی دادوەری و پەروەردە و فێرکردنیان بەدەستەوە بوو، بۆ نموونە تاکۆتاییی دەیەی دووەمی سەدەی بیست پیاوانی دینی بە تەواوی هەموو کاروباری پەروەردە و فێرکردنیان بەدەستەوە بوو[١٠].

× سەرەڕای ئەمانەش فەرهەنگی ئێرانی، ئەدەب و هونەر، زمان و مێژوو دینی کۆنی ئێرانی، یەکێکی دیکە لە پایەکانی دەوڵەتی ئێرانی بەدرێژاییی مێژوو پێک دەهێنێت. بەڕاستی ئێرانییەکان هەقی خۆیانە شانازی بەم پایە گەورەیەی شارستانی بوون و فەرهەنگی بوونەوە بکەن. ئاشکرایە کە تەنها ئەم پایەیە کە نەتەوەکانی دیکەی نافارسی ئێرانی وەکو کورد، عەرەب، بلووچ و ئازەری سوودی شارستانییان لێ بینیوە، بەلام پایەکانی دیکەی بوون و مانەوەی دەوڵەتی ئێرانی بەردەوام بوومەتە مایەی مەینەتی و چەوسانەوەی ئەو نەتەوانە. لە سەردەمی پەرەسەندنی ناسیۆنالیزم و ڕابوونی ئەو نەتەوانەی کە ڕێگای پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆیان لێ گیراوە، ئێران یەکێک دەبێت لەو دەوڵەت و (دامەزراندنانەی) کە زەبری کوشندەو کاریگەریان بەردەکەوێت و ئەو پایانەی کە ئەو دەوڵەتەیان لەسەر دامەزراوە، سەرەڕای هێز و دەسەلاتیان سەردەمی ڕەوایی و پیرۆزییان بەسەردەچێت.

## دەوڵەتی میلیتاریستی تورک:

ڕاگەیاندن و دامەزراندنی دەوڵەتی تورک، بەناوی کۆماری تورکیا لەساڵی ١٩٢٣ لەسەر چەند پایەیەکی نەگۆڕو بەردەوام کە بەپرەنسیپەکانی ئەتاتورک ناسراون، دامەزراوە کەئەمانەن:

× سوپای تورکیا پاسەوان و سەرچاوەی سەرەکییە بۆ پاراستنی گەل و نیشتمان و هەر ئەویشە کە زامنی سەلامەتیی ناوەوەو دەرەوەی تورکیا دەکات. ئەم سوپایە لەگەڵ تێپەڕبوونی سەردەمەکاندا بووە بەدامەزراوەیەکی تایبەتی و خاوەن سەرکردایەتیی سەربەخۆ لە دەسەڵاتی حکوومەت و دەوڵەتی تورکیا. ئەگەر ئەو حکوومەت و دەسەڵاتانە لەڕێگای ڕاستی ئەتاتورکی لایان دابێت و پەیڕەوییان لەو پرەنسیپانە نەکردبێت، ئەوا ئەو سوپایە زۆر بەتوندی هاتووەتە ناو بازنەی دەسەڵاتەوەو چەندین کۆدێتای سەربازی، یان هەروەکو خۆیان دەڵێن «ڕاست کردنەوە» یان لە ساڵەکانی ١٩٦٠، ١٩٧١، ١٩٨٠ لەپێناوی مانەوەو بەردەوامبوونی پایەکانی ئەتاتورکی دەوڵەت ئەنجام داوە، دیارە ئەم ڕەوشە تایبەتمەندییەکی سەیرو سەرسووڕهێنەری تورکیایە و لە دەستووری هیچ وڵاتێکدا نابینرێت کە سوپا سەرچاوەی دەسەڵاتەکان بێت لە دەستوری هەرە زۆری وڵاتەکاندا سوپا پاسەوان و پارێزەری وڵاتەو هیچ نەخشێکی سیاسیی نییە[11].

* ڕژێمی کۆماری، ڕژێمی هەمیشەییی تورکیا دەبێت، واتە گەڕانەوە بۆ دەسەڵاتی سەڵتەنەت و خەلافەت، نابێت بەگوێرەی دەستوور پەیڕەویی لێ بکرێت.
* تورکیا تەنها لە نەتەوەی تورک پێک دێت و بەهۆی دەسەڵات و تایبەتمەندی خۆیەوە ڕاوەستاوە.

یەکێک لەو وتانەی کە بەردەوام بۆ سەپاندنی زمانی تورکی و هزری نەتەوەییی تورک بەسەر میلەتانی دیکەدا، ئەتاتورک دووپاتی دەکردەوە، ئەوەبوو کە چەند خۆشە مرۆڤ هەست بکات کە تورک بێت، پێش ئەوەی کە ئەتاتورک دەسەڵات پەیدا بکات و هەموو دەسەڵاتەکانی تورکیا بەدەستەوە بگرێت بۆ مەبەستی سەپاندنی زمانی تورکی و ڕێگەگرتن لەجیابوونەوەی نەتەوەکانی دیکەی ناو تورکیا، کورد، ئەرمەن،

عـــەرەب، یۆنـانـی و لاس، کـــۆنگرەیەکی لە ئەرزرۆم پێک هێنا لە٢٣ی تەمـــوزی ١٩١٩(١٢) لەلایەنگرانی خـۆی، کە پاشـان بـوون بەپارتی گـەلی کـۆمـاری و ڕایان گەیاند:

* هەموو زەوییەکانی ناو تورکیا یەکەیەکی تەواو پێک دێنن و بەهیچ جۆرێک شیاوی پارچە پارچە کردن نییە.
* هەمـوو ئەو کەمـە نەتەوانەی کە تورک نین و لە تورکـیـا دەژین نابێت هیچ مـاف و ئیـمـتـیـازێکیـان هەبێت و داواکـانیـان زیان بـە سـەروەریی تورکـیـاو قـەوارەی کۆمەلایەتیی بگەیەنی.
* تورکـیـا دەوڵەتێکی سکولارە (عـیلمـانی)و هەمـوو کـاروبارێکی دین، بـە تەواوی لە دەوڵەت جیاوازە.
* ڕژێمی کـۆمـاری عیلمـانی لەسـەر بناغـەی میللی بوون (POPULISTE) دامـەزراوە، واتە لەڕێگای نوێنەرایەتیی دیموکـراسی ئەوروپییـەوە، حـوکـمی گـەل بۆ گـەل و بەهۆی گەلەوە بنیات دەنرێت و هەمـوو هاوولاتییان لەبەردەم یاسادا یەکسـانن لە راسـتـیـدا ئەمـە تەنـهـا ئیـددیعـا و لاسـاییـکردنەوەی ڕواڵەتەکـانـی دیموکـراسی ڕۆژئاوایە و تۆزقاڵێک ڕاستیی تێدانییە.
* ڕژێمی ئابووریی تـورکیـا بریتـییـە لە سیسـتـەمی ئازادی چاودێریکراو کە ئەمـەش مـانای ئەوەیە دەوڵەت هـەقی هەیە، چاودێری و سـانسـۆری چالاکـیی ئابووری کەرتی تایبـەتـی بکات و لەکاتی پێویسـتـدا دەست بـخـاتە کارەکانەوە ئەگەر وای هەست کرد کە زیانبـەخـشـە بۆ بـەرژەوەندی گشـتـی و دەوڵەت، ئەمـەشـیـان تەنـها هەوڵدانێکە بۆ بەڕەسمی ناسین و پەردەپۆش کردنی سەرمایەداریی دەوڵەتی.

بەم جۆرە دەردەکەوێت کە هەمـوو پایەکانی دامـەزراندنی دەوڵەوتی تورکی لەڕێگای دەسـەلاتی سـەربازییـەوە سـەپێنراوەو دانیـشـتـووانی تورکیـا بەهەمـوو نەتەوەکـانەوە کـەمـتـرین بەشـدارییـان لەو زەمـینانـەدا نییـە. ڕێگەگـرتن لە مـافی چارەنووسی نەتەوەکـان، قەدەغـەکردنی زمـان و فـەرهـەنگی نەتەوەییـان نەخشـێنەری بنەمـاکـانی ئەتاتورکن. لەسـەر بناغـەو پایەی ئەو چەوسانەوەیە دەوڵەتـی تورکیا ناسنامەی خـۆی سەپاندووە.

## دەوڵەتی کەمایەتیی دەسەڵاتدار لە عیراق

کۆنگرەی قاهیرە لە ١٢ی ئازاری ١٩٢١ بەسەرۆکایەتیی ونستۆن چەرچل، وەزیری کۆلۆنی «مستعمرات» ئەو کاتەی بەریتانیا، بۆ دیاریکردنی پایە نەگۆڕ و بەردەوامەکانی دەوڵەتی ناسیۆنالیستیی عیراقی، بە سەرەنجامی هەوڵەکانی بەریتانیا دادەنرێت، بۆ بە زۆر دامەزراندن و داسەپاندنی ئەو دەوڵەتە بەسەر گەلانی عیراقدا، ناسیۆنالیزمی عەرەبی سوننە مەزهەبی عیراق کە دەسەڵاتی دەوڵەت و حکوومەتی پێ سپێردراوە، نەیدەتوانی لەڕێگای سەربەخۆیی و کۆکردنەوەی پایە هاوبەشەکانی عیراقەوە، پەیوەندی و دامەزراندنی وڵاتی عیراق بنیات بنێت. بۆچی ناسیۆنالیزمی سونەنی عیراق نەیدەتوانی دامەزراندنی خوازراو و گشتی بۆ عیراق بنیات بنێت، چونکە یەکەم عەرەبی سوننە لەعیراقدا کەمایەتین هەم لە کورد و هەم لە شیعەی عیراق کەمترن و لەڕاستیدا لە ١٥٪ی دانیشتووان پێک دەهێنن. دووەم، بەردەوام سوننە لە ناسنامەی فەرهەنگی بێ بەش بوون و هەمیشە پاشکۆیەکی گوێڕایەڵی دەسەڵاتە داگیرکەرو چەوسێنەرەکانی عیراق بوون. لەکاتێکدا کورد و عەرەبی شیعە ڕەوشێکی جیاوازیان هەبووەو بەردەوام خاوەنی ناسنامە و تایبەتمەندی میللی و فەرهەنگیی خۆیان بوون(١٣) هەر لەم کۆنگرەیەدا کۆنگرەی قاهیرە، پایە سەرەکی و نەگۆڕەکانی دەوڵەتی عیراق ئاشکرا کرا. تا ئێستا و بەدرێژاییی ئەو مێژووە، ئەم پایانە نەگۆڕاون و ئەو دەوڵەتە لەسەر ئەو پایانەو بەزۆر بەسەر گەلانی عیراقدا سەپێنراوە. پایە نەگۆڕەکانی دەوڵەتی عیراق ئەمانە بوون:

* پاشکۆیەتیی سیاسی.
* بەکارهێنانی ڕژێمێکی پڕ لە توندوتیژی و چەوسانەوە- دژی زۆربەی خەڵکی عیراق و لەلایەن کەمایەتی.
* پایەی نەگۆڕی ناسیۆنالیستی، ناسیۆنالیستی عەرەبی.
* بەزۆر بەمەزهەبی کردنی دەوڵەت، واتە دەسەڵات بۆ عەرەبە نەک بۆ کورد، بۆ سونەی عەرەبە نەک بۆ شیعەی عەرەب.
* لەشکری عیراق- بۆ پاڵپشتی و داسەپاندنی دەسەڵاتی کەمایەتی و ملکەچ کردنی

زۆربەی خەڵکی عیراق کورد و شیعەی عەرەب[١٤].

کاتێک لەساڵی ١٩٢٤ بەدواوە، بەریتانیا بەزەبری هێزی سوپاو لە تەموزی ئەو ساڵەدا باشووری کوردستانی بەعیراقەوە لکاند، ئەوا دەوڵەتی عیراقی سەرقاڵی کێشەیەکی دیکە کرد. بەدرێژایی مێژووی دەوڵەتی عیراق جۆری حوکم و ڕژێم لە بەغداد هەر چۆنێک بووبێت کێشەی نێوان کوردستان و دەوڵەتی عیراق، درێژەی هەبووەو هەروەها کێشەی نێوان زۆرایەتیی شیعەی ستەمدیدە و کەمایەتیی سونەی حوکمڕان، بەردەوام بووە. ئەم دوو کێشەیە لەهەر قۆناغێکدا شێوەو ڕواڵەتی نوێ و سەختیان بەخۆیانەوە گرتووە. ئەمەش وای کردوە کە ئەم دەوڵەتە ئەوپەڕی شەڕخوازی و دڕندەیی بەرامبەر بەشی هەرە زۆری خەڵکی وڵات بەکار بهێنێت و ئەمڕۆش لەهەر کاتێکی دیکە، دژوارتر و خوێناویتر مامەڵە دەکات و بەتەواوی ڕەوایی دەوڵەتی عیراق کەوتووەتە ژێر پرسیارەوە[١٥].

دەوڵەتی کۆماری عەرەبیی سووریاش، بەناوەکەیدا دیارە کە ئەو دەوڵەتە یەکەمین پایەی دامەزراندنی دەسەڵاتی ناسیۆنالیزمی عەرەبییە و پاشان زامنکردنی دەسەڵاتی تایەفەی شیعەی عەلەوی، کەکەمایەتیی ناو سووریا پێک دەهێنێ کە لە ١٣٪ی وڵاتن، حوکمی میلیتاری و سەپاندنی زمان و فەرهەنگی عەرەبی دژی کەمە نەتەوەکانی تر، لە پایە نەگۆڕو بەردەوامەکانی دەوڵەتی سوورین. تەنانەت ئەو کاتەش کە لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسادا بوو هەر بەو شێوەیە بوو یان بەڕوونتر بڵێین خودی دەسەڵاتی ئیمپریالیستیی فەرەنسا، ئەو پایانەی دامەزراند.

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت دامەزراندنی ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان داگیرو دابەش کردووە، گرنگترین پایەی دامەزراندنیان ستەم و چەوسانەوەیە، بەدڵنیاییەوە دیکتاتۆری و سەپاندن بۆ گرەنتیی مانەوە و بەردەوامبوونی پایەکانی دیکەی ئەو دەوڵەتانە بووە.

بەڵام پەیوەندی و دامەزراندنی کوردی وەکو باسمان کرد دەتوانێت لەسەر ئەو پایە گرنگ و هاوبەشانە دوور بێت لە دەسەڵاتی دیکتاتۆری، چونکە ئەو پایانە سەرەڕای ئەوەی کە بەشی هەرە زۆری خەڵکی کوردستان تیایدا بەشدارن هەر بەو ڕادەیەش دەتوانێت تواناکانی کوردی دەربخات و هێزو چالاکیی زیاتریش بدات بە مرۆڤی

کوردو دەسەڵاتی کوردی و کۆتایی بەو ئەفسانە درێژ ماوەیە بهێنێت کە دەڵێت: کوردەکان هەرگیز نەیان توانیوە ناسنامەیەکی ڕەسمیی سیاسی بەدەست بهێنن، ئەگەرچی بەدرێژایی چەندین ساڵ هەوڵی سەرنەکەوتوویان لەم زەمینەیەدا بەگەڕخستووە[١٦].

پەراوێزەکان

* یەکەم جار کە ئەم وتارەم نووسی، ساڵی ١٩٩٨ ناوم نا(یەکبوون و دامەزراندنی کوردی) کە بەدوو هۆکار بەو ناوە نووسیم، یەکەم، وەکو چاولێکەرییەک بۆ یەکبوون و دامەزراندنی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان و دووەم لەبەرئەوەی تا ئەوکاتە خۆم لەژێر کاریگەریی میتافیزیکیی چەمکی «یەکێتی» و یەکبوون ڕزگارم نەبووبوو، کە بێگومان ئەو چەمکە میتافیزیکییە هەر لە سەردەمی ئەفلاتون و لەسەر دەستی ئەو هەتا ساڵانی ١٩٧٠و دواتریشی خایاندو تەواوی بیرو فەلسەفەی ڕۆژئاواو جیهانی بەهەموو ڕێبازەکانییەوە وێڵی دوای ئەو یەکێتی و یەکبوونە میتافیزیکییە بوون. خوێندنەوەکانی ساڵانی دواییم، واتە ساڵی ٢٠٠٠ هەتا ئێستا بەشێنەیی منی لەهەژموونی ئەو چەمکە ڕزگارکرد و سەرەنجام لەدوای خوێندنەوەم بۆ بابەتەکانی، هابرماس، دریداو ئالان تۆرینەوە تێ گەیشتم کە لەجیاتی یەکێتی و یەکبوون، پەیوەندی و کۆدەنگی بەکاربهێنم، ئەگەرچی جیاوازییش لەو پەیوەندی و کۆدەنگییەدا هەبێت.

١- تزفتیان تودو روف، نحن والاخرون، ترجمة د. ربي محمود ، دار المدي , ١٩٩٨

٢- کۆمەڵەی دامەزرێنەران، لەعەرەبیدا دەبێتە (الجمعية التاسيسة) لە عیراقدا لەدوای ساڵی ١٩٢١و بەفەرمانی مەلیک فەیسەڵ لەکۆبوونەوەی شارەزایان، کەسایەتییەکان، سەرانی هۆزەکان، دەرەجەدارانی سەربازی پێک هات، لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر یەکەمین کاری بەڵشەفییەکان پێکهێنانی کۆمەڵەی دامەزرێنەران بوو بۆ دانانی دەستور.

لەدوای شۆڕشی ئیسلامی و پاش چەند مانگێک هەڵبژاردن لە شارەکان دەستی پێ کرد بۆ ئەندامێتیی کۆمەڵەی دامەزرێنەران یان ئەوەی بەفارسی ناویان ناوە (مجلس خبرگان)و لەکوردستان شەهید قاسملوو بەزۆریی دەنگ بۆ ئەو مەجلیسە هەڵبژێردرا.

٣- مرۆڤی خودایی ئەو زاراوەیەیە کە د. پیروز مجتهد زادە بۆناوەرۆکی دینی ئاریایی (ئێرانی) بەکاری هێناوە کە هەمان پەیامی میهرو زەردەشتە، کەباسیان لەوە کردووە مرۆڤ خواییە و دەتوانێت بەشێک لە سیفەکانی خودا (دانایی، ڕاستگۆیی، بەهێزی) لەخۆیدا پەیدابکات.

بڕوانە: د.پیروز مجتهد زادە، هويت ايرانى در استانە سدەى بيست و يكم، مجلەى اطلاعات سياسى- اقتصادى، شمارە ١٢٩- , ١٣٠

٤- ئاینی یەزدانی، هەر هەمان مانای مرۆڤی خودایی دەدات و هێمایە بۆ وەسفکردنی پەیام و دینی کوردی. ئەم زاراوەیە لەلایەن میهردادی ئێزەدی بەکارهاتووە. بڕوانە:

ئاین و تایەفە یەزدانییەکانی لەناو کوردستان، میهردادی ئیزەدی، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٢٧ ساڵی ١٩٩٨.
٥- الان تورین، ماهي الديمقراطية، ترجمة، حسن قبسي، دار الساقي ١٩٩٥
٦- د.پیروز مجتهد زاده، هويت ايراني در استانه سده بيست ويكم، مجله اطلاعات سياسي- اقتصادي، شماره ١٢٩- ١٣٠
٧- لێرەدا بەپێویستم زانی هەمان دەربڕینی خودی ئەو دەوڵەتانە بەکاربهێنم و هەمان ڕوانگەی ئەوان بۆ دامەزراندنی قەوارەی خۆیان، بخەمە ڕوو:
٨- بەکارهێنانی ئەم زاراوە و دەربڕینانە هی خودی ئەو تیۆرمەند و بیریارە ئێرانییانە و مەرج نییە بڕوای منیش وەکو ئەوان بێت بڕوانە د. پیروز مجتهد زاده، هەمان سەرچاوە.
٩- د.پیروز مجتهد زاده، هەمان سەرچاوە.
١٠- بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بارەیەوە بڕوانە.
د. كمال مظهر، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، بغداد ١٩٨٥، ل ١٨٣- ١٨٦
د. رفیق سابیر، ئیمپراتۆریای لم، چاپی سوید، ١٩٩٨، ل١١٠- ١١٤
١١- بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە ئەم سەرچاوانە:
د.رەفیق سابیر، ئیمپراتۆریای لم، چاپی سوید، ١٩٩٨ ل٨٢
- اتاتورک وخلفاءه ل٢٥٣
د.جرجيس حسن، تركيا في الستراتيجية الامركية بعد سقوط شاة.
١٢- اتاتورک وخلفاءه ل١١١
١٣- جرجيس فتح الله، آراء محظورة في شؤن عراقية معاصرة، ستوكهولم ١٩٩٤، ل ١٩
١٤- حسن العلوي، الشيعة والدولة القومية في العراق(١٩١٤- ١٩٩٠)، ل ١٥٩- ١٦٠
١٥- د. رەفیق سابیر، هەمان سەرچاوە، ل٨٥ ل١٨٣
١٦- CIA سی ئای ئەی، اسناد لانه جاسوسی، کردستان(١) شماره ٣١، ل ٣٩

# پارت و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان
# لە سەردەمی دیموکراسیدا

## پێشەکی

دیموکراسی هەروەکو دیاردەکانی دیکەی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی، لە چەندین روانگە و بەرژەوەندی جیاوازەوە پێناسە کراوە و تا گەیشتە ئەو کاتەی کە دیموکراسی دەبێتە سیستەمێکی پەیوەندیی بەردەوامی نێوان دەوڵەت و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان. لە سەردەمەکانی رابردوودا دەمانویست بەهۆی دیموکراسییەوە لە کۆت و بەندی نەزانین، بێ مافی، وابەستەیی و دەسەلاتی رەهای جاران رزگارمان بێت و هەربەو هۆیەوە دەستمان بگات بە سەردەمی عەقڵ و سەروەری و مافی هاووڵاتیبوون و بەهرەمەندبوون لە ئازادی. بەپێی بۆچوونەکانی کۆمەڵناسی ناوداری فەرەنسی (ئالان تۆرین) سێ دەسەلات، سێ ئاست و رەهەندی گرنگی بۆ دیموکراسی دیاری کردووە و مێژووی بەردەوامی و گەشەی دیموکراسیش لە ئەنجامی کاریگەریی و پەیوەندیی نێوان ئەو سێ دەسەلاتە، بەکاتی ئێستا گەیشتووە:

دەسەلاتی عەقڵ، کە توانیویەتی سیستەمی نوێنەرایەتی بەرهەم بهێنێت و بەمەرجێک ئەم سیستەمە سنووردار بکرێت، بەهۆی هەڵبژاردن و نوێکردنەوەی هەڵبژاردن، دەستاودەست کردنی دەسەلات و گەرەنتیی مافی کەمینەکان لە لایەن دەسەلاتی عەقڵ، کە بەهۆی هەڵبژاردن و سیستەمی نوێنەرایەتییەوە دەبێتە دەسەلاتی زۆربە.

دەسەلاتی فەرهەنگ، وەکو رەهەندی کەلتووریی دەستەلات، کە لە سەردەمی ئێستا توانیویەتی بگاتە ئاستی هاووڵاتیبوون، بەهەردوولایەنی ئەرک و مافی دانیشتووانەوە. لە ماوەی مێژووی مرۆڤایەتیدا دەسەلات و دەوڵەتەکان چوار

سەردەمی فەرهەنگییان لە بواری دەسەڵاتدا بڕیوە کە بە جۆرێک ئەو ئاست و ڕەهەندە فەرهەنگییانە بوونەتە بناغە و سەرچاوەی ڕەوایی بۆ دەسەڵات. فەرهەنگی خێڵ و دابونەریتی هۆزەکان، سەرچاوەن بۆ دەسەڵاتی خێڵ، واتە (شاهۆزەکان) یان ملوک الطوائف. فەرهەنگی دینی یان ئاینی (مەزهەب) و هێز و توانای بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان سەرچاوەی ڕەوایی بۆ دەسەڵاتی ئیمپراتۆریا و میرنشینەکان فەراهەم دەکات. ئەم قۆناغە لەرووی نەژادییەوە، دەگاتە قۆناغی میللەت «الاقوام». فەرهەنگی نەتەوەیی و دەوڵەتی نەتەوە بناغە و ڕەهەندێکی گونجاوی چینی سێیەمە (بۆرژوازی) و بە تایبەتی لە سەدەی نۆزدە و تا ناوەڕاستی سەدەی بیست بۆ دامەزراندنی سەردەمی یەکەمی دەسەڵاتی دیموکراتی کە بەڕادەیەکی بەهێز پابەندی دەسەڵاتی (دەوڵەت- نەتەوە) و سەرەنجام فەرهەنگی هاووڵاتیبوون، دەبێتە ئاست و فەرهەنگی گونجاوی سەردەمی دووەمی دیموکراتی واتە سەردەمی هاووڵاتیبوون. هاووڵاتیبوون، ڕەوشێکی فراوانترە لە ڕەهەندی نەتەوەیی و دیموکراسیش لە هاووڵاتیبووندا باشتر دەتوانێت دەربڕینێکی گونجاوتر و ئازادتر لە داواکارییە فەرهەنگییەکانی دانیشتووان بکات بەدەر و زیاتر لە حاڵەتی خێڵایەتی، دینی یان مەزهەبی، ناوچەیی و نەتەوەیی. دەسەڵاتی ئازادی، یان ڕەهەندی ئازادی کە توانیویەتی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتیبوون و مافی تاکەکان بەرهەم بهێنێت. سەرەنجام دیموکراسی دەبێتە سیستەمێکی پەیوەندی و کاریگەری بەردەوامی نێوان ئەم سێ ئاست، ڕەهەند و دەسەڵاتە. هەرسێ ئاست و دەسەڵاتەکەش بەهۆی هێز و کاریگەریی ئاستەکانی دیکەوە سنووردار دەکرێت و لە حاڵەتی داکۆکیکردندا، نەک هێرشبردن، دەپارێزێت.

لە سەردەمی یەکەمی دیموکراتیدا، کە بە سەردەمی دەسەڵاتی دەوڵەتی نەتەوە، دەسەڵاتی بیرۆکراتی و شۆڕشگێڕ و قسەکەری بەرژەوەندی گشتی و بەرجەستەکەری یەکێتی دەناسرێت و وەکو سەرچاوەیەکی عەقڵانی و ڕەوایی، ئازادی وا سنووردار کرابوو کە تەنها بوویبووە هەوڵی خۆ دەربازکردن لە مەترسیی هەژموون و توندوتیژی هەردوو لایەنەکەی دیکەی دەسەڵاتی (دیموکراتی!). واتە سنووردارکردنی ئازادی لە بەرامبەر هەژموون و دەسەڵاتی زیادەڕەوی دەسەڵاتی

عەقڵ، سیستەمی نوێنەرایەتی و دەسەڵاتی هەڵبژێردراو، یان دەسەڵاتی فەرهەنگ، جا ئەو فەرهەنگە نەتەوایەتی بێت یان ڕەواییی شۆڕشگێڕانە یان فەرهەنگی دینی و دینی سیاسی بە تایبەتی لە وڵاتانی ئیسلامیدا.

سەردەمی دووەمی دیموکراتی، کە بە سەردەمی پەیدابوونی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دەناسرێت و هەندێک کۆمەڵناسان و فەیلەسوفانی سیاسی بە قۆناغێکی گرنگی دادەنێن لە ژیان و سیستەمی دیموکراتیدا کە ئاسۆیەکی نوێی بۆ پەروەردە و کولتووری دیموکراسیش هێناوەتە ژیان. پەیوەندییەکی پێویست و پتەو هەیە (لەم سەردەمەدا) لە نێوان فەرهەنگی دیموکراتی بەشێوەیەکی گشتی و چەمکی خودی کارکەر «الذات الفاعلة» و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان. بیر و هۆشی دیموکراتی بەهۆی هەموو ئەوانەی کە سووربوون لەسەر بەدیهێنانی مافەکان و ئاواکردنی ژیانێکی باشتر و گونجاوتر لە بەرامبەر دەسەڵاتە بیروکرات (ئەوانەی ئەوروپا و ئەمریکای باکوور) و دەسەڵاتە ڕەها و سەپێنراوەکان (جیهانی سێیەم) کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەڵات و ناوەندێتی و زوڵم و زۆریان زیاد دەبوو. ئەو خەڵکانەی کە بەشێک بوون لە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان هەر لە کرێکاران و ڕۆشنبیرانی گدانسک (پۆلۆنیا)، تا کرێکاران و خوێندکارانی تیان ئان مێن (چین)، تا خەباتکارانی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان (ئەمریکا) و تا دەگاتە خوێندکارانی مایسی ١٩٦٨ (ئەوروپا) و تا خەباتکارانی نەتەوە چەوساوەکانی جیهانی سێیەم و بە تایبەتی بزووتنەوەی دژی نەژادپەرستی، ئاپارتاید (لە ئەفریقا). خەبات و تێکۆشانی ئەم بزووتنەوانە قۆناغی دووەمی دیموکراتی بەدی هێنا کە لەمەودوا پێی دەڵێین (دیموکراسی بەشداربوون). لەم سەردەمە بەدواوە، دیموکراتی دەبێتە سیستەم و ژیانێکی پەیوەندی و کاریگەریی بەردەوام لە نێوان یەکێتیی عەقڵانیی ئامانجدار و ئامێری، فرەیی یادەوەری و فەرهەنگ و بزووتنەوەکان و سەرەنجام کۆکردنەوەی هەردوو ڕەهەندی ئاڵوگۆڕ و ئازادی. ئەم سەردەمە دەبێتە سەردەمی پاشەکشەی (دیموکراتی !) گشتیکراو و سەپێندراو، ماڵئاوایی لە دیموکراتیی تاک ڕەهەند و تاک فەرهەنگ و تاک دەسەڵات.

بەهۆی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە دیموکراسی لە هەندێک ئەرک و مافی

دەستووری و ئازادیی نێگەتیف و یاسایی کراوەوە، دەبێتە خەباتێکی ڕۆژانە، بەردەوام و شێنەیی کە خودی ئەو بکەرانە (بزووتنەوانە) بەهۆی پەروەردە و ڕووناکبیریی نوێوە (کە لەسەر بناغەی ئازادی و یاسا و هاووڵاتیبوون بنیات نراوە) لە دژی هەژموون و دەسەڵاتی زیادەڕۆی دەزگاکان، فراوانتر دەکرێن. بەم جۆرە، سەردەمی دووەم سیاسەتی خود و ئازادی و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانە، دەیەوێت ئازادی بخاتە ناو هەموو ئەو سنوور وبونیادە کۆمەڵایەتییانەوە کە تا ئێستا بەهۆی دەسەڵات و حاڵەتی فەرهەنگی کۆنەوە، بوونەتە یان(کراونەتە!) ڕەوشێکی ئاسایی و فۆلکلۆری. بەکورتی ئەم سەردەمە، سەردەمی سنووردارکردنی دەسەڵاتەکانە (نەک نەهێشتنی) و بەدیهێنانی هەرچی زیاتری داواکارییەکانی زۆربەی کۆمەڵە. دیموکراتی دەبێتە شێوەیەک لە ژیانی سیاسی کە دەتوانێت ژمارەیەکی زۆری خەڵک بەهرەمەند بکات لە ئازادی و فراوانترین خواست و داواکاریی مرۆڤەکان بەدی بێنێت.

ئەوەی لەم سەردەمەدا زۆر گرنگە ئەوەیە، فێرببین کە سەرەڕای جیاوازیمان چۆن لەگەڵ یەکدیدا بژین. چۆن جیهانێک پەیدابکەین کە هەمیشە کراوەبێت و زۆرترین و فراوانترین حاڵەتی فرەییی گونجاوی تێدابێت؟ وەڵامی ئەمەش ئەوەیە کە نابێت واز لە یەکێتیی نێوان خۆمان و فرەیییەکان بهێنین، کە بێ ئەو یەکێتییە پەیوەندی و بەردەوامیبوون، کارێکی مەحاڵە و لە هەمان کاتیشدا نەمانی جیاوازی و فرەیی، ژیانمان بەرەو نەمان و مردن دەبات. گرنگی و پێداویستیی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لەوەدایە کە هەردوو ئاستەکە دەپارێزێت، واتە دەتوانێت بەهۆی ئەرک و پابەندبوونمانەوە بە یاسا، دەسەڵاتی عەقڵ و حاڵەتی هاووڵاتیبوونەوە، یەکێتی و هاوەدەنگی و کۆدەنگیمان بپارێزێت و دیسان بەرهەمی بێنێتەوە، وەبەهۆی فرەیی و داواکاریی ئابووری و مافی ژیانێکی باشتر و گونجاوتر، فرەیی و جیاوازیمان گەشە دەکات و سەرەنجام ژیانێکی پڕ لە تێگەیشتن لە هەمان کاتدا ئاڵۆوالا بنیات دەنێت.

نابێت وا لە دیموکراتی بگەین کە باڵا دەستی یەکێتی و گشتیبوونە بەسەر تایبەتمەندی و فرەیییەکاندا، بەڵکو دەبێت بە کۆی ئەو گرەنتییە یاساییانەی بزانین

کە ئاستەکان و دەسەڵاتەکانی کۆمەڵ و دیموکراتی بۆ یەکتری دەسەلمێنن و سەرەنجام دیموکراتی، هەروەکو شارل تایلۆر دەڵێت دەبێتە: سیاسەتی خوێندنەوەی بەرامبەر و لەلای (ئالان تۆرین)یش دەبێتە: ئیرادە و تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ پەیوەندیی نێوان ئارەزووی ئازادی، پێداویستیی ناسنامە و بانگەوازی عەقل. ئالان تۆرین دەڵێت، ئەم پێناسەیە باشترین ناساندنی تا ئێستای دیموکراسییە. لێرە بەدواوە، چەند ئەرک و سیفەتی گرنگ بۆ دیموکراتی زیاد دەبێت و سەرەنجام دیموکراتیی بەشداربوون، دیموکراتیی ڕاوێژکاری و دیموکراتیی ئازادیخواز پەیدادەبێت.

ئەو کۆمەڵ و دەسەڵاتەی کە وا دەزانێت یاسا و دامودەزگاکانی باشترین وکاراترین دامودەزگایە، بێگومان حاڵەتێکی گشتیکراو و سەپێندراو بەسەرخەڵک و دانیشتوواندا دەسەپێنێت و دەسەڵات بۆی نییە و بێگومان لەمەودوا بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان ناهێڵن کە وێناکردنی تایبەتی بۆ خێر و شەڕ بەسەر خەڵکدا بسەپێنرێت و بەڵکو دەبێت پێش هەموو شتێک ئەوە قبووڵ بکات کە خەڵک بیروڕاو پرۆژەکانیان دەرببڕن و ڕێگا بدرێت بەشدارییەکی فراوان بۆ ئەم پرۆژانە، لەلایەن یاسا و دەسەڵاتەوە فەراهەم بکرێت.

## سەردەمی شۆڕشەکان

لەم وڵاتانەی کە ئێمەی تیادا دەژین، کە باسی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دەکرێت یەکسەر خەیاڵی خەڵکی بۆ دوو دیاردەی دیکە دەچێت، کە ئەوان هەرچەندە جیاوازییان لەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییانە، هەیە کە ئێمە دەمانەوێت باسیان بکەین، بەڵام لەڕاستیدا گەلێک کاریگەریی گرنگیان لە سەر ژیان و مێژووی مرۆڤایەتی داناوەو کە بەهۆی حیزب و شۆڕشەکانەوە، ڕەوش و سەردەمێکی زۆر نوێ لە جیهاندا پەیدا بووە. بۆ زیاتر شارەزابوونی شۆڕشەکان، کە بێگومان ئەوانیش بەشێکن لە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، پێویست دەبێت بەپێی لێکدانەوە نوێکان، شارەزاییمان لەو بارەوە هەبێت. ئەنتۆنی گیدنز، کۆمەڵناسی ناوداری بەریتانی، لە کتێبە گرنگ و گەورەکەی دەربارەی (کۆمەڵناسی)، لەم خاڵانەی خوارەوەدا، باسی شۆڕشەکان و کاریگەرییان لەسەر مرۆڤایەتی دەکات :

١- ژمارەیەک شۆڕش لە بەشێکی ناوچەکانی جیهان و لە ماوەی سێ سەدەی ڕابردوودا ڕوویان داوە، شۆڕشی ساڵی ١٧٧٦ ئەمریکا و شۆڕشی ١٧٨٩ فەرەنسا، ئامانج و هیوای وایان پێشنیاز کرد کە بەشێوەیەکی فراوان ژیانی سیاسییان بەرەو پێشەوە برد. لە سەدەی بیستدا زۆرتری شۆڕشەکان ئامانجی سۆسیالیستی، مارکسی یان (ناسیونالیستییان) هەبوو.

٢- شۆڕش چەمکێکی وەهایە کە بەئاسانی ناتوانرێ پێناسە بکرێت. لەبەر ئەوەی کە شۆڕش لایەنی هەڵگێڕانەوەی سیاسیی کردووەتە ئامانج بۆیە دەبێت خاوەنی بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بێت، کە ئامادە دەبێت بۆ بە دەستهێنانی هیواکانی لە توندوتیژی سوود وەربگرێت و بتوانێت هەم دەسەڵات بە دەستەوە بگرێت و هەم پاشان ڕیفۆرم و چالاککاری دەست پێ بکات.

٣- گەلێک تیۆری جۆراو جۆر دەربارەی شۆڕش خراونەتە ڕوو. لێکدانەوەی مارکس بۆ شۆڕش بە تایبەتی جێگایەکی دیارو ئاشکرای هەیە، نەتەنها لە بەرئەوەی بەرهەمی فیکری ئەو ـ کە بە شێوەی جۆراو جۆر باس و لێکدانەوە هەڵدەگرێت ـ بە ڵکو لەو ڕوانگەیەوە کە تا ئەندازەیەکی زۆرو بەرچاو کۆمەکی کرد بە سازدان و باسکردنی ڕەوەندە ڕاستییەکانی شۆڕش، کە لە سەدەی بیستەمدا ڕوویان دا.

٤- لەو جێگایەوە کە شۆڕش بۆ خۆی دیاردەیەکی ئاڵۆزە، بۆیە گشتیکردنی ئەو هەلومەرجانەی کە دەبنە هۆی ڕوودانی شۆڕش کارێکی دژوارە. زۆرترینی شۆڕشەکان، لە هەلومەرجێکدا ڕوودەدەن کە دەسەڵاتی حکوومەتی پێشوو لە بەریەک هەڵوەشابێت (بۆ نموونە لە ئەنجامی جەنگ)، لە شۆڕشەکاندا گرووپ یان پارتێکی چەوساوە دەتوانێت بزووتنەوەیەکی جەماوەریی گەورە پەیدا بکات و بەرەو بەردەوامی و گەشەی بەرێت. شۆڕشەکان، زۆربەیان ئاکامی نەخوازراوی ئامانجەکانی شۆڕش دەبێت، و بەرەو کەمبوونەوەو دابەشبوونی ئەو هیوایانە هەنگاو دەنێن کە پێشتر لە بەرنامەیاندا شۆڕشیان بۆ سازدابوو.

٥- ڕژێم و سیستەمەکانی دوای شۆڕش زۆربەیان دەسەڵاتگەران و دەسەڵات کۆنترۆڵ دەکەن و ڕێگا بە هێزەکانی دیکە نادەن بەشداربن و سوود لە ڕەوایی شۆڕشگێڕی وەردەگرن، شۆڕشەکان گەلێک ئامانجی گەورە و درێژماوەیان بۆ

ئەو کۆمەڵانە داناوە، کە کاری تیا دەکەن، ئەگەر چی جودا کردنەوەی ئەم پەیام و ئامانجانە لە هۆکارەکانی دیکەی کە کاریگەرن لەسەر گەشەی ئەو کۆمەڵانە کارێکی ئاسان نییە.

٦- زۆربەی شۆڕشەکان پشتیان بەستووە بە کاری توندوتیژی بەکۆمەڵ. زۆربەی شۆڕشەکان پێش ئەوەی دنیایەکی نوێ بنیات بنێن، دنیای کۆن یان (ئێستا) دەڕمێنن، بە پێچەوانەی ڕیفۆرم (چاککاری) تا شتێک بنیات نەنێ شتێکی دیکە ناڕووخێنێت.

٧- تاکە ئەڵتەرناتیڤێک لە بەرامبەر شۆڕش جگە لە ڕیفۆرم و دیموکراسی، پەیدابوونی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان کە چوارچێوەی هەوڵ و توانای کۆمەڵێک خەڵکە بۆ بەرەژەوەندی هاوبەش و چاکترکردنی هەلومەرجی ژیان و جیهان. ئەم بزووتنەوانە، کۆمەڵایەتی و جەماوەری و بێ توندو تیژی تەنها ئەوەندە نین کە بوونەتە بەدیلێک بۆ شۆڕشەکان، بەڵکو هەندێک ڕەوش و هیوای وا پێشنیاز دەکەن، کە دەبێت باشتر لێیان تێ بگەین و جوانتر دەربارەیان بکۆڵینەوە.

## دەور و کاریگەریی پارتەکان

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەولاوە، دوو جۆر بزووتنەوەی دژی ڕژێم لە ئەوروپا و شوێنەکانی دیکەی جیهان پەیدا دەبن کە لە سەرچاوەی (کۆمەڵایەتی یان چینایەتی و نەتەوایەتی) ئیلهام وەردەگرن. بزووتنەوەی یەکەم، واتە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان یان چینایەتییەکان باسی سەرکوتی پرۆلیتاریا و هەژارانیان بەدەستی بۆرژوازی دەکرد و ئەوانەی جۆری دووەم، واتە بزووتنەوەکانی نەتەوایەتی لە سەرکوتی خەڵکی ستەمدیدە و (نەتەوەکان و کەمایەتییەکان) بەدەستی دەسەڵاتە بێگانەکان، سەرچاوەی بوونی خۆیان و خەباتیان دەسەلماند. هەردوو جۆرە بزووتنەوەکە بانگەوازی بەدیهێنانی «یەکسانی» یان دەکرد و لە سێ زاراوە گرنگەکەی شۆڕشی فەرەنسە ئازادی و یەکسانی و برایەتی ڕەواییی خۆیان بەدی دەهێنا.

ئەم بزووتنەوانە، لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و نیوەی یەکەمی سەدەی بیست لە هەموو جێگاکاندا پێکهاتە و ڕێکخراو و حیزبی تایبەتییان بۆ ئەو مەبەستە پێک

هێنا و ئەو بزووتنەوە و حیزبانە کاری یەکەمی خۆیان بەوە دانا کە دەبێت دەسەڵات بەدەستەوە بگرن و دیسانەوە دەوڵەت لە سەر بناغەی ڕەواییی چینایەتی یان نەتەوایەتی بونیات بنێنەوە. ئەم بزووتنەوە (چینایەتی یان نەتەوایەتی) کۆمەڵایەتییانە هەوڵیان دەدا لە ڕێگای شۆڕش یان پارلەمانەوە، دەسەڵات بە دەست بهێنن، بەڵام ئەوەی کە زۆربەی بەرچاوە، ئەوەبوو کە ئامانجی یەکەم و گرنگی خۆیان تا ڕادەی چارەنووسساز، بە دەستهێنانی دەسەڵات بوو، وە هەر لە سەر شێوەی دەسەڵات، چەندین حیزبیان بۆ ئەم مەبەستە پێک هێنا. لە کاتێکدا کە بۆچوونی زاڵ لەو سەردەمەدا بۆ دەوڵەت، بۆچوون و تیۆری دەوڵەتی ناوەندی و بیرۆکراتی بوو، بۆیە دەبینین چەندەها پارت بەو شێوەیەی دەوڵەت ، بەڵام بچووکتر، پێک هاتن. تا ساڵی ١٩٤٥ سێ جۆری ڕۆشن و جیاواز لە یەک لەو حیزبانە لە سەرتاسەری دنیا پێک هاتن :

حیزبە سۆسیال ـ دیموکراتەکانی ئەنترناسیۆناڵی دووەم، پارتە کۆمۆنیستەکانی نێونەتەوەییی سێیەم و حیزبەکان یان بزووتنەوە جۆراو جۆرەکانی نەتەوەیی (ڕزگاریخوازی) نەتەوەو گەلەکان .

قۆناغی یەکەمی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان کە بە توندی گرێدرابوو بەو بزووتنەوانە (چینایەتی یان نەتەوایەتی) بۆ ماوەی نزیکەی سەد ساڵ و تۆزێکی خایاند و لە ئەنجامی دەسەڵات و گیروگرفتەکانی ئەم بزووتنەوەو دەسەڵاتانە جۆرێکی دیکە لە بزووتنەوەکان پەیدابوون کە لە ناوەڕاستی دەهەی ١٩٦٠ بە دواوە لە ئەوروپا و ئەمریکا و ئاسیاو ئەفریقا توانییان گومان و پرسیاری گەورە لە ڕەوایی و کارایی بزووتنەوە و پارتەکانی قۆناغی یەکەمی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان پێک بهێنن. بزووتنەوەکانی دەهەی شەست کە زیاتر لە دەوری «تاک» و داخوازییەکانی تاک دەسووڕایەوە بە جۆرێک بوون کە واقیعیەتی ئابووری، سیاسی و دیموکراتی وای لێ هاتبوو، کە ئەو بزووتنەوە نوێیانە، بزووتنەوە و حیزبە کۆنەکانیان خستە ژێر پرسیارەوە، ئەم ڕووداوانە لە خۆیدا، توانییان چەند ڕەوتێکی نوێ و بۆچوونی نوێ بۆ بوون و سەرچاوە و زەمینە و ئامانجەکانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، بەدی بهێنێت. هەروەکو باسمان کرد، هەرچەندە پارتەکان لە ئەنجامی بزووتنەوە

کۆمەڵایەتییەکانەوە پەیدا بوون، بەڵام چەند سیفات و تایبەتمەندیی خۆیان هەیە کە جیایان دەکاتەوە لە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە گشتییەکان :

**یەکەم**، پەیوەندی و بەشداری لە بزووتنەوەکاندا، پێویستی بە پابەندبوونی تەواو بەجۆرێک لە بیرو باوەڕی تایبەتی نییە، بەڵام بەشداربوون و ئەندامێتی لە پارتەکاندا وا دەخوازێت کە پابەند بوونی تەواو بە بیروباوەڕەوە، یەکێک بێت لە مەرجەکانی بنیاتنانی ئەو پارتانە.

**دووەم**، سیفەتی ڕێکخراوەیی حیزبەکان، وا پێویست دەکات کە لایەنی توندوتۆڵ و ئاستەکانی ڕێکخستن بوونی هەبێت و بەجۆرێک کە شێوەیەک لە شێوەکانی بیرۆکراتی (دیوان سالاری) لە هەموو پارتەکاندا هەیە. لە پارتدا حاڵەتی ڕێکخستن و فەرمان و ئاستەکانی سەرەوە و خوارەوە بەئاشکرا دەبینرێت، لە کاتێکدا بزووتنەوەکان زیاتر حاڵەتی ئازادی و کۆبوونەوە و بەشداریکردن لە چالاکییەکاندا، بە خۆوە دەگرێت.

**سێیەم**، ئامانجی یەکەم و پیرۆزی حیزبەکان بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتە و هەر بۆ ئەمەش، گومان کردن لە دەسەڵات و بونیادی پێشوو، یەکێکی دیکە دەبێت لە کارەکانی. ئامانجە زۆر و درێژ ماوەکانی حیزب، بەردەوام دوا دەخرێت بۆ سەردەمی بە دەستەوەگرتنی دەسەڵات و گۆڕینی دەسەڵاتی کۆن.

**چوارەم**، بەو رادەیەی کە پارتەکان، سەربە بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیایەکی تایبەتن، هەر بەو ئەندازەیە دەیانەوێت یەکێتیی ڕیزەکانی حیزب و پاشان یەکێتیی ڕیزەکانی کۆمەڵ لە دەوری بەرنامە و ئایدۆلۆژیای خۆیان بەدی بهێنن. بەم جۆرە یەکەمین کاری حیزب، تەنانەت پێش بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتیش، هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی یەکێتی لە دنیا و ژیانێکی پڕ لە جیاوازی و فرەیی.

**پێنجەم**، قەتیس مانی کاری حیزبەکان، تەنها لە کار و مەیدانی سیاسی و دانانی حیزب و سیاسەت بە ناوەڕۆک و سەرکردەی بەشەکانی دیکەی کۆمەڵ و ڕای گشتی. یەکێک لە کارە دژوارەکانی حیزب هەوڵدانە بۆ دروستکردن و بەهێزکردنی ناوەندێتیی سیاسی و بە جۆرێک کە بەشەکانی دیکەی خەبات و ڕای گشتی بە پاشکۆی حیزب دادەنرێت.

شەشەم، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، جیاوازیی تەواو ئاشکرا لە نێوان پارتەکان و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکاندا نییە، چونکە بەدیهێنانی ژیانێکی سیاسیی گشتی و ئازاد، وا دەخوازێت کە هەموو ئەمانە (ڕێکخراوەکان، پارتەکان و بزووتنەوەکان) لە پەیوەندی و کاریگەرییان لەسەر یەکتر، ڕەوش و دەسەڵات و کۆمەڵێکی باشتر بنیات بنێن. واتە دەبێت ئەوە قبووڵ بکەین کە ئێستا بوونی پارتەکان کارێکی پێویستە. بەڵام دەبێت کەموکوڕی و لاوازیی پارتەکان بەپێی پێوەرەکانی دیموکراسیی ئێستا نەهێڵرێت.

## پارتەکان و دیموکراسیی نوێ

دیموکراسی بەبێ سیستەمی نوێنەرایەتی، کە دەسەڵاتی عەقڵ و زۆربەیە، بوونی نییە. هەڵبژاردنی ئازادی دەسەڵاتداران لە لایەن خەڵکەوە، دەبێتە کارێکی بێ مانا، ئەگەر بێتو ئەم خەڵکانە نەتوانن دواکاری و کاردانەوە و پێداویستییەکانی خۆیان بە شێوەیەکی یاسایی و ڕێگاپێدراو نەخەنەڕوو. یەکێک لە کەناڵەکانی شێوەسازکردنی ئەم دواکاری و کاردانەوانە، لە ڕێگای حیزبەکانەوە دەبێت و تا ئێستا حیزبەکان دەتوانن یاریکەرێکی گرنگی گۆڕەپانی دیموکراتی بن. مەرج و زەمینەی دەورو کارایی حیزبەکان لە بەدیهێنانی دیموکراسییەکی باشتردا، پێویستی بەوە هەیە، کە زەمینەکانی کاری حیزبەکان و ئەو ڕەخنانەی لە خەباتی پارتەکان دەگیرێت و ئاسۆی چاکردنی، ئەم کارانە بەرەو هەلومەرجێکی باشتر بەرین :

**زەمینەی یەکەم**، ئەگەر ژیان و بەرژەوەندییەکان، جیاواز و فرەن، ئەگەر بێتو هەرکەسێک (یان هاووڵاتییەک) ڕستێک پێداویستی و داواکاریی هەبێت کە پەیوەندییان هەیە بە ژیان، کار وخێزان وپەروەردەی منداڵەکانی و ئاسایشی وبیروباوەڕیەوە. بۆیە دەبێت ئەوە قبووڵ بکەین کە مەحاڵە بتوانین سیاسەتێکی گشتی و دیاریکراو بنیات بنێین کە هەموو ژیان، بەرژەوەندی و ئاسایشی هاوڵاتییان لە خۆ بگرێت و سیاسەتێکی باش و گونجاو بێت بۆ زۆربەی کۆمەڵ و هەموو لایەنە سیاسی و کەمایەتییە دینی و فەرهەنگی و میللییەکان تیایدا بەهرەمەند بن. بۆیە ئەوەی ئەم پێداویستی و داواکارییانە سیفەت و حاڵەتی نوێنەرایەتی و یاسایی

وەربگرن، پێویستی بە کۆدەنگی و هاوبەرژەوەندی هەیە و دەبێت نوێنەرانی ئەم داواکارییانە، لە هەموو ئاستەکاندا، لەگەڵ یەکدی گفتوگۆ بکەن و سەرەنجام بتوانن لە شێوەیەک لە یەکێتی و کۆدەنگی بۆ نوێنەرایەتیی ئەم پێداویستییانە بەدی بهێنن. پارتەکان دەتوانن لەم زەمینانەدا (پێداویستی، داواکاری و کاردانەوەکان) ڕەوایییەکی باشتر بۆ بوون و گەشەو بەردەوامبوونیان پەیدا بکەن. ئەم ڕەوشە، دوو خاڵی گرنگی لێ دەکەوێتەوە، یەکەم، حیزبەکان دەتوانن لە کۆی داواکاری و بەرژەوەندی هاووڵاتییان، لە حاڵەتی تاکە بەرژەوەندی (بەرژەوەندی چینایەتی) وتاکە بیروباوڕەوە بەرەو حاڵەتی فەرمیی بچن و دیسان خۆیان نوێ بکەنەوە. لەم زەمینەیەدا، گرنگیدان بەئازادیی سیاسی بۆ بەشی هەرە زۆری کۆمەڵ لەلایەن پارتەکانەوە، دیموکراسی دەباتە بەرزترین پلەی بەهێزی، کاتێک کە کاردانەوە و ئۆپۆزسیۆنی کۆمەڵایەتی لە ئاستێکی فراواندا، بەرهەم دێت دیموکراسی ڕەوشێکی جێگیر و ئازادییەکی زیاتر بەخۆوە دەگرێ. ئەو وڵاتەی کە زۆرترین بەرجەستەبوونی ئازادی و فراوانترین ئازادیی سیاسی (یان بەشێوە کلاسیکییەکەی خەباتی چینایەتی و کۆمەڵایەتی) لە خۆدا بەرهەم هێناوە، واتە بەریتانیای مەزن، لەو وڵاتەدا دیموکراسی جێگیرترین ڕەوشی سیاسی بەخۆوە گرتووە. هەروەکو چۆن سۆسیال-دیموکراسیی ئەورووپای باکوور ئاسۆ و هۆشی دیموکراتی بەرەو سەرکەوتن برد، کە هەمیشە هەلومەرجێکی کراوەی بۆ خەباتی چینایەتی (ئازادیی سیاسی) لە نێوان پارتەکانی کرێکاران و پارتە بۆرژوازییەکاندا یاسایی کردبوو. دووەم، حیزبەکان دەتوانن لە حاڵەتی کۆمەڵایەتی (چینایەتی) دیسپلینکراو خۆیان نەجات بدەن و هەوڵ بدەن هەرچی زیاتر لە بەدیهێنانی بەرژەوەندی و خۆگرێدان بە چینێکی دیاریکراو یان توێژێکی دیاریکراو ڕزگاربکەن، و بتوانن لە کۆی بەرژەوەندییەکان، بەرژەوەندییەکی گشتیی دیموکراسی لە پارتەکانیاندا نوێنەرایەتی بکەن.

هەرچی زیاتر حیزبەکان بتوانن لەم بەرژەوەندییانە دووربکەنەوە، زیاتر دەتوانن لە هاوپەیمانیی بەرژەوەندی تایبەت و لە ڕەوشێکی کەمایەتیی بیروکراتی دووربکەونەوە. یەکێک لە دوژمنە گەورەکانی ئازادی و دیموکراسی، بوونی هەڵاواردن و ئیمتیازاتی ئابووری و سیاسی و دەسەڵاتی کەمایەتییە بیرۆکراتەکانە. زۆربەی

پارتەکانی سەردەمی یەکەمی دیموکراسی (سەدەی نۆزدە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم) لە ئەورووپا و ئەمریکا، تووشی ئەم نەخۆشییانە بوون، زۆربەی هەرە زۆری پارتەکانی جیهانی سێ تا ئێستاش هەر بەوجۆرەن.

**زەمینەی دووەم**، ئەگەر پارتەکان بتوانن، ببنە قسەکەر و نوێنەری سیاسیی فرە داواکاری و فرە بەرژەوەندی، هەر بەو ڕادەیە دەتوانن لە زەمینەی فەرهەنگی و تیۆری (ئایدۆلۆژی)دا ڕەوشێکی ئازادتر و فرەتر بەرهەم بهێنن و سەردەمی تاک بیروباوەڕی و یەکێتی خوازی بیروباوەڕەکان بەسەر دەچێت. حیزبەکان ئەگەر بتوانن لە کۆی بیروباوەڕەکانی (دیموکراسی، لیبرالی‌سۆسیالیستی، نەتەوایەتی، مۆدێرن و فرەمۆدێرن) ئەڵتەرناتیفێکی باشتر بەرهەم بهێنن، چاکتر دەتوانن لە داخوازی و بەرژەوەندییە فرە و گشتییەکانی خەڵک با تێ بگەن و سەرەنجام حاڵەتی ناوەندێتی و بیرۆکراتی بەسەردەچێت. زەمینەی ماددی و کۆمەڵایەتی، ئەم فرەییە لە بیروباوەڕدا، جگە لە بنیاتنانی کۆی بەرژەوەندییەکان، تێگەیشتنی هەلومەرجی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانە (بزووتنەوەی ئافرەتان، منداڵان، کەمایەتییەکان، پارێزەرانی ژینگە، بزووتنەوە چینایەتییەکان).

دەبێت یاسای دیموکراسی و حیزبە سیاسییەکان، ڕێگە بدات بە توێژە کۆمەڵایەتییەکان بۆ خۆڕێکخستن و بەدیهێنانی بزووتنەوەی داواکاریی یاسایی، هەروەها بتوانن لە ڕێگای نوێنەرەکانیانەوە بەشداری لە ژیانی سیاسی و پارلەمانیدا بکەن (یان لە ڕێگای نوێنەرانی پارتەکانەوە، یان ڕاستەوخۆ سەندیکا و کۆمەڵە و N. G. O. ڕێکخراوە ناحیزبی و ناحکوومییەکان بتوانن لە ژیانی سیاسی و پەرلەمانیدا بەشداربن)، ئەم ڕەوشە، واتە نوێنەرایەتیی سیاسی و یاسایی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، لە بیروباوەڕی ڕۆژئاواییدا بە باشترین شێوە بەرهەم هاتووە. ژیانی سەندیکایی لە فەرهەنگی سۆسیال- دیموکراسیدا، زەمینەیەکی بەهێزە بۆ سەرهەڵدانی پارتە کرێکارییەکانیان پارتە سۆسیالیستەکان کە توانییان ببنە باسکی سیاسیی ژیانی سەندیکایی. دامەزراندنی پارتی کاری بەریتانیا لە سەرچاوە و زەمینەی یەکێتیی سەندیکاکانی ناو TUC، یان پەیوەندیی بەتینی نێوان یەکێتیی کاری سویدی LO و پارتی سۆسیال- دیموکراتیدا. ئەم هەلومەرجە لە

ئیتالیا و ئیسپانیاش هەر بەو شێوەیە کە خەباتی کرێکاری زەمینەیەکی بەهێزە بۆ هێز و توانای پارتە کرێکاری و سۆسیالیستەکان.

زەمینەی سێیەم، پەیوەندیی نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی سیاسی، هەر تەنها ڕاستەوخۆ نییە، بەڵکو بەهۆی هەندێک هۆکاری ناوەنجی و بەهۆی کاری ئەوانەی دەبنە کارکەری ناوکۆیی نێوان ئەم دوو ژیانە. یانەکان، ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، یەکێتی و سەندیکا پیشەییەکان و گرووپە ڕووناکبیرییەکان و تەنانەت کۆڕ و کۆمەڵە ئابووریی و فەرهەنگییەکان ئەو هۆکارە و پەیوەندییانەن کە لە پانتایی و قووڵاییی کۆمەڵدا، دەتوانن زەمینەی دیموکراسی فراوانتر بکەن و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لەو زەمینەیەدا باشتر گەشە بکەن. کاری ئەم ناوەندانەی پەیوەندی لە نێوان سیستەمی سیاسی و ژیانی کۆمەڵایەتی، چەندین ڕێگا و هەڵبژاردنی جیاوازی سیاسی بۆ بەشداریکردن و دەوڵەمەندکردنی سیاسی بەدی دەهێنێت، ئەم هۆکارانە دەتوانن ببنە زەمینەیەکی باش بۆ سەرهەڵدانی پارتە نوێکان یان ڕیفۆرم و چاککردنەوەی پارتە کۆنەکان، لەم کاتانەشدا نابێت وا تێ بگەین کە حیزبەکان ئەڵتەرناتیفی ئەو ناوەندانەی پەیوەندی و کاریگەرین.

تەسککردنەوە و گورزلێدانی دیموکراسی، لە یەکێک لە مەیدانەکاندا، هەوڵدانە بۆ کەمکردنەوەی ئەم هۆکارانەی پەیوەندی و کاریگەری. لە وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکا و جیهانی سێ، زۆربەی پارتەکان لە دوای بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات، پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ بازاڕ و کەسانی دەوڵەمەندا دروست کرد و ئابووری و بازاڕ ڕاستەوخۆ لەگەڵ دەسەڵاتدارانیدا بوونە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ دەوڵەمەندبوونی سیاسی و دەستەڵاتدارەکان و زەمینەی بەدیهاتنی «فەساد» بەشێوەیەکی ڕەسمی و پاڵپشتکراو دروست بوو. بۆ پاراستنی ئەم پەیوەندییە ڕاستەوخۆیە (ئابووری و بازار لەگەڵ دەسەڵاتداران)، پشتکردنە خواستەکانی جەماوەر و بەهێزکردنی بیروکراتی. پەیوەندیی نێوان پارتەکان و ڕێکخراوە جەماوەری و پیشەییەکان، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەک لەڕێگای ئەو ناوەندانەی پەیوەندی و کاریگەری، دەبێتە هۆی پاشکۆیەتی ئەو ڕێکخراوانە و سەرەنجام کزبوون و بێ دەسەڵاتیی ئەو ناوەندانە و بۆ پاراستنی ئەم پاشکۆیەتییە، بێگومان پێویست دەبێت کە خودی ئەو ڕێکخراوانە

بکرێنە بەشێک لەو حیزب و دەسەڵاتە. ئەزموونی وڵاتانی جیهانی سێ، بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و سیستەمی سیاسی و سەرەنجام بۆ پاشکۆکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لە ڕێگای ئەو بەناو ڕێکخراوە جەماوەرییانەوە.

**زەمینەی چوارەم**، بەڵام سەرەڕای بوونی ناوەندێک لە نێوان ژیان و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان و سیستەمی سیاسی، یان بەشێوەیەکی گشتی ژیانی سیاسی، نابێت وا تێ بگەین کە پارتەکان سەربەخۆن لە هێزە کۆمەڵایەتییەکان. هەرسێ ڕژێم و بیروباوەڕە سۆسیالیستەکان، هەر لە کۆمۆنیزمی لینینزمەوە تا دەگاتە هەندێک لە سۆسیال- دیموکراتەکان، پێش هەموو شتێک لەبەر سەربەخۆیی ودابڕانی ئەو حیزبانە بوو لە ژیانی کۆمەڵایەتی کە سەرەنجام پاشکۆکردنی هێزە کۆمەڵایەتییەکان، کرایە ئامانج. دیموکراسیی ئازادیخواز و بەشداری و ڕاوێژکاری وا پێویست دەکات کە هەموو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، بەهۆی ناوەندەکانی پەیوەندی و کاریگەرییەوە، ڕێگای کار و بەشداری و سیفەتی نوێنەرایەتییان هەبێت، بەجۆرێک بێت بتوانێت مانایەکی دیکە و جیاواز لە حیزبەکان بۆخۆی و بۆ بەشداری لە ژیانی دیموکراسیدا بەرهەم بهێنێت.

چی ڕوودەدات کاتێک کە هێزە سیاسییە چالاکەکان ( حیزبەکان) گوێ نەدەن بە داواکاریی هێزە کۆمەڵایەتییەکان؟ چی ڕوودەدات کاتێک پارتەکان دەیانەوێت ڕاستەوخۆ لە ڕێگای خۆیانەوە، بۆچوون و ڕێگاچارەسەری سیاسی پێشکەش بکرێت، واتە ڕێگا نەدرێت بەبوون و کاری ئەو ناوەندانەی پەیوەندی و کاریگەری؟ یەکەمین شت ئەوەیە کە سیفەتی نوێنەرایەتی لەو هێزە کۆمەڵایەتی و ناوەندانە دەسەنرێتەوە و تەنها حیزبەکان دەبنە دەمڕاستی کۆمەڵ و بەشەکانی دیکەی کۆمەڵ، دەخرێتە پەراوێزەوە. ئەم ڕەوشە ئەم بەرهەمە خراپانەی دەبێت: هاوسەنگیی نێوان ئەم هێز، ناوەند و حیزبانە تێک دەچێت، یەکێک لە سیفەتە گرنگەکانی دیموکراسی و یەکەمین مەرجی دیموکراسی ئازادیخواز، واتە هەوڵدان بۆ سنووردارکردنی دەسەڵات، لەنێو دەبرێت. ئەم هەلومەرجە دەبێتە سەپاندنی حیزبەکان و دیموکراسی تا ڕادەی دەسەڵاتی حیزبێک یان چەند حیزبێک کەم و تەسک دەکرێتەوە. ئالان

تۆرین، کـۆمـەڵناسی فـەرەنسی ئەم هەلومـەرجـە ناو دەنێت (Partiocraty) (پارتیۆکراتی).

**زەمینەی پێنجەم،** کەس ناتوانێت دیموکراسی بەبێ بوونی پارتەکان وێنا بکات، دیموکراسی بەبێ هێز و توانای هێزە سیاسییە کاراکان، بەمانای ڕاستەقینەی بوونی نییە. ئەگەر ئەوە پەسەند بکەین کە دیموکراسی دەبێت نوێنەرایەتی بەرجەستە بکات، هەر بۆیە دەبێت هێزە سیاسییەکان و پارتەکان، کە مەرجێکی گرنگی دیموکراسین، پێویستە لە پێناوی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵدا کاربکەن، نەک تەنها لە خزمەتی خۆیاندا. لەگەڵ ئەمانەشدا، دیموکراتی هەموو کاتێک دەبێت حاڵەتی ڕیفراندۆمی «استفتاء» بەخۆوە بگرێ، کە لە هەموو ئاستەکانی پارتەکان، ڕێکخراوە دیموکراتی و جەماوەرییەکان و ناوەندەکانی پەیوەندی وکاریگەریی نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی سیاسی، بەئەنجام بگات. بەڵام بەتەنها دەسەڵاتی پارتەکان یان پارتیۆکراتی دیموکراسی لەناو دەبات و سیفەتی نوێنەرایەتیی لێ زەوت دەکات، یان دەسەڵات و هەژموونی کۆمەڵە ئابوورییە دەسەڵاتدارەکان دەسەپێنرێت و هەموو ئەمانەش لە چاوەڕوانیی دیکتاتۆریدا دەبن. مەترسیی پارتیۆکراتی بەرەو زیادبوون دەچێت، کاتێک کە ئەم هێزە کۆمەڵایەتییە کارانە دەکەونە حاڵەتی پەرتەوازەیی و دابڕان.

## دیموکراسی و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان

سیستەمی نوێنەرایەتی وا دەخوازێت کە داواکارییە کۆمەڵایەتییەکان بتوانن نوێنەرایەتی خۆیان بکەن، واتە بتوانن بەپێی یاساکانی دیموکراسی ئەو پارییە سیاسییە بکەن کە بەردەوام دەسکەوتی بۆ پەیدا دەکەن و بەپێی بڕیار و پەسەندی زۆرایەتی ئەو داوایانە بەدی بهێنن. هەرچەندە هەندێک کات ئەم داواکارییانە یان جێبەجێ ناکرێن لەبەرئەوەی لەلایەن سیستەمی سیاسییەوە وەڵامیان نییە کە بەهۆی هەژموونخوازی هەندێ لە دەوڵەتەکانەوە یان سنووردارن، یان ئیفلیجن یان لەناوبراون. دیموکراسی لەم حاڵەتەدا جگە لە دەسەڵاتێک کە بەناوی هەڵبژاردن و زۆربەوە ناوەرۆکی دیکتاتۆری لەبەرگی سەردەمدا پەیدا دەکات. داواکاریی هەندێک

له بزووتنه‌وه‌، كۆمه‌لایه‌تییه‌كان، نابێته‌ جێگایه‌ك بۆ دانوستان و گوێگرتن، له‌به‌رئه‌وه‌ی ئه‌و بزووتنه‌وانه‌ ده‌یانه‌وێت ئه‌و هێزه‌ دیاریكراوانه‌ ئاماده‌ و چه‌كدار بكه‌ن كه‌ ده‌یانه‌وێت خودی دیموكراسی و سیسته‌می سیاسی و نوێنه‌رایه‌تی له‌ ناوبه‌رن. هێرشی ئه‌م هێزه‌ كۆمه‌لایه‌تییانه‌، یان به‌ناوی دین (نموونه‌ی ئیسلامی سیاسی)، یان به‌ناوی چین و ئایدیۆلۆژیاوه‌ (نموونه‌ی كۆمۆنیزم) ده‌یه‌وێت كه‌ ته‌واوی ژیان و فه‌رهه‌نگی دیموكراسی له‌نێوبه‌رێت. لێره‌وه‌ بۆمان ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ دوو مه‌رجی زۆر گرنگ، پێویستن بۆ به‌دیهاتنی بزووتنه‌وه‌ كۆمه‌لایه‌تییه‌ دیموكراته‌كان، یه‌كه‌م، ڕژێم و ده‌وڵه‌تێكی دیموكراتی هه‌بێت كه‌ گوێی له‌ داواكارییه‌ كۆمه‌لایه‌تییه‌كان بگرێت و نه‌ك ته‌نها ئه‌مه‌، به‌ڵكو ده‌بێت خودی دیموكراسی یارمه‌تیده‌ری ئه‌و بزووتنه‌وانه‌ بێت. دووه‌م، ده‌بێت ئه‌و داواكارییانه‌ حاڵه‌تێكی هێرشبه‌ر و دوژمنانه‌ وه‌رنه‌گرێت و ده‌بێت یارمه‌تیده‌ر بێت بۆ به‌هێزكردنی سیسته‌می دیموكراسی و دیموكراسیش له‌ حاڵه‌تی نوێنه‌رایه‌تییه‌وه‌ به‌رێته‌ حاڵه‌تێكی به‌شداری، ڕاوێژكاری و ئازادیخوازی.

ئامانجی كاروانی كۆمه‌لایه‌تی، ئازادبوونی خوده‌كانه‌، خودیش به‌ته‌واوی جووت نییه‌ له‌گه‌ڵ (تاك)، چه‌مكی خود، بریتییه‌ له‌ بكه‌ری كۆمه‌لایه‌تی كه‌ ده‌توانێت په‌یوه‌ندی كۆمه‌لایه‌تی (نه‌ك یه‌كێتی كۆمه‌لایه‌تی!) بكاته‌ ڕه‌هه‌ندێكی ڕه‌سه‌ن له‌ تاك و كۆمه‌ڵ و بزووتنه‌وه‌كاندا. خود، ناوی ئه‌و بكه‌ره‌یه‌ كه‌ كاتێك ده‌گاته‌ ئاستی مێژوویی، واته‌ ده‌گاته‌ ئاستی بزووتنه‌وه‌ی كۆمه‌لایه‌تی، ده‌توانێت به‌رهه‌می نوێ و پێوه‌ری نوێ بۆ ژیانی كۆمه‌لایه‌تی به‌دی بهێنێت. خود و بزووتنه‌وه‌ی كۆمه‌لایه‌تی بڕبڕه‌ی دیموكراسییه‌، كه‌ سه‌رله‌نوێ كۆمه‌ڵ به‌رهه‌م دێنێته‌وه‌. بزووتنه‌وه‌ كۆمه‌لایه‌تییه‌كان ته‌نها كاردانه‌وه‌یه‌ك نییه‌ له‌به‌رامبه‌ر سیسته‌م و ده‌سه‌لات و دیموكراسی، به‌ڵكو ئه‌وان دیسان سیسته‌م و كۆمه‌ڵ به‌رهه‌م ده‌هێننه‌وه‌ و خۆشیان ده‌بنه‌ به‌شێك له‌و په‌یوه‌ندییانه‌. كاریگه‌ری بزووتنه‌وه‌ كۆمه‌لایه‌تییه‌كان ته‌نها له‌ كاری سیاسی و به‌رهنگاربوونه‌وه‌دا نییه‌ و به‌ڵكو له‌وه‌ دایه‌ چه‌ند ده‌توانێت كاریگه‌ربێت له‌سه‌ر ڕای گشتی. بیروباوه‌ڕی بزووتنه‌وه‌ی كۆمه‌لایه‌تی، له‌سه‌رچاوه‌یه‌كی ئایدیۆلۆژییه‌وه‌ به‌رهه‌م نایه‌ت، به‌ڵكو بیروباوه‌ڕێكی فره‌ و ئازادییه‌ و هه‌موو بیروباوه‌ڕه‌كان، به‌مه‌رجی فه‌رهه‌نگ و په‌روه‌رده‌ی دیموكراسی قبووڵ بكه‌ن، له‌ناو بزووتنه‌وه‌ی كۆمه‌لایه‌تیدا

جێگایان دەبێتەوە و هیچ کامیشیان لەو بیروباوەڕانە نابنە ناوەند و ئەوانی دیکە ببنە پەراوێز، ئەمە یەکێکە لە خاڵە گرنگەکانی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی جیاواز لە پارتە سیاسییە کلاسیکییەکان (کۆمۆنیست، سۆسیالیست، ناسیۆنالیست و دینی) کە ئەوان بیروباوەڕی خۆیان بە ناوەند و ئەڵتەرناتیڤی ئەوانی دیکە دەزانن. من بڕوام وایە کە دەبێت نەوەیەکی نوێ لە پارتەکان لەدایک بێت کە فرە بیروباوەڕبن و بیرە سەرەکییەکانی ئێستای دنیا لە پەیوەندی و کاریگەرییان لەگەڵ یەکدیدا (واتە بیروباوەڕەکانی سوسیالیزم، دیموکراسی، هاوولاتی و پێشکەوتن) بەرجەستە بکەن و هیچ ناوەند و جێگایەکی نایاب بۆ بیروباوەڕێکی دیاریکراو دانەنرێت و هیچ کام لەو بیرانە نەکرێتە سەرکردە و ئیلهامبەخش و ئەوانی تریش پابەند بکرێت بەو سەرکردە و ناوەندەوە.

بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، یەکێک لە سیفەتەکانی ئەوەیە کە لەپاڵ هەوڵدان بۆ هێنانەدیی داواکارییەکانی، بەرامبەر دەخوێنێتەوە و هەلومەرجی ئەو بەرامبەرەی کە داوای بەدیهاتنی داخوازییەکانی لێ دەکات، تێ دەگات و بەو بۆنەیەوە ئیمانۆیل لونیاس: خوێندنەوەی بەرامبەر مەرجی یەکەمی دادپەروەرییە. پەیوەندی و کاریگەریی بزووتنەوەکان لەگەڵ سیستەم و دەوڵەتدا، لەم ڕێگایەوە ئاسۆی باشتری بۆ دەکرێتەوە. هەر ئەم خاڵە وامان لێ دەکات، تێ بگەین کە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی بزووتنەوەیەکی ئاسۆیییە، نەک ئەستوونی و بیروکراتی و بەپێچەوانەی حیزبە کلاسیکییەکانەوە کە بیروکرات و توێژ توێژن، بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، حاڵەتێکی ئاسۆیی و کراوەی هەیە و لەنێو خۆیدا و لەگەڵ بزووتنەوەکانی دیکەشدا، ڕەوشی سەرکردایەتی و بیرۆکراتی پەسەند ناکات.

بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، ڕیفۆرمیستە و هەوڵی چاککردن و سازدانەوەی دووبارەی ژیان و کۆمەڵ دەدات، واتە ئەم بزووتنەوانە نە شۆڕشگێڕن، واتە هەوڵی ڕووخان نادەن، بەڵکو دەیانەوێت هەلومەرجێکی پۆزەتیف نەک نێگەتیف و توندوتیژ و ئاڵۆز، بەرهەم بێنن. لەبەر ئەوەی کە ئاسۆیییە، خوێندنەوەی بەرامبەر تێ دەگات و ڕیفۆرمیستە، بۆیە سەرەنجام بزووتنەوەکان حاڵەتێکی هارمۆنی وەردەگرن، هەروەکو جان جاک ڕۆسۆ، دەڵێت: هارمۆنیی بەشەکان، نەک تەشویش و نەبوونی یەکسانی.

بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، هەروەکو دیموکراسی سێ ڕەهەندی دیکەی گرنگی هەیە واتە سیفەتی عەقڵانی و پابەندبوون و پاراستنی هاوولاتی (بە ئەرک و مافەکان) و بەدیهێنانی خود و ئازادی کردووەتە ئامانجی خۆی و هەموو ئەمانەش بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە. هەر سەبارەت بە بەدیهێنانی خود و ئازادیی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان ئەو حاڵەتە یەکێتییە پێش وەختە سەپێندراوانە (نەتەوە، چینەکان (پرولیتاریا و بۆرژوازی)، دین، و دابونەریتەکان) پەسەند ناکات و هەوڵ دەدات لەژێر سەپاندنی ئەم حاڵەتە یەکێتییە ڕزگاری ببێت، بەڵام بەبێ ئەوەی کەمترین توندوتیژی بەکار بێنێت. هەروەکو چۆن بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی بە بەشێک نییە لە چینی کۆمەڵایەتی، هەر بەو جۆرەش نابێت کە ببێتە بەرجەستەکەری هیوا و بەرژەوەندی توێژە کۆمەڵایەتییەکانیش (ئەندازیاران، پزیشکان، کرێکاران....) بەڵکو بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی هەوڵ دەدات لە شوێنی کار و ژیانی ئەوانەی پێکەوەن داواکارییەکان بەرزبکاتەوە و ڕێکخراو و پەیوەندی پێویست دروست بکات. بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو هەوڵ دەدات کە هاوکاری و پشتیوانیی بەشەکانی دیکەی کۆمەڵ پەیدا بکات بەبێ ئەوەی کە ئەوان ئەڵتەرناتیفی ئەمان بن یان ئەم ئەڵتەرناتیفی ئەوان بێت. یاسای گشتی بێ بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی لەم حاڵەتەدا دەبێتە (بوون کۆی تاکەکان).

لە دنیای مۆدێرندا، بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دژی سازمانە ڕەسمییە بیروکراتەکان کاردەکەن، هەردوو ئەمانەش، بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و ڕێکخراوی بیروکراتی، یەکێکن لە تایبەتمەندییەکانی دنیای ئێستامان. ناکۆکیی نێوان ئەم دووانە، وا دەکات کە ئازادیی سیاسی دژی سەپاندن و بیروکراتیزم، بەردەوام بە زیندوویی بمێنێتەوە بۆیە دەتوانین یەکێکی دیکە لە پێناسەکانی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، لە زەمینەی دژایەتیی سەپاندن و بیروکراتی، پەیدا بکەین و بزووتنەوەکان دەبنە کۆششێکی کۆمەڵایەتی بۆیە بەدەستهێنان و بەرەوپێشەوە بردنی سوودی هاوبەش، یان پەیداکردنی ئامانجێکی هاوبەش، لەڕێگای کاری بەکۆمەڵ لە دەرەوەی سنووری دەزگا ڕەسمییەکان.

بەم بۆنەیەوە، دەبێت بزانین کە هێڵی جیاکەرەوە لە نێوان بزووتنەوە

کۆمەڵایەتییەکان و دەزگا ڕەسمییەکاندا، کارێکی ڕۆشن نییە. چونکە ئەو بزووتنەوانەی کە بەتەواوی جێگیربوون بەشێوەیەکی ڕەسمی کاردەکەن و وردە وردە تایبەتمەندیی بیرۆکراتی پەیدا دەکەن (دەکرێت مەسەلەی دروستکردنی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان لەلایەن پارتەکانی کوردستان، شێوەیەک بێت لەم ڕەوشە). هەر بۆیە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لەوانەیە بە تێپەڕبوونی کات ببنە ڕێکخراوی ڕەسمی، لەکاتێکدا زۆر کەم (بەدەگمەن) ڕێکخراوە، دەگۆڕێن بۆ بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان.

سیفەتێکی دیکەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوەیە کە جیاوازە لە گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان، بەڵام ئەم جیاوازییە هەمیشە ئاسان نییە. گرووپەکانی هاوبەرژەوەندی، ئەو ڕێکخراوانەن کە بە مەبەستی کاریگەری لەسەر سیاسەتمەداران، بەجۆرێک کە لە خزمەتی ئەندامەکانیان بێت، پەیدابوون. لە کوردستانی خۆماندا، گەلێک ڕێکخراوی لەم جۆرە، لە سەرەوە دروست کراو لەلایەن دەسەڵاتەوە، یان لەلایەنی کەسانی سەربەو توێژە کە لە دەسەڵاتدا کاردەکەن یا نزیکن لە سەرچاوەی بڕیارەوە. ڕێکخراوەکانی پزیشکان، ئەندازیاران، پارێزەرانهتد دەکرێت شێوەیەک بێت لە شێوەکانی گرووپی هاو بەرژەوەندی. ڕێکخراوی دیموکراتی و بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، بزووتنەوە و ڕێکخراوبوونە بۆ شوێنی کار و ژیان، واتە هەموو ئەوانەی لە کاری تەندروستیدا ژیان پەیدا دەکەن، بە پزیشک، کارمەند و کرێکارەوە دەبێت لە بزووتنەوەیەکی تایبەتی و لە ڕێکخراوێکی سەر بەو کارە (تەندروستییە) هیواکانیان بەدی بهێنن و هەر بەو ئەندازەیەش دەبێت هەوڵ بدەن بۆ بەدیهێنانی خێری گشتی لە بواری تەندروستیدا. ڕێکخراوی تەندروستیی وڵاتی سوید، هەموو ئەو کەسانەی تێدایە کە لەو بوارەدا کاردەکەن . نەک وەکو ڕێکخراوەکانی وڵاتی خۆمان، کە سەندیکای پزیشکاران جیاوازە لە سەندیکای کارمەندانی تەندروستی. لە وڵاتی ئاڵمان یەکێک لە گەورەترین سەندیکاکان، کە ناوی سەندیکای فلزکارانە، ٧٠٪ی ئەندامانی لە ئەندازیاران پێکهاتووە و ئەوی دیکەشی لە کرێکاران و کارمەندانی کە لەو ڕشتەیەدا کاردەکەن. بەڵام لە وڵاتی ئێمە سەندیکایەکی تایبەتی هەیە بۆ ئەندازیاران، کە زۆربەیان پێکەوە کار ناکەن، تەنیا خاڵی ناوکۆیی و هاوبەشیان ئەوەیە کە ئەندازیارن، واتە هاوبەرژەوەندیین. ئەندازیارانی ڕێگاوبان، شارەوانی، ئاوەدانکردنەوە و کەرتی تایبەت پێکەوە لەسەر

بناغەی هاوبەرژەوەندی سەندیکایان پێک هێناوە، کە بێگومان کارەکانیان لەیەکتری جیاوازە و مەبەستم ئەوەیە پێکەوە کار ناکەن. بەلام ئەندازیارانی هەر یەکێک لەو بەشانە لەگەڵ کارمەندان و کرێکارانی هەمان بەش هیچ جۆرێک هەوڵدانی هاوبەش ناکەن بۆ بەدیهێنانی بزووتنەوەی شوێنی کار و ژیان. دامەزرانی رێکخراوی دیموکراتی و (ناحزبی!) لەسەر بناغەی هاوبەرژەوەندی، کە بێگومان نەک بە تەنها حاڵەتی چینایەتی بەپیرۆز رادەگرێت، بەڵکو حاڵەتی توێژبەندی «اصناف» زێتر قووڵ دەکاتەوە. بێگومان توێژبەندی لە حاڵەتی چینایەتی کۆنەپەرستترە. یەکێک لە ئامانجە گرنگەکانی بزووتنەوەی دیموکراتی و کۆمەلایەتی لە رێگای رێکخراو و سەندیکا و کۆمەڵەکانەوە، کەمکردنەوەی جیاوازیی چینایەتییە، لە هەردوو مەیدانی ئابووری وفەرهەنگی، نەک قەتیس مان لەو حاڵەتەدا. هەمیشە رێکخراوی هاوبەرژەوەندی، چینایەتی و توێژبەندی بەرەو بیرۆکراتی و نزیکبوونەوە لە دەسەلات مل دەنێ و دەسەلاتیش لەو رێگایەوە باشتر دەتوانێت، بزووتنەوەی کۆمەلایەتی پەرت و لێکدابراو بکات و سەرەنجام بیکاتە پاشکۆی خۆی. گرووپەکانی هاوبەرژەوەندی زیاتر لە رێگای پەیوەندیی سیاسی و تایبەتی لەگەڵ لێپرسراوی حیزبی و حکوومیدا کارەکانی خۆیان بەرەو پێشەوە دەبەن، بەلام بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان، لەرێگای کاری بەکۆمەڵ و جەماوەری و چالاکیی ئاشکرا، زەمینەی دیموکراتی لە کۆمەڵدا فراوانتر دەکەن، ئەمە سەرەڕای کارکردنی یاسایی و رێکخراوەیی.

تا ئێستا بەشێوەیەکی بەرایی، پێناسە و سیفات و جیاوازیی نێوان بزووتنەوەی کۆمەلایەتی و حیزبەکان و رێکخراوەکانی بەرژەوەندی هاوبەش، باس کرد. بەلام بۆ ئەوەی بە باشتر لەم مەیدانە شارەزابین و جوانتر بتوانین بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان بناسین، پێویستمان دەبێت جارێکی دیکە پەنا ببەینە بەر کۆمەڵناسی ناودار، ئەنتۆنی گیدنز و کتێبە نایابەکەی دەربارەی کۆمەڵناسی و بزانین ئەو چۆن سەبارەت بەجۆرەکانی بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان دەدوێت. گیدنز بیروڕای (داڤید ئابرل)ی سەبارەت بە جۆرەکانی بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان، بەم جۆرە خاڵبەندی کردووە:

١- ئەو بزووتنەوانەی کە دەیانەوێت دنیا بگۆڕن و دنیا هەڵگێڕنەوە، ئامانجی ئەوان بۆ هەموو کۆمەڵ یان چەند کۆمەڵ و چەند ولاتە. ئەو گۆڕانەی کە ئەندامانی ئەم بزووتنەوانە دەیانەوێت بەدییان بهێنن، گشتی و بێ سنوور و زۆربەی جاریش بە

ڕێگایەکی توندوتیژە. نموونەی ئەم بزووتنەوانە، بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان یان بزووتنەوەی دینیی ڕادیکاڵ (لای خۆمان ئیسلامی سیاسی). بۆ نموونە، زۆرێک لە بزووتنەوەکانی هەزارەی مەسیحی دەیانەوێت، کەموزۆر پێکهاتەی تەواوی کۆمەڵ بگۆڕن، کە بە بڕوای ئەوان سەردەمی ڕزگاری لە پێشەوە بوو.

٢- بزووتنەوە ڕیفۆرمیست و چاکخوازەکان، کە ئامانجی دیاریکراو و سنووردارییان بۆ چاککردنی بەشێک لە لایەنەکانی ژیان و گۆڕانی، خستبووە بەرنامەی خۆیانەوە. دوو جۆری دیکە بزووتنەوەی کۆمەلایەتی هەیە، ئامانجیان ئەوەیە دابونەریتەکان یان هەندێک لە بیروباوەڕی کەسەکان، بگۆڕن.

٣- بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکان، کە لە هەوڵی ئەوەدان خەڵک لەو جۆرە ژیان وبیرکردنەوەیە ڕزگار بکەن، کە ئەوان پێیان وایە بۆگەن بووە. بەشێکی زۆر لە بزووتنەوە دینییەکان و بە تایبەتی ئیسلامییەکان بەم شێوەیە بیر لە ڕزگاری دەکەنەوە. بیروباوەڕی ئەم بزووتنەوەیە بەو شێوەیە (کە گەشەی مەعنەویی تاکەکان نیشانەی ڕاستەقینەی بەهای ئەوانە).

٤- سەرئەنجام، ئەو گرووپانەی کە تا ئەندازەیەک پێیان دەوترێت بزووتنەوەکانی ئاڵوگۆڕ، ئامانجیان گۆڕانێکی جزئی (بەشییە) لە تاکەکاندا. ئەوان نایانەوێت تەواوی دابونەریتەکان بگۆڕن، بەڵکو دەیانەوێت هەندێک تایبەتمەندیی دیاریکراو بگۆڕن (زۆربەی بزووتنەوە ناسیونالیستەکان، بەم شێوەیە بیر دەکەنەوە).

**زەمینەکانی پەیدابوونی بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان:**

دیسان ئانتۆنی گیدنز، لەو کتێبەیدا، دەچێتە لای (نیل سمڵسەر) و باسی شەش پێشمەرجی بەدیهاتنی کاری بەکۆمەڵ یان بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان، بەشێوەی تایبەتی، دەکات:

یەکەم، زەمینەی بونیادی کە هەموو ئەو هەلومەرجە کۆمەلایەتییانەن کە ڕێگە دەدەن، یان ڕێگرن لە بەدیهاتنی بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان.

دووەم، فشار و زۆری بونیادەکان کە دەبنە مایەی ناکۆکی- یا لە زاراوەی مارکسیدا، ململانێکان- کە سەرچاوەیەکە بۆ پەیدابوونی بەرژەوەندی ناکۆک و دژ بەیەک لە دەروونی کۆمەڵدا. ئەم فشارانە بەشێوەی نیگەرانی دەربارەی ئاینده،

پشێوییەکان، نارۆشنییەکان وەیان هەڵوێستی ڕاستەوخۆ بۆ ئامانجەکان دەردەکەون. سەرچاوەی فشار، لەوانەیە بەشێوەی گشتی یان تایبەتی جێگا و ڕێگای دیاریکراویان هەبێت. بۆ نموونە نایەکسانی و هەلاواردنی نێوان گرووپە میللییەکانن، یان چین و توێژەکان سەرچاوەی ناکۆکی و سەرەنجام بەدیهاتنی ئەو بزووتنەوانەن.

سێیەم، کاریگەریی بیروباوەڕەکان و بەتایبەتی ئەو باوەڕانەی کەچوونەتە دۆخێکی گشتیکراو. بزووتنەوەکان تەنها لە وەڵامی پشێوی و گومانەکان یان دوژمنایەتییەکان لە بەرامبەر ئەوانی دیکەدا، پەیدانابن، بەڵکو ئەوان لەژێر کاریگەریی بیرو ئایدیۆلۆژیای دیاریکراو و پێشتر ئامادەکراو، شکڵ دەگرن، کە بەهۆیانەوە داواکاری و نەیارییەکان بەرجەستە دەکرێت و ڕێگا چارەشیان بۆ دەدۆزرێتەوە. بۆ نموونە، بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراون، کەبۆچی بێدادی ڕووی داوە وچۆن دەتوانرێت ئەوانە لە ڕێگای خەباتی سیاسییەوە کەم بکرێتەوە.

چوارەم، هۆکاری خێرادەر، ئەو ڕووداوانەی کەدەبنە هۆی بەشداریی خەڵکی لەبزووتنەوەکاندا و کەڕاستەوخۆ دەبێتە مەیدانی کاری بزووتنەوەکان. ڕووداوی (رۆزا پارکز)ی ڕەش پێست کە نەیانهێشت لە ئۆتۆبوسدا لەو شوێنەدا دابنیشی کە بۆ رەشەکان نەبوو تیا دا نیشت، لە شاری مۆنتگمری لە ویلایەتی ئالاباما (ئەمریکا) ساڵی ١٩٥٥ بە سەرەتای دەستپێکردنی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکانی ئەمریکا، کۆمەکی کرد.

پێنجەم، بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، کاتێک بە ئەنجام دەگەن کە گرووپێک یان پارتێک، بتوانێت هێز و یارمەتی بۆ فەراهەم بکات. ڕابەرایەتی و جۆری هۆکاری پەیوەندیی نێوان بەشداربووان، هاوڕێ لەگەڵ پشتیوانیی سەرچاوەی دارایی و ماڵی دەتوانێت، پێشمەرجێکی باشی پەیدابوونی بزووتنەوەکان بێت.

شەشەم، لە کۆتاییدا چۆنییەتی پەیدابوون و گەشەی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، بەتوندی لەلایەن (کارکردنی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی) کاری تێ دەکرێت. دەزگا

دەسەلاتدارەكـان دەتوانن بە دەستێوەردان و گۆڕینی زەمینەی بونـیادی و ئەو فشـارانەی كە بوونەتە هـۆیەک بۆ بەدیهـاتـنی بزووتنەوەی كۆمـەلایەتی، وەلام بدەنەوە. بۆ نموونە، دەكرێت لەهـەلومەرجی ناكۆكی نەتەوایەتیدا، هەندێک كار و هەنگاو بگیـرێتە بەر كە لە توندوتیـژیی ئەو بزووتنەوانـە، كەم بكـاتەوە یان زیاتریان بكات.

## مێژوویی بوونی بزووتنەوە كۆمەلایەتییەكان

بزووتنەوە كۆمـەلایەتییـەكـان وەلامـێكی نـاعـەقلانی نین لە بەرامـبـەر هـەلاواردن و بێ مافیی كۆمەلایەتی. ئەوان لە ئەنجـامی چەندین دیدگا و ستراتیژی مێژوویی كە ئەوە پیشان دەدەن بە چ شـێوەیەک لەبەرامـبەر بێ مـافی و نەبوونی دادپەروەریدا خـەبات دەكەن. لە دیدی «ئالان تۆرین» دا، ناتوانین كە بزووتنەوە كۆمەلایەتییەكان وەكو چەند ئەنجومەنێک یان هاوكارییەک كە لە هەلومەرجی كۆمەلایەتی دابڕابن، بناسـین، بەلكو لە پەیوەندی و كـاریگەریی بەردەوامـدان لەگەل تەواوی ڕەوشـی كـۆمـەل. هـەر لێرەوە، دەگەینە ئەو ئامـانجەش، كە بزووتنەوەكـان كاردانەوەشن بەرامـبـەر ئەو كـارانەی كە لەدژی ژیانێكی ئـارام و دیموكـرات و بەهرەمـەندە. سـەرەنجـام تـۆرین دەگـاتە ئەو ئاكـامـەی كـە دەبێت زانینـی باش سـەبارەت بە بزووتنەوەكـان لە مـەیدانی كـار و كـاریگەرییـان لەناو كـۆمـەلدا، بەدەست بهـێـنین و لێكدانەوەی بزووتـنەوەكـان لەو كارانـەدا دەبێت كە لەبەرامبەر دەزگا ڕەسمییەكان و بیروكراتی و سەپێندراوەكان، باشتر ڕۆشن دەكرێتەوە.

یەكەمین كەس كە باسی بزووتنەوە كۆمـەلایەتییەكانی كردبوو، «لۆرنز فۆن شـتاین» لە كـتـێبی «بزووتنـەوەی كۆمـەلایەتیی فـەرەنسا لە ۱۷۸۹– تا ئەمـڕۆ» كە لە سـالی ۱۸٤۲دا چاپی كـرد، لەلای شـتـاین، بزووتنەوەی كـۆمـەلایەتـی بەم جـۆرە باس كـرا؛ بزووتنەوەی كۆمەلایەتی وەكو خـەباتـی سەربەخـۆییـخـوازیی كۆمـەلایەتیی كرێكاران گـەیشـتـە لووتكە، بزووتنـەوەی كـۆمـەلایەتی لە سـەدەی نۆزدەدا، تاڕادەیەكی زۆر بە هەمان بزووتنەوەی كرێكاری یەكسان كرابوو.

هـەلبـەتە ئەم دیدە، یان ئەم ناسـینە بەتەواوی ڕۆشن نـەبوو، چونكە پاشـتـر لەلای

«توكڤیڵ» دەبینین کە گرنگیی زیاتر بە بزووتنەوەی دیموکراتی، نەک کرێکاری دراوە، کە لەلایەنی چینی ناوەندەوە پشتیوانیی دەکرا، بەڵام کاریگەریی بزووتنەوەی کرێکاری لە بزووتنەوەی دیموکراتیدا بەرەو زۆربوون دەچوو کە سەرەنجام بزووتنەوە و پارتەکانی سۆسیال- دیموکراتی تارادەیەکی زۆر هەردوو بزووتنەوەکەی ئاوێزان کرد.

لە کۆمەڵەکانی ئەوروپا و ئەمریکای باکوور، لەدوای شۆڕشەکانی سەدەی نۆزدەوە، بەشێکی زۆری خەڵک لەو وڵاتانەدا دەستیان کرد بە بەشداریی کاریگەر و ئاگاهانە لە بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکانیان. دەتوانین ئەم هەلومەرجە مێژووییە وەکو سەرەتایەک بۆ پەیدابوونی بزووتنەوە جەماوەرییەکان باس بکەین کە لە نێو ئەمانەدا، لە کۆتاییی سەدەی نۆزدە، بزووتنەوەیەکی کرێکاری و سۆسیالیستی وەکو بوونێکی کۆمەڵایەتی بەرجەستە خۆی ئاشکرا کرد. پاشان بزووتنەوە میللی و نەتەوەییەکانی ئەوروپا و ئەمریکا و بەشی هەرەزۆری وڵاتەکان، توانییان گرنگی و کاریگەریی خۆیان لەسەر بزووتنەوەکان بەجێ بهێڵن. بزووتنەوەی ئافرەتان و لاوان بۆ بەشداربوون لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، دەورێکی کاریگەری لە فراوان کردنی پانتاییی دیموکراسیدا، نواند. ئەم بزووتنەوانە بوونە سەرچاوەی بەدیهاتنی پارت و کۆمەڵە و سەندیکاکان، کە باشترین نەخشێنەری کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە بوون. ئەم بزووتنەوانە تا ناوەڕاستی سەدەی بیست، بەردەوام بوون و تا ئەو کاتە ئەکتەری سەرەکیی شانۆی دیموکراسی وکۆمەڵایەتی بوون.

لە ساڵانی دەهەی پەنجا و شەش بەدواوە چەندین بزووتنەوەی نوێی جیاواز لەوانی پێشوو پەیدابوون کە بەئاشکرا گرنگییان دەدا بە کاری جەماوەری، نەک ڕێکخراوەیی. ئەم بزووتنەوانە لە ڕواڵەتدا پەراگەندە دەردەکەوتن، یان بڵێین (ئازادتر) دەرکەوتن و شێوەی ڕێکەوتن و کاری هاوبەش پشتی نەدەبەست بە ئاستەکانی ڕێکخراوبوون، بیرۆکراتی و لە بیروباوەڕیشدا نەدەگەڕانەوە بۆ دید و ئایدیۆلۆجیایەکی دیاریکراو: بەڵکو بەشێوەی فەرهەنگی گشتی و مافی مەدەنی و فراوانکردنی ئازادیی سیاسی دەردەکەوتن، ئەم زەمینەیە پاشان توانیی نەوەیەکی نوێ لە کۆمەڵەکان، سەندیکاکان و پارتەکان بەدی بهێنێ. دەکرێت پارتەکانی سەوز،

کۆمەڵە فەرهەنگی و لێکۆڵینەوە کراوەکانی بیر و فەلسەفە، بە باشترین نەخشێنەری ئەم سەردەمە بناسرێن.

وێڕای جیاوازیی نێوان بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان (ئەوانەی پێشوو و ئەوانەی دوای ناوەڕاستی سەدەی بیست)، چونکە بزووتنەوەکان لە پانتاییەکی فراواندا بوونیان هەیە، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سەرقاڵی هەڤڕکیی کۆمەڵایەتی و سیاسین، کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی جۆرەها بیرو ئایدولۆژی و لە کۆتاییدا توانیویانە لە مێژوویەکی درێژدا بەردەوام بن و لەسەر تەواوی ئەو مێژووەش، شوێن دابنێن. وێڕای ئەمانە، گرنگی و تایبەتمەندیی ئاشکرای بزووتنەوەکان (کۆن و نوێ) ئەوەیە کەئەوان (بەدیهێنەری خود و بەدیهێنەری کۆمەڵی نوێن. لەم ڕەوەندە خۆ بەدیهێنەرەدا، بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دەبنە ئەو هێزانەی کە ڕژێمی جێگیری پێشوو بەرەو رووی خەبات دەکەنەوە و سەرەنجام کۆمەڵ بەرەو جۆرەها کاناڵ و هەڵبژاردنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بەرەوپێش دەبەن.

ئەم هێزە نوێهێنەرانە، وێڕای ئەوەی کە ڕژێمەکانی پێشوویان خستووەتە ژێر گومان و پرسیارەوە، لە جێگای ئەوانە ڕژێمە دیموکراتییەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، یان ئەوانەی پێیان دەوترێت (دیموکراسیی جێگیر) لە دنیای سەرمایەداریی ڕۆژئاوا. ڕژێمە سۆسیالیستە (ئۆتۆکراتییە جێگیرەکان)کانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیان بەدی هێنا و پاشان لە دنیای سێیەمدا، وڵاتانی تازە ڕزگاربوویان بەدی هێنا و کەبەرەو (نوێ سازی) و(پیشەسازیبوون) چوون. ئەگەرچی دەکرێت ڕەخنەی گرنگ لەم ڕژێمانە بگیرێت، بەتایبەتی لە ڕوانگەی ئازادی و کرانەوەوە، بەڵام ئەمان کاریگەریی بەرچاویان لەسەر مێژووی مرۆڤایەتی هەبوو.

## کاریگەریی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان

أ- کاری کۆمەڵایەتی یان بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی کە سەرچاوە لە بیروباوەڕی دیاریکراو یان لە فەرهەنگێکی دیاریکراو وەردەگرێت، دەتوانێت کاریگەریی گەورەی لەسەر ژیانی دیموکراتی هەبێت. بزووتنەوەکانی کرێکارانی وڵاتانی ڕۆژئاوا، کە بەشی هەرە زۆری سەرچاوەکانی بریتی بوون لە بیروباوەڕی

سۆسیالستی و بیروباوەڕی ڕیفۆرمستی و بەتایبەتی ڕێکخراوبوونی تریدیۆنیونی، توانییان دوو کاریگەریی زۆر گەورە لە کۆمەڵ بکەن. لەلایەکەوە، توانییان هەلومەرجی ژیانی ئابووری و سیاسیَ و فەرهەنگیی خۆیان باشتر بکەن و لەلایەکی دیکەشەوە، پانتایی دیموکراسییان لە کۆمەڵدا فراوانتر کردەوە. بەم شێوەیە لەوە تێ دەگەین کە بزووتنەوەی کۆمەلایەتی سەرەڕای ئەوەی کە داواکاریی تایبەتی هەیە، بەهەمان شێوەش دەتوانێت بەرنامەی سیاسی وکۆمەلایەتیی بۆ تەواوی کۆمەڵ هەبێت و بانگەوازی هەندێک لە پرنسیپە گشتییەکان بکات. بزووتنەوەی کرێکاران، بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی نەتەوەکان، بزووتنەوەی ئافرەتان ولاوان، بزووتنەوەکانی بەرەنگاربونەوەی ڕژێمە کۆنەکان و بزووتنەوەی کەمایەتییە نەتەوەیی و دینییەکان.

ناتوانین ناوی بزووتنەوەی کۆمەلایەتی لەو هەولانە بنێین کە داواکارییەکانیان جێبەجێ ناکرێت. ئەو بزووتنەوانەی کە هەموو ڕێگایەکی پەیوەندی لەگەڵ سیستەمی دیموکراتیدا دەبڕن، لە سنووری بزووتنەوەی کۆمەلایەتی دەردەچن. ئەم بزووتنەوانە، یەکەمین کار کە دەیکەن پەنا دەبەنە بەر کاری سەربازی و جەنگی نێوخۆ، کە سەرەنجام ئاستەنگی کۆمەلایەتی پەیدا دەبێت. بزووتنەوە ئیسلامییە چەکدارەکان، لە ولاتانی ئیسلامیدا جۆرێکن لەو بزووتنەوانەی کە دژی دیموکراسی و دژی هەموو بزووتنەوەکانی دیکەن. واتە کاریگەریی ئەم بزووتنەوانە، کاریگەرییەکی نێگەتیڤە.

ب- بزووتنەوەی کۆمەلایەتی و دیموکراسی لە تەنیشت یەکەوە دەڕۆن، هەرگیز دژی یەکتر نابن و لە یەکتری جیا نابنەوە. ئەو ڕژێمە سیاسییەی کە تەنها حاڵەتی توندوتیژی لە بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکاندا دەبینێت و داواکارییەکان بە مەحاڵ دەزانێت، بێگومان سیفەتی نوێنەرایەتی پێشێل دەکات و دژی ئیرادەی خەڵک دەوەستێت. بەلام ئەم قسانە، لەگەڵ بزووتنەوە چەکداری و تیرۆریست و بونیادگەراکاندا وێک نایەتەوە. بونیادگەریی دینی، یان بونیادگەریی شۆڕشگێڕانە و ڕادیکاڵ، کە بانگەوازی ڕووخان و نەمانی خودی سیستەمی دیموکراتی دەکات، ئەگەرچی ئەو سیستەمانە کەموکوڕیشیان هەبێت، بێگومان دژی دیموکراسی و بزووتنەوەی کۆمەلایەتی ئازاد کار دەکات، جا ئەگەر ئەو

کارکردنە چەکداری بێت یان سیاسی. نموونەی ئیسلامی سیاسی (بە باڵی چەکدار و سیاسی) و کۆمۆنیزمی بەناو کرێکاری، لە وڵاتی خۆماندا دیارترین ئەو بزووتنەوانەن کە کاریگەریی نەرێتیان لەسەر دیموکراسی و پانتایی جەماوەریی دیموکراسی (واتە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و جەماوەری) هەیە.

ج) بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، ناتوانێت کۆمەڵایەتی و ئازاد بێت ئەگەر بێتو لە ئامانجەکانیدا بەها و بەرژەوەندی گشتی لەبەرچاو نەگرێت. بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی ژیانی سیاسی، ئاڕاستەی پێکدادانی دوویەرە یان چەند بەرەیەک کە قسەکەری چینەکان و توێژەکان بن، کەم ناکاتەوە. بەڵکو بەردەوام هەوڵی فراوانکردنەوەی مەیدانی دیموکراتی و ئازادیی سیاسی دەدات کە زۆرترین هاوکاری وزەمینە بۆ هەڵبژاردنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری فەراهەم دەکات و کە لەڕێگای هێزە کۆمەڵایەتییە کاریگەرەکانەوە، هەمیشە خێرو بەرژەوەندی گشتی دەکرێتە ئامانجی هاوبەشی نێوان سیستەم و بزووتنەوەکان. هەر بۆیە تەماشا دەکەین، کە گەورەترین بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دروشمی گشتی و فراوانییان لە جۆری ئازادی، یەکسانی، مافەکانی مرۆڤ، دادپەروەری وهاوکاری کە دروشمی خێر و بەهای گشتین.

ئالان تۆرین، کە خاوەنی تیۆری سۆسیۆلوجیای بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانە، پەیوەندیی نێوان دیموکراتی و بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی، لە بیری کۆمەڵناسیدا بەم جۆرە باس دەکات: پەیوەندیی بەهێزی نێوان چەمکی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و دیموکراسی و داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ باشتر دەردەکەوێت، کە کاتێک لە نێوان ئەو بزووتنەوانە و خەباتی چینەکاندا جیاوازی دادەنێین. ناکۆکی چینایەتی باری مرۆڤایەتیی بەشێوەیەک قورس کردبوو کە بەناوی حەتمیەتی مێژووەوە، بانگەوازی سەرکەوتنی عەقڵی دەکرد کە پێویستی بە شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەری هەبوو: ئەوەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەبووە هۆی کاری شۆڕشگێڕانە، زیاتر لەوەی ببێتە هەوڵی بنیاتنانی ژیانی دیموکراسی. گۆڕینی خەباتی چینایەتی بە چەمکی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی (لە جێگایەکی دیکەدا، دەڵێت، ئازادی سیاسی) ڕێگەمان دەدات کە سۆسۆلۆجیایەکی نوێ پەیدا بکەین (کە پێی دەوترێت

کۆمەڵناسیی کارایی مێژوویی یان خودی مێژوویی) و جێگای تیۆری مێژوویی و سۆسیولۆجیای ئازادی لەجیاتی تیۆری حەتمیەت. چونکە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە کە هێزە کۆمەڵایەتییەکان ئازاد بکات، نەک بەدیهێنانی کۆمەڵێکی «مثالی»، یان سروشتی یان بەدیهێنانی کۆتایی مێژوو، کە هەموویان بەشێکن لە تیۆری حەتمیەتی شۆڕشگێڕانە.

د) بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی بە پێچەوانەی بانگەوازی خەباتی چینایەتی یان بونیادگەریی ئیسلامی، بزووتنەوەیەکی شارستانی و مەدەنییە. پێش ئەوەی کە ڕەخنە بێت لە هەندێک لایەنی نێگەتیڤی دیموکراسی و سیستەم (کە بێگومان ڕەخنەگرە لەم لایەنانە) دووپاتی خودی سیستەمی دیموکراتی دەکاتەوە. هەروەکو سانتیاگۆ کاریللۆ، خاوەنی بیروباوەڕی ئۆرۆکۆمۆنیزم (کۆمونیزمی ئەوروپی) دەڵێت: دیموکراسی لەڕووی بنەما و بونیادەوە سیستەمێکی باشە. پاشان دێتە سەر ڕەخنەکانی لە خودی ئەو دیموکراسییە. دڵنیایی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر سیستەمی دیموکراتی باشتر دەتوانێت زەمینە و کاری دووبارە بنیاتنانەوە و نوێکردنەوەی ئەو کۆمەڵە سازبدات. گرنگی بەرچاوی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەیە کە وێڕای داواکاری و ڕەخنەی بەردەوام، بەڵام هەتا بۆی دەکرێت لە توندوتیژی دوور دەکەوێتەوە. بیری توندوتیژی لەوپەڕی ناکۆکییدایە لەگەڵ دیموکراسی و بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی. هەربۆیەش بزووتنەوەکان بەردەوام ئەو دەسەڵاتانە دەخەنە ژێر پرسیارەوە، کە هەوڵ نادەن دانوستانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە فراوانترین پانتاییدا بەکار بێنن. لەکاتێکدا ئەو دەوڵەتانە یان ئەو سیستەمانە لە دەرەوەی کۆمەڵی خۆیان، لەگەڵ دەوڵەتەکانی دی بۆ بەدیهێنانی داواکارییەکان، ڕەوشێکی توندوتیژی بەخۆوە ناگرن، هەر بەو ڕادەیە دەتوانن دەوڵەت و حیزبەکانیش بەرەو ئەو هەلومەرجە ئاشتییە بەرن.

هـ) کارو چالاکی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بۆ بەدیهێنانی ئازادییەکی سیاسی باشتر، ژیانێکی ئابووریی گونجاوتر، سیستەمێکی کراوەتر و دیموکراسییەکی فراوانتر، دەبێتە هۆکارێک و پاشان دەبێتە زەمینەیەک بۆ ئەوەی ئەم داواکارییانە

ببنه بەشێک لە فەرهەنگ و پەروەردە و سەرەنجام ببنە شێوەیەک لە ژیان و دابونەریت، کە دەسەلأت و هێزەکانی دواتر نەتوانن بە ئاسانی ئەم بناغە فەرهەنگییانە لەناوببەن یان بەرتەسکیان بکەنەوە. بزووتنەوەی کۆمەلأیەتی دەتوانێت خودی ئەو ڕێگا وخەباتانەش کە بۆ ئەم هیوایانە بەکاری دەهێنێت، واتە کاری بەکۆمەڵ، دانوستانی کۆمەلأیەتی، ئاڵوگۆڕی بیروڕاکان و خستنەڕووی زیاتر لە ڕێگاچارەیەک، بکاتە فەرهەنگ و شێوەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلأیەتی و بەهۆی ئەمانەشەوە پانتایی ئازادی و دیموکراسی فراوانتر بکەنەوە.

و) بزووتنەوە کۆمەلأیەتییەکان کە نوێنەری کەمایەتییەکان (دینەکان)، (نەتەوەکان) یان(ڕەگەزی دیکەن)، کە داکۆکی دەکەن لەو خەڵکە ستەمدیدەیە و دەیانەوێت ڕاستەوخۆ بێنە مەیدانی کاری کۆمەلأیەتییەوە ڕازی نابن کە ببنە بزووتنەوەی دووەم یان هێزی پەدەکیی ئەو بزووتنەوانەی کە نوێنەری زۆرایەتین. بزووتنەوەی نەتەوە بندەستەکان، کۆتایی هێنا بە ئەفسانەی نەتەوەی باڵا دەست، بزووتنەوانەی ئافرەتان کۆتایی هێنا بە ئەفسانەی زۆرایەتیبوونی پیاوان و نایابیی دەوری ئەوان، هەر بەو شێوەیەش بزووتنەوەی کەمینە دینییەکان دەتوانێت دەسەلأت و هەژموونی دینی زۆربە بخاتە ژێر پرسیارەوە.

ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٦٨ خوێندکارانی ئەوروپا، چەمکی ئایدیۆلۆژیکی (پێشڕەوایەتی)ی پرۆلیتاریای پیشەسازیی لە گۆڕ نا. ئەم دەورە پێشڕەوایەتییە گەلێک پێش ئەو مێژووە بووبووە شوێنی گومان، بەلأم هەرگیز بەم ئەندازە بەرچاو و کاریگەرە نەبوو، چونکە لە ١٩٦٨ خوێندکاران و کرێکاران و بەشدارانی ئەو بزووتنەوەیە ئەوەیان سەلماند کە پرۆلیتاریای پیشەسازی، بەشێکن لە چینی کرێکار و زۆربەی جاریش کەمایەتین و خەباتکارانی ١٩٦٨ سەلماندیان کە کەس پێشڕەو و ناوەندی بزووتنەوە کۆمەلأیەتییەکان نییە.

بزووتنەوە کۆمەلأیەتییەکان، بەتایبەتی ئەوانەی نیوەی دووەمی سەدەی بیست بەملاوە، توانییان زەمینەیەکی جەماوەریی بەهێز بۆ تێکشکاندنی ئەو بیرو فەلسەفانە ساز بدەن، کەباسی دەوری پێشڕەوی یان نایاب و سازدەریان بۆ یەکێک

له پێکهێنەرەکانی بوون یان مەعریفە (عەقڵ، بونیاد، شۆڕش، حەتمییەت، غەریزە، ئیرادە، سیاسەت، ئابووری، فەرهەنگ و تەنانەت خودی بیرو فەلسەفەش) خەباتکارانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، پێش بیرمەندان و فەیلەسووفەکان رایان گەیاند کە بوون و مەعریفە و ژیان لە کۆی تاکەکان پێک هاتووە.

ز) سەرکەوتنی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان (کۆنەکان و نوێکان) کاریگەرییەکی سێ لایەنەیان لەسەر ژیان و ڕەوشی کۆمەڵەکان دانا. یەکەم، هەلومەرجی یاسایی و حقووقی و سیاسەتەکانی دەوڵەتیان گۆڕی، دووەم، هەلومەرجی دەروونیی خودی بزووتنەوەکانیان بەرەو باشتر گۆڕی و سێیەم، بەشێوەی گشتی تەواوی بیرو هۆشەکانیان بەرەو پێشەوە برد و لەمەودوا کۆمەڵەکان بەبێ ئەو بزووتنەوانە هەڵ ناکەن. بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان توانییان کەلێک ئاڵوگۆڕی گرنگ لەناو بیروباوەڕەکاندا بەدی بهێنن. ئەوان توانییان مارکسیزم و سۆسیالیزمی کلاسیک بەرەو سۆسیال- دیموکراسی بەرن و پاشان سۆسیال- دیموکراسییش بەرەو بزووتنەوە و حیزبەکانی ڕێگای سێیەم و سەوز و حیزبەکانی ئازادی بەرن. ڕەخنەی بزووتنەوە نوێکانی خوێندکاران و کرێکاران و نەتەوەکان و ئافرەتان هەر تەنها لە پارتە کۆنەکانی (چەپی کۆن) بەشێوەی سۆسیالیست و نەتەوەیی، نەبوو بەڵکو خودی چەپی نوێ و ڕێکخراوە نەتەوەییە نوێکانیان بەرەو کرانەوە و فرەیی برد. هەر بەو بۆنەیەوە میکائیل گۆرباچۆف دەڵێت: دیموکراسی زیاتر، یەکسانە بە سۆسیالیزمی زیاتر. بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان توانییان، مەسەلەی دەسەڵات و دەسەڵاتی ناوەندی و حزبەکان بەرەو دابەشبوون بەرن و هەر بەو بۆنەوە، تێکۆشەر و زانای ئیتالی گرامشی دەڵێت: بە دیهاتنی شێوەکانی دیکە لە دەسەڵات و هەژموونی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەناو خەڵک و لە چوارچێوەی هێزی کۆمەڵایەتیی سەربەخۆ لە دەسەڵات، ڕێگا خۆش دەکات بۆ بەدیهاتنی سەربەخۆیی خودەکان و گرووپەکان .

سەرچاوەکان:

١- ألان تورين، ماهي الديموقراطية؟ ترجمة، حسن قبيسي، دار الساقي، بيروت ، ١٩٩٥
٢- اريك هوبزباوم، الامم والنزعة القومية. ترجمة، عدنان حسن، دار المدي، ، ١٩٩٩
٣- ألان تورين، هەمان سەرچاوە.

٤- بروانە: الان تورین، نقد الحداثة، ترجمة انور مغيث، المجلس الاعلى للثقافة ,١٩٩٧
ايمانويل والرشتاين، سياست وفرهنگ در نظام متحول جهانى، نشرنى ,١٣٧٧
باتامور، جامعه شناسى سياسى، ترجمه منهوچهر صبورى، انتشارات كيهان ,١٣٦٦
أنتونى گيدنز، جامعه شناسى، ترجمه، منوچهر صبورى، نشرنى چاپ چهارم ,١٣٧٧
٥- ألان تورين، ماهي الديموقراطية؟
٦- هەمان سەرچاوە.
٧- أنتونى گيدنز، جامعه شناسى، ترجمه منوچهر صبورى، نشرنى ,١٣٧٧ ل ل ٦٧٧- ,٦٧٨
٨- ايمانويل والرشتاين، سياست وفرهنگ در نظام متحول جهانى، ترجمە، پيروز ايزدى، نشرنى تهران، ,١٣٧٧
٩- ألان تورين، ماهي الديموقراطية ؟
١٠- هەمان سەرچاوە.
١١- هەمان سەرچاوە.
١٢- الآن تورين، نقد الحداثة، ترجمة انور مغيث، المجلس الاعلى للثقافة ,١٩٩٧
١٣- الان تورين، ماهي الديموقراطية؟
١٤- هەمان سەرچاوە.
١٥- أنتونى گيدنز، هەمان سەرچاوە.
١٦- ئەم زانياريەم لە هاوڕێیانی سەندیكای كارمەندانی تەندروستی بیستووە، لە كۆڕێكدا كە من بۆ ئەو مەبەستە و هەربەم ناونیشانە، لە نەخۆشخانەی منالآن بۆ ئەوانم سازدا.
١٧- أنتونى گيدنز، هەمان سەرچاوە. ل ٦٧٢
١٨- أنتونى گيدنز، هەمان سەرچاوە. ل ٦٧٤
١٩- باتامور، جامعه شناسى سياسى، ترجمه منوچهر صبورى، انتشارات كيهان، تهران ,١٣٦٦
٢٠- باتامور، هەمان سەرچاوە. ل ٥٩
٢١- ألان تورين، ماهي الديموقراطية؟ ل ٨١
٢٢- ألان تورين، هەمان سەرچاوە. ل ٨٢
٢٣ - باتامور، جامعه شناسى سياسى، ترجمه منوچهر صبورى، انتشارات كيهان. ١٣٦٦
٢٤ - ايمانوئيل والرشتاين، سياست وفرهنگ در نظام متحول جهانى، ترجمه پيروز ايزدى، نشرنى، تهران ,١٣٧٧
٢٥ - هەمان سەرچاوە. ل ,١١٧
٢٦ - هەمان سەرچاوە. ل ,١١٨

# پێڕست